# سەد ڕۆژ
# لە چاوەڕوانیی مەرگدا

منتدى إقرأ الثقافي

ڕۆمان

www.iqra.ahlamontada.com

ئارتۆر کۆستلێر
وەرگێڕانی: میقداد شاسواری





خانەی تو‌ێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **سەد ڕۆژ لە چاوەڕوانیی مەرگدا**

---

- نووسینی: ئارتۆر کۆستلێر

---

- وەرگێڕانی بۆ کوردی: میقداد شاسواری

---

- بابەت: ڕۆمان

---

- نەخشەسازی ناوەوە: ڕەسووڵ سوڵتانی

---

- بەرگ: ڕێمان

---

- ژمارەی سپاردن: (٢٥٣٣)

---

- نرخ: ٤٠٠٠ دینار

---

- چاپی یەکەم: ٢٠١٣

---

- تیراژ: ١٠٠٠

---

- چاپخانە: موکریانی

زنجیرەی کتێب ()



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com



## پێشەکی

یەك دوو جارێك ئەوم بینی، تەنیا بە سەرپەنجەکانی دەستی تەوقەی لەگەڵدا کردم و منگەیەکی لێوە دەرچوو: " چۆنی؟ دوایی دەتبینمەوە" پاشان تێپەری... ئەو کەسەی لە دوو تویی ئەم کتێبەدا، چیرۆك و بەسەرهاتی رووبەرووبوونەیان لەگەڵ مەرگدا بۆ دەگێرێتەوە ئارتۆر کۆستلێرە... لە سەروبەندی شەری نێو خۆیی ئیسپانیادا کەوتە دەست هێزە فاشییەکان " ئەوانەی لە کۆمار یاخی ببوون" و سزای مەرگیان بۆی دەرکرد. سەد رۆژی رەبەق لە نێو گرتووخانەکانی" مالاگا" و "سیڤیل" مایەوە، لەهەر کاتژمێرو چرکەساتێکی شەوانەی ئەو سەد رۆژەدا لە چاوەروانی ئەوەدا بوو یەلکێشی بەر سینگی دیوارێکی بکەن و بارانی گوللەی بە سەردا ببارێنن و، بە چاوی خۆی رۆژانە دیمەنی گوللە بارانکردنی کۆمەڵ کۆمەڵ لە هاوبەندییەکانی خۆی دەبینی. لە راستیدا ئەم کتێبەی " لە چاوەروانی مەرگدا" زیاتر نووسینەوەی ساتەکانی ترس و دڵەراوکێ و تەنگژە دەروونییەکانی ئەو مرۆڤانەیە کە رووبەرووی مەرگ دەبنەوە.

***

ئارتۆر کۆستلێر لە بەرواری ٥/ ئەیلوولی/١٩٠٥ لە شاری بۆداپێستی ولاتی مەجەرستان لە دایك بووە. باوکی مەجەری و دایکیشی خەڵکی نەمسا بوو. دوای ئەوەی قۆناغی دواناوەندی لە بۆداپێست تەواو کرد، بۆ درێژەدان بە خوێندن، چووە زانکۆی ڤیەننا. لە ساڵی ١٩٢٧ بۆ یەکەمجار لە دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئۆلشتاین لە بەرلین دەستی دایە نووسین و، تاکە پەیامنێر بوو کە بەشداری کرد لە گەشتیی زانستی" گراف زیپلین" بەرەو بەستەڵەکی باکوور.

لە ساڵی "١٩٣٠"دا سەفەرێکی بۆ ئاسیای ناوەراست کرد و ساڵێکیشی"١٩٣٢-١٩٣٣" لە رووسیای یەکێتی سۆڤیەت بەسەر برد و دوای ئەوەی نازییەکان دەسەلاتیان لە ئەڵمانیا بە

دەستەوە گرت چووە پاریس. گەرموگوڕی شەڕی نێوخۆیی لە ئیسپانیا، ئەویشی وەکو زۆر لە کەڵە نووسەرەکانی وەك"جۆرج ئۆرڤێل و ئاندرێ مالرۆ و ئێرنیست هەمینگوا"ی بەرەو ئەو وڵاتە راکێش کرد. ئەویش کە بە توندی لایەنگری کۆماریخوازەکان بوو، وەك پەیامنێری رۆژنامەی" نیوز کرونیکل" رووی لە "مالاگا" کرد. هەر لەوێش بوو، دوا بە دوای رووخانی شاری "مالاگا" لە لایەن سوپای یاخی بووی فرانکۆوە، دەسگیر کرا. " ئەوە بوو لە دوای تێپەڕاندنی رۆژە سەخت و چرکەساتە پڕ لە ئازارەکاندا، بە نێوبژیوانیی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٣٧ لەگەڵ دیلێکی دیکە کە لە دەست کۆماریخوازەکاندا بوو ئاڵوگۆڕی پێ کرا و گەڕایەوە بەریتانیا". ئەو کە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست بوو، لە دوای گەڕانەوەی لە ئیسپانیا، هەڵوێستێکی رەخنەگرانەی وەرگرت و لە ساڵی ١٩٣٨ وازی لەو حیزبە هێنا". لە دەسپێکی جەنگی دووەمی جیهانیی دا، کۆستلەر لە فەرەنسا، سەرنووسەریی هەفتەنامەیەکی لە ئەستۆ بوو کە دژی هیتلەر و دژی ستالینیش بوو. لە ساڵی ١٩٣٩ یش فەرەنساییەکان کۆستلەریان خستە زیندانەوە. دوای ئازاد بوونی، سەری خۆی هەڵگرت و بەرەو بەریتانیا هەڵات و لە ساڵی ١٩٤١ پەیوەندی بە سوپای ئەو وڵاتەوە کرد. لەو سەروبەندەدا بوو بە بڵاوکردنەوەی پەرتووکی"تاریکایی لە نیوەڕۆدا" و ئاشکرا کردنی تاوانەکانی ستالین ناو بانگێکی جیهانی وە دەست هێنا. لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، رۆژگارێکی لە هند و ژاپۆن و ئیسرائیل و ئەمریکا بەسەر برد و دوا ساڵەکانی تەمەنیشی لە لەندەن بەرێ کرد. رۆژی پێنج شەممە ٣/ئادار/١٩٨٣ لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا، خۆی و هاسەرەکەی، بە پێڕەوی لە ئامانجی ئەنجوومەنی Exit کە ئەندام بوو تیایدا، کۆتایی بە ژیانی پڕ لە رووداوی خۆی هێنا چونکە بە پێی رێ و رەسمەکانی ئەو ئەنجوومەنە" هەر کەسێك مافی ئەوەی هەیە، هەرکاتێکی بە لەبار و شیاوزانی بۆی هەیە بە خۆی، سەر بەرزانە کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێ". کۆستلەر لە دوای خۆی دا بەرهەمێکی زۆری جێ هێشت وەك "گلادیاتۆرەکان- نووسینێکی نادیار- خەوڕۆکان- گەیشتن و گەڕانەوە- هۆزی سێزدەهەم- تاریکایی لە نیوەڕۆدا- جەنگێکی خاچپەرستانەی بی خاچ- تاوەری عەزرا- چاخی تینوێتی- دارماوانی خاك- هیروگلیفەکان- گوڵە شلێرو رۆبۆت".

**وەرگێر**

## پێشگووتار

لە ساڵی ١٩٣٧ ـدا، کاتێك وەك پەیامنێر، بۆ رۆژنامەی "نیوزکرونیکل" کە لە لەندەن دەردەچوو، لە نێو ریزەکانی هێزەکانی وەفادار بە کۆماریخوازان، لە شەڕی نێوخۆیی ئیسپانیادا کاری رۆژنامەوانیم دەکرد، لە لایەن سوپای فرانکۆوە دەسگیر کرام و چەند مانگێك لە ژوورێکی تاکە کەسیدا لە زیندان مامەوە. لە درێژایی ئەو ماوەیە، گوللە بارانکردنی زۆرێك لە هاوبەندییەکانم بینی و هەر ساتێکیش چاوەڕوانی گوللە بارانکردنی خۆم بووم. "گوتوبێژ لەگەڵ مەرگدا" نووسینەوەیەکی ئەو ماوەیەیە کە بەسەرمدا تێپەڕی و، هەر لە دوای ئازاد بوونمدا، لە حوزەیران- ئابی١٩٣٧ نووسرا و لە کۆتایی هەمان ساڵدا، وەك بەشێك لە پەرتووکێکی درێژتر بە ناونیشانی "شایەتینامەی ئیسپانیا" چاپ و بڵاو کرایەوە. ئەوسا هێشتا جەنگی نێوخۆیی درێژەی هەبوو و تای تەرازووی سەرکەوتن بە قازانجی هیچ لایەنێکیان دا نەکەوتبوو. بۆیە لەو هەلومەرجدا پێویست بوو بەشێکی زۆری ئەو رووداوانەی کە بەسەر مندا هاتبوو، کە لەوانەبوو ئاشکرا کردنیان بە زیانی کۆماریخوازان تەواو بێت، بە داپۆشراوی بمێنێتەوە. هەر بۆیە بە ئەرکی خۆم دەزانی سێ خاڵی بنەڕەتی وەك نهێنی لای خۆم بهێڵمەوە: ئەوەی کە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست بووم، ئەوەی کە سەردانەکەی پێشترم بۆ بارەگای فەرماندەیی ژەنەراڵ فرانکۆ لە لایەن کۆمینتێرنەوە لە ئەستۆ گرتبوو، دواجار ئەوەی کە، لە کاتی دەسگیر کردنمدا، بۆ ئاژانسی هەواڵنێری فەرمی حکومەتی کۆماریش، کە لایەنی رکابەری سوپای فرانکۆ بوون، کارم دەکرد. رەوتی ئەم رێخۆشکردنە سیاسیەم دواتر لە کتێبی "نووسینێکی نادیار"دا باس کردووە. گیرۆدەبوونی سەرەکی من لە نووسینی "گوتوبێژ لەگەڵ مەرگ دا" تەنیا لە هۆگریمەوە بوو بۆ رۆچوونەوە بوو بە ناخی خۆمدا: کاریگەریی دەروونیی نێو ژووری ئیعدام. لەم روانگەیەوە، رێخۆشکردنە سیاسیەکە شتێکی بێ جێ بوو، نووسینەکەشی تا ئەو شوێنەی کە بەرەو پێش دەچوو، تەنیا شیکردنەوەیەکی راستگۆیانەی ئەزموونێکی کەسیی خۆم بوو.

هەرچونێك بێ، ناوەڕۆكی كتێبەكە بە شێوەیەكی ناراستەوخۆ، بە هۆكاری ئەو شتانەی كە لە رووی ناچاری بە شاردراوەیی هێڵدراونەتەوە زیانی بەركەوتووە، چونكە ئەگەر قوربانی، لە راستیدا هێندە بێ تاوانە، وەك لە نووسینەكەدا دەردەكەوێ _ پەیامنێرێكی نییەت پاكی رۆژنامەیەكی لیبراڵی بە ناوبانگی بەریتانی- ترسەكەی لە ئەشكەنجەو، بریاردانی پێشینەی بۆ خۆكوژی لە پێناو رزگاربوونی لەو ئەشكەنجەیە، دوور لە ئەقڵ و، نالۆژیك بە دیار دەكەوێ. هەروەك لەوانەیە، بەشە سەرەتاییەكانی ئەم كتێبە بۆ خوێنەر جێی سەرسوڕمان بێت، كە پەیامنێرێكی بیانی رێگا بە خۆی بدات فەرماندەیەكی سەربازیی ناو وڵاتەكە بە "كەمتەرخەمییەكی خراپەكارانە" تۆمەتبار بكات و بە شێوەیەكی گشتی مافی ئەوە بداتە خۆی، كە بە هەمان شێوەی بەرپرسێكی ئەو شوێنە هەڵسوكەوت بكات.

وەڵامەكە لێرەدایە كە، لەو بارودۆخە بێ سەروبەرو هەرچی و پەرچییەدا، پێناساندنەكانم لە لایەن كۆمینترێن و پەیوەندیم بە فەرمانگەی هەواڵگری حكومەت، منیان وەكو كەسێكی گرنگ دەخستە بەرچاوی فەرماندە خۆجێیەكان. كاتێكیش لە لایەن دوژمنانەوە بەدیل گیرام، ئەوەندەیان بەڵگە لەسەرم هەبوو تا نە تەنیا لە دەزگای دژە هەواڵگریی ژەنەراڵ فرانكۆ زەندەقم بچێ، بگرە لە گەشتاپۆی ئەڵمانیش كە هەردوولا هاوكاری و پەیوەندی نزیكیان بەیەكەوە هەبوو، هەروەها لەوەی كە ئاگاداریمان لە چالاكیە دوورو درێژەكانی پێشترم دا هەبوو، لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئیسپانیادا. هەروەك كە زۆر جاران لە حاڵەتی ئاوهادا روودەدا، ئەمدەزانی "ئێستاش نازانم" ئەوانەی منیان دەسگیر كردبوو، تا چەند زانیارییان لە بارەی منەوە هەبوو. ئەو لێكۆڵەرە سەربازییەی لێكۆڵینەوەی لەگەڵ مندا دەكرد، پێدەچوو شتێكی زۆر كەم بزانێ، لەوانەش بوو بە ئانقەست خۆی وا پیشان بدا. لە پشێوییەكانی جەنگی نێوخۆییدا، دۆسیەكان زۆر بە زەحمەت و هێواشی دەست بە دەستیان پێ دەكرێ. ئەو كاتەش كە لێكۆڵینەوە لەگەڵ مندا دەستی پێ كرد، گوتوێژی سەبارەت بە ئاڵوگۆڕ پێكردنی من لەگەڵ ئەو دیلەی لە لای كۆماریخوازەكاندا بوو، چی وای ئەما بوو بگاتە ئەنجامی كۆتایی. خاڵێكی تر كە زیاتر لە مەتەڵێك دەچێ، ئەوە بوو كە لێكۆڵینەوە لەگەڵ من دا، پێ دەچوو لە دوای دەرچوونی بڕیاری حوكمی گوللەبارانكردنم دەستی پێ كردبێ. ئەوسا كە من لە زیندان بووم، فەرمانگەی هەواڵگری ژەنەراڵ فرانكۆ راگەیاندراوی تەمومژاوی و دژ بە یەكیان لەم بارەیەوە بڵاو دەكردەوە. تەنیا زانیاری پشتراستكراوم دواتر لە بڵاوكراوەكەی "دكتۆر مارسێل یونود" نوێنەری كۆمیتەی نێودەوڵەتی خاچی سوور وەرگرت، كە ناوبژیوانی گوتوێژەكانی ئاڵوگۆڕ

پێکردنی من بوو. ئەو بـە فـەرمی زانیـاری وەرگرتبـوو کـە مـن حـوکمی مـەرگم بەسـەردا سەپێندراوە. "گوتوبێژ لەگەڵ مەرگ دا" جگە لەو بەشە یاداشتانەی زیندان، کە بۆ خـۆ لادانم لە راکێشانی سەرنجی گەشتاپۆی ئەڵمانی بۆ لای خۆم بە زمانی ئینگلیـزی نووسـراوە، ئـەوانی دیکە بە زمانی ئەڵمانی نووسراوە. سەرجەم کتێبەکانم تا وەکو ساڵی ١٩٤٠ بە زمانی ئەڵمانی نووسراوە پاشان بە ئینگلیزی.

# پێشگووتاری چاپی یەکەم بە زمانی ئینگلیزی"١٩٣٧"

هیچ یەکێك لەو کەسانەی ناویان لە ناو ئەم کتێبەدا هاتووە، داتاشراوو دروستکراو نین و زۆربەشیان تا ئێستا مردوون.

مردن- تەنانەت ئەگەر لە پێناو ئامانجێکی نادیاریش بێت- هەمیشە شتێکی تاکە کەسیی و تایبەتییە. بۆیە ئەم لاپەڕانە، کە هەرە زۆریان لە کات و ساتە پڕ لە ترسەکانی چاوەڕوانکردنی راستەقینەی مەرگ دا نووسراون، خەسڵەتێکی تاکە کەسیی و تایبەتی یان هەیە. بە بۆ چوونی نووسەر، دوو هۆکار لە پشتەوەی چاپکردنی ئەم کتێبەیە:

یەکەمیان، ئەو بیرکردنەوانەی لە نێو مێشکی پیاوێکی حوکمدراو بە مەرگ دا دەگوزەرێن، لە رووی دەروونناسییەوە سەرنجڕاکێشە. نووسەرە پروفیشناڵەکان بە دەگمەن بۆیان هەڵکەوتووە رووداوێکی لەم چەشنە بە سەرخۆیان دا هاتبێت و ئەزموونیان کرد بێ. من هەوڵم داوە ئەو بیرکردنەوانە، تا ئەوێ کە توانیبێتم، بە کورتی و سوود بەخش و راشکاوانە بیانخەمەروو. گرفتی سەرەکی، وەسوەسەی خستنە بەرچاوی رووداوەکان بوو بە شێوەیەکی پەسند و شیاو. ئومێدوارم خوێنەر لێم تێ بگا تا بتوانم وا لە خۆم بگەیەنم کە توانیومە زاڵ بم بەسەر ئەو وەسوەسەیەمدا.

دووەمیان، وای بۆ دەچم کە لە جەنگەکاندا، بە تایبەتی لە جەنگە نێوخۆییەکاندا، تەنیا رێژەی لە سەدا دە، کردە جەنگییەکانە و لە سەدا نەوەدەکەی تر، ئەو ئازارانەیە کە ناکەونە بەر چاوان.

بۆیە رەنگە راڤەکردنی مردووشۆرخانە دزەتێنەکەرو داخراوەکانی ئەندەلۆس، کرۆکی جەنگە نێو خۆییەکان باشتر بۆ خوێنەر دەربخات تا وەکو شرۆڤە کردنی کرداره جەنگییەکان. ئەم نووسینە پێشکەش دەکەم بە هاوڕێم نیکۆلاس، سەربازی ونی کۆماری ئیسپانیا کە رۆژی ١٤/ نیسان/١٩٣٧، لە ساڵیادی شەشەمینی لە دایکبوونی کۆماردا، لە گرتووخانەی "سیڤیل" گوللەباران کرا.

ئا. ك

**ژیان هیچ بایەخێکی نییە**

**بەڵام هیچ شتێکیش هێندەی ژیان بایەخی نییە...**

**ئاندرێ مالرۆ: رزگارکەران**

.

# ١

مانگ و نیویێك دەبوو راوەستانێك لە جەنگدا بەدی دەکرا. زستان سارد بوو، ئەو بایە ساردەی لە "گوادارامـا"وە هەڵیکردبوو "مەدرید"ی تووشی سرۆکی کرد بوو. "موورەکان" لە نێو سەنگەرەکانیاندا دوچاری هەو کردنی سنگ ببوون و خوێنی سنگیان لە دەمیان دەردەچوو. رێ و بانەکانی "سیرانیڤادا" گیرا بوو. جەنگاوەرە کۆماریخوازەکان نە پۆشاکی سەربازییان هەبوو نە تەنانەت بەتانیش. لە نەخۆشخانەکانیشیاندا دەرمانی کلۆرۆفۆرمیان بۆ سڕکردن نەبوو، پەنجەو دەستە تەزیوەکانیان بێ ئەوەی سڕ بکرێن دەبڕانەوە.

مێردمنداڵێك لە نەخۆشخانەی پشێویخواز و ئانارشیستەکاندا لە "مالاگا" لە کاتێکدا دوو پەنجەی قاچیان دەبڕییەوە لە حەژمەتی ژان و ئازاردا سروودی "مارسیلیز"ی دەگووتەوە و ئەم نەترسی و بوێرییەی ئەو دەنگی دایەوە. دواتر بەهار داهات و هەموو شتێك ئاسایی لێ هاتەوە. دارەکان خونچەیان دەرکرد و تانکەکان لە نێو شەقامەکاندا کەوتنەوە جووڵەو، لوتفی سرووشت رێگای بۆ "ژەنەراڵ کۆئیپۆ دلیانۆ" خۆش کرد تا ئەو پەلامارەی ماوەیەك بەر لە ئێستا، دژ بە شاری "مالاگا" خۆی بۆ تەیار کردبوو، لە ناوەراستی مانگی کانوونی دووەمدا دەست پێ بکات. ساڵی ١٩٣٧ بوو، ژەنەراڵ گۆنزوالیز کۆئیپو دلیانۆ، کە لە رابردوویەکی نزیکدا لە دژی پاشایەتیدا پیلانگێریی کرد بوو، لە قاوەخانەکانی دەوروبەری "پوێرتادیل سول" لایەنگریی خۆی بۆ کۆمونیزم بە هەمووان راگەیاندبوو، ئێستا فەرماندەیی لەشکری دووەمی

یاخی بووەکانی لە ئەستۆدا بوو، لە نێو ژووری یەکێك لە بارەگا فەرماندەیەکانی خۆی دا لـە "سیڤیل" مایکرۆفۆنێکی دانابوو شەوانە لە پشتیەوە کاتژمێرێك قسـەی بـە خـەڵك دەکـرد و دەیگووت "مارکسیستەکان کۆمەڵێك ئاژەڵی دڕندەن، بەڵام ئێمە خـەڵکێکی مـاقووڵین. ئـەو هاوڕێ بەڕێزانە شیاوی ئەوەن وەکو سەگ دارکاری بکرێن".

سوپای "ژەنەراڵ کوئیپۆ" پێك هاتبوو لە پەنجا هەزار سەربازی ئیتالیایی، سێ لیـوای هـەنگی بیانی و پانزە هەزار کەس لە هۆزە ئەفریقیەکان. ئەوانی دیکە، شتێك لە دەوروبـەری لـە سـەدا دە، هاوڵاتیانی ئیسپانی بوون. پەلامارەکە ڕۆژی دەی مانگی کانوونی دووەم دەستی پێ کرد.

ئەو کات من لە پاریس بووم و نامیلکەیەکم سەبارەت بە جەنگی ئیسپانیا نووسیبوو، کە چاپە فەرەنسییەکەی تازە بڵاو کرابۆوە. مانگەکانی بەر لەو بەرواره، سـەرەتا وەك پـەیامنێری تایبەتی "نیوز کرونیکل" هەواڵ و دەنگو باسم لە بارەی شۆرشگێڕەکانەوە ئامادە دەکرد، بەڵام دواتر کە فەرمانگەی ڕاگەیاندنی "فرانکۆ" لە نێو سنووری دەسەڵاتی میللیەکان دەری کـردم، کارەکەم کەوتە "کاتالۆنیـا"و مەدریـد. ئێسـتاش جـەنگ گواسـترابۆوە بـەرەی ئەنـدەلۆس و بەمنیان گوتبوو بچمە ئەوێ. پانزەی کـانوونی دووەم پاریسـم جـێ هێشـت، بـە شـەمەندەفەر چوومە "تۆلۆز"و لەوێش سواری فڕۆکە بووم و چوومە بەرشەلۆنا. زیاتر لە ڕۆژێك لە بەرشەلۆنا نەمامەوە. شار دیمەنێکی مات و کپی هەبوو. نە نان هەبوو، نە شیرو نە گۆشت. ئاپۆڕای درێژ لە دەرەوەی دوکانەکاندا ریزیان بەستبوو.

ئانارشیستەکان تاوانی نەبوونی خۆراکیان دەخستە پاڵ حکومەتی "کاتالان"و دەستیان بـە ڕاگەیاندنێکی بەربڵاو کرد بە مەبەستی وروژاندنێکی سیاسی. ڕاگەیەندراوەکانیان هەموو سەرجامی پەنجەرەکانی شەمەندەفەرەکانی داپۆشـیبوو. گـرژی و ئـاڵۆزی لـە شـاردا گەیشـتبووە ئاسـتێکی مەترسیدار. وا پێ دەچوو ئیسپانیا نەك هـەر بڕیـار وایـە ببێتـە گۆڕەپـانی دوا پڕۆڤـە بـۆ دەسـت پێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی، بگرە دەبێتـە گۆڕەپـانی جـەنگی براکـوژی لـە نێـوان چـەپڕەوە ئەوروپیەکانیش. دڵخۆش بووم لەوەیا ناچـار نـەبووم وتارێـك لـە بـارەی بەرشـەلۆنا بنووسـم. ڕۆژی شانزەی کانوونی دووەم بە هاوڕێیەتی "ویلی فۆرێست" کە ئەویش هەر بۆ " نیوز کرونیکل" کـاری دەکرد، سواری شەمەندەفەری کاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆ بووین بەرەو " ڤالینسیا".

ئەو دەچووە مەدرید و منیش دەچوومە ماڵاگا. نێو ئەو شەمەندەفەرەی دەچـووە ڤالنسـیا قەڵەبالغ و جەنجاڵ بوو. لە نێو هەر فارگۆنێکدا چوار هێندەی شوێنی ئاسایی خۆی جەنگاوەری تێدا ئاخنرا بـوو، کـە هەنـدێکیان پـاڵ کـەوتبوون و هەنـدێکی تـر بـە پێـوە وەسـتا بـوون.

کارمەندێکی میهرەبانی شەمەندەفەرەکە، جێگای ئێمەی لە نێو ژوورێکی ناو فارگۆنێکی پلە یەك دا کردەوەو دەرگایشی لە دیوی دەرەوە داخست تا کەسێکی تر نەیەتە ژووریّ و جێگامان تەنگ نەکات. هێشتا شەمەندەفەرەکە بە تەواوەتی نەجوولاّ بوو، چوار جەنگاوەری ئانارشیستەکان لە نێو ڕاڕەوەکەدا، کەوتنە کوتانی دەرگا شووشەییەکەی فارگۆنەکەمان. ویستمان دەرگاکە بکەینەوە بەلاّم لە دیوی دەرێ کلیل درابوویەوە بۆمان نەدەکرایەوە. لە نێو قەفەزەکەی خۆماندا گیرمان خواردبوو. ئەو کارمەندەی دەرگای لە سەرمان داخستبوو لەو ناوە دیار نەمابوو. چونکە هەرایەکی زۆریش لە نێو شەمەندەفەرەکەدا هەبوو، نەمانتوانی جەنگاوەرەکان حالّی بکەین لەوەی کە لە دیوی دەرەوە دەرگامان لە سەردا داخراوە و ئەوانیش وایان دەزانی بە ئانقەست دەرگاکەیان لیّ ناکەینەوە.

من و فارێست پێش پێکەنینی خۆمانی پیّ نەدەگیرا و، ئەمەش جەنگاوەرەکانی هێندەی تر تووڕە دەکرد. بارودۆخەکە تا دەهات خراپتر دەبوو. نیوەی خەلکەکەی نێو فارگۆنەکە لەو دیو جامی دەرگاکەوە کۆ ببونەوە تا سەیری ئەو دوو کەسە "ئێمە" بکەن کە بە ئاشکرا لە بە کرێگیراوانی فاشیستەکان بوون. سەرەنجام کارمەندەکە هات و دەرگاکەی کردەوە و کێشەکەی بۆیان روون کردەوە.ئەوە بوو ئیدی بەزم و رەزمی رابواردن و خوشگوزەرانی و هەراهۆریایەکی ترسناك و پالّ بەیەکەوە نان و گۆرانیگوتن و نەرونۆریان دەستی پیّ کرد. تا بەیانی، شەمەندەفەر شەش کاتژمێر لە دوای گەیشتنی خۆی دوا کەوت. ئەو هەندە هێواش و لەسەرەخۆ دەرۆیشت جەنگاوەرەکان لە فارگۆنەکە هەلّبەز و دابەزیان بوو، دەچوونە خواریّ و لە دارەکانی لێواری رێگا باوەش باوەش پرتەقالّیان لێدە کردەوە و لە نێو هەلّلا و قیرە قیری خەلّکەکەدا دیسان سوار دەبوونەوە. ئەم هەراو بەزمە خۆشە تا نزیکەی نیوەڕۆ بەردەوام بوو و هیچ زیانیشی لیّ نەکەوتەوە. تەنیا ئەوە نەبیّ پێی یەکێکیان، لە کاتی خۆفرێدانی دا، لە جیّ چوو، هەر لەویّ لەسەر رێگاکە لێی دانیشت و هیچ نەبیّ تا کۆتایی جەنگ بۆ خۆی پالّ دەکەویّ. "ڤالینسیا"یش لە ژێر هەتاوی درەوشاوەی مانگی کانوونی دووەمدا بە چاوێکی فرمێسکاویی و چاوێکی شاد، لێی راکشا بوو. بە هۆی کەمبوونەوەی کاغەز و پەراو، رۆژنامەکان تەنیا بە چوار لاپەڕە دەردەچوون، کە سیّ لاپەڕەیان بە هەوالّەکانی جەنگ پڕ کرابوونەوە و لاپەڕەی چوارەمیان بە دوا هەوالّەکانی کێبرکێی پالّەوانێتی تۆپێن و جوانەگا بازی و ریکلامەکانی شانۆگەری و سینەما داپۆشرا بوو. دوو رۆژ بەر لە گەیشتنی ئێمە فەرمان درابوو " بە هۆی ئالۆزیی رەوشەکە" سەماخانەو کاباریّ بە ناوبانگەکانی ڤالینسیا کاتژمێر

نۆی شەو دابخرێن. دیارە هەر هەموویان گوێیان بە بڕیارەکە نەدەدا و هەروەك شەوانی پێشتر تا کاتژمێر یەکی دوای نیوە شەو بە کراوەیی دەمانەوە تەنیا دانەیەکیان نەبێ، کە زۆر بە توندی فەرمانەکەی جێ بەجێ دەکرد. دواتر، پەردە لەسەر روخساری خاوەنی ئەو کابارێیە لادراو دەرچوو لە لایەنگرانی شۆڕشگێڕەکانە و هەر بە یەکجاری کابارێکەیان داخست و دەرگاکەیان کلۆم دا. بۆ پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەگەڵ لەندەن دا دەبوایە پێنج، شەش کاتژمێر لە چاوەڕوانیدا بمێنیتەوە. چەند جارێك بە شەو، کە لە چاوەڕوانیکردنی پەیوەندییەکەمدا بێزار دەبووم دەچوومە نێو کابارێکەی ئەو بەر شەقامەکەوە. ئەکتەرەکانی کابارێکە، - هەندێك جوان- لەگەڵ دایك و خوشك و براو پوورەکانیان بە شەرمێکی درۆزنانەوە لە شوێنی تایبەت دا دەنیشتن. کە نۆرەشیان دەهات دەچوونە سەر شانۆ و بە نیوە رووتی سەمایان دەکرد یان گۆرانییان دەگوت و کەم تا زۆر شتێکیان لەهونەرەکەیان لە باردا بوو، پاشان دەگەڕانەوە لای دایك و پوورەکانیان و شەرابیان دەخواردەوە. هیچ گومانێکم نییە ئەگەر پیاوێکی دراوسێیان دڵی شێری هەبوایە و نزیکیان بکەوتبایەتەوە، هەر لە جێدا بە تۆمەتی فاشیستبوون دەسگیریان دەکرد. هەندێ بانگەواز و ئاگاداری بە دیوارەکانەوە نووسێندرا بوون: "هاوشارییان، لەم بارودۆخە زۆر ئاڵۆزەدا، دان بە خۆتاندا بگرن، ئێمە رێگا لە خۆشگوزەرانی کەس ناگرین، بەڵام ئێوەش مەیکەن بە دێهاتیبازی و...". لە مانگی تشرینی یەکەمدا، دواجار کە لە ڤالینسیا بووم، جار نا جارێ سەماکارە ئافرەتەکان سەمای بە ڕووتییان دەکرد. بەڵام ئێستا، پۆشینی مایۆ و سوخمەیان وەکو مەرج بۆ سەما کردن دانابوو. بە ڕاست، تەلەفۆن کردنیش بۆ خۆی کارێکی خۆش بوو. بەر لە تەلەفۆنکردنەکە، دەبوایە دەقی ئەو قسانەی کە دەتەوێ بیکەی، بینێری بۆ فەرمانگەی چاودێری و سانسۆر تا بخوێندرێتەوە، ئەوسا تۆ، کە، لە نێو تەلەفۆنەکەدا قسەت دەکرد، دەقی نووسراوی قسەکانت لە بەردەمی کارمەندی سانسۆرەکە دانرا بوو و گوێی لێت رادەگرت. یاساکانی سانسۆر زۆر توند بوون بەڵام چونکە زۆربەیان ناسیاو بوون زۆر ئەزیەتمانیان نەدەکرد. لە کاتی ئاخاوتنتدا، ئەگەر تاڵە موویەك لە دەقە نووسراوەکەی بەردەمیان دەربچوویتایە لە نێو گۆشییەکەدا ئەیانئەڕاند بە سەرتدا: "هێی، ئەو قسانە لە نێو دەقەکەدا نییە!" لەو دیویش کارمەندەکەی لەندەن هاواری لێ هەڵدەستا: " چی؟ چی؟ " کارمەندی سانسۆرەکەی ئەمدیو وڵامی دەدایەوە: " پەیوەندی بە تۆوە نییە ".

راگەیاندرا بوو کە رۆژی یەکشەمە ٢٤/ی مانگ لە " پلازا دێل تۆرۆ " — گۆڕەپانی جوانە گابازی- پێشبڕکێیەکی گەورەی جوانە گابازی- ساز دەکرێت. بە پێی رێکلامەکەی نێو

رۆژنامەکان ئەم پێشبرکێیە " لە سەر شەرەفی بالیۆزی رووسیا، کە رەزامەندی نواند بوو خۆی لەوێدا ئامادە بێ " ساز دەکرێت. بریاریش وابوو داهاتەکە بۆ "کامسۆمۆلی"ی نوێی رووسیا پێشکەش بکرێت. کامسۆمۆل ناوی ئەو کەشتیە بار هەلگرە رووسییە بوو، کە لە کاتی گواستنەوەی خۆراك بۆ ڤالینسیا لە لایەن شۆرشگێرانەوە نغرۆ کرا بوو. بەلام رۆژی یەکشەممە بە هۆی بارانبارین، رادیۆ لە کاتی پێشکەشکردنی دەنگو باسەکانی جەنگ دا، رایگەیاند، بە داخەوە سازدانی پێشبرکێیەکە تێك چوو.

بەلام رۆژەکانی بەر لەو یەکشەممە، کەشوهەوا زۆر خۆش بوو و نووسەرێکی کۆچبەری ئەلمانی، ئێمەی بە ئوتومبێلەکەی خۆی بۆ گەشت بردە لێواری دەریا. ئێمە چوار کەس بووین. نووسەرە ئەلمانییەکە، شوفێر، فارێت و من. نووسەری ئەلمانی - با ناوی " ئالبیرتۆ"- ی بۆ دابنێین " لە ختو خۆرایی پیتێکی - ۆ- یان بە کۆتایی ناوی هەموومانەوە لکاند بوو " - کۆمیسارییای رامیارییی یەکەیەکی هێزی چەکداری ژمارەی فلان گرویی چەکداری نێو نەتەوەیی بوو. بۆ پشوودان، لە بەرەکانی شەرەوە هاتبووە ڤالینسیا. بەر لە جەنگ رۆمانی دەروونناسی دەنووسی. لەگەل ئەوەیشدا پۆشاکە سەربازییەکەی جوان لێی دەهات. لەسەر لێوارەکەدا راکشاین و بە چاوی نیوە کراوەوە لە خۆرەتاومان دەروانی، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی بەو دەریا شینە جوانەی بەرامبەرمان و، بەو ئاسمانە شینەی دیار سەرمان، جەنگ وەکو کارێکی دوورلە ئەقل و زۆر ئالۆزیك لێك دەدرێتەوە و، بەو بیرکردنەوانەمان نوقمی خەیال ببووین. کاتێ بۆ لای ئوتومبێلەکەمان گەراینەوە بینیمان چوار کەس لە ناویدا دانیشتوون و بە دەم ئارەقە رشتنەوە هەولیان دەدا ئوتومبێلەکە هەلکەن و، شوفێرکەشمان کە کورە گەنجێکی چواردە سالەی ئیسپانیایی بوو، لە تەنیشت ماشێنەکەی دانیشتبوو دەگریا و وەك بارانی بەهار فرمێسکی دەرشت. یەکێك لەو چوار کەسە داوای سویچی ئۆتومبێلەکەی لە ئالبێرتۆ کرد و گوتی ئەم ئوتومبێلە دەستی بەسەر داگیراوە. مۆلەتنامەیەکی کۆمیتەی کۆنترۆل یان کۆمیتەیەکی دیکەی سەر بە"F.A.I" نیشان دا، کە لەسەری نووسرا بوو: "مردن بۆ ئەو کەسانەی بۆ گەشت و سەیرانی تایبەتی خۆیان سوود لە ئوتومبێلی حکومی وەردەگرن". سێ هاوکارەکەی دیکەیشی هەر لە ئانارشیستەکان بوون و دەمانچەی زۆر گەورەیان پێ بوو، کە هاوشێوەی ئەو دەمانچانە تەنیا لە نێو فلیمە بێ دەنگەکانی رۆژئاوای کێوی بەر لە جەنگ دەبینران، تەنانەت گومانم لەوە هەبوو کە بە بارووت و گوللەی مزی پر کرابن. ئالبێرتۆیش پێناسە و وێنەی خۆی

بە پلەی "کۆمیسەری رامیاریی فلان یەکەی هێزی ژمارە فلان گروپی چەکداریی نێو نەتەوەیی نیشانیان داو سەبارەت بە دەست بەسەر داگرتنی ئوتومبێلەکەیشی نارەزایی دەربڕی.

لەم کەین و بەینەدا خەڵکێکی زۆر لێمان کۆ ببوونەوە و بە جلی مەلەوانی، یان پۆشاکی سەربازیی — دۆستانە، رەوتی نمایشەکەیان چاودێری دەکرد.

ئانارشیستەکە گوتی، بۆ ئەو کۆمیسەرەی کە لە گەرمەی شەڕی نێو خۆییدا و کەمبوونی سووتەمەنی، بۆ گەشت و سەیرانی خۆی سوود لە ئوتومبێلی حکومەت وەر دەگرێ و پێی دەچێتە لێواری دەریا، هیچ ڕێزێك دانانێ و دەبێ دەست بەسەر ئوتومبێلەکە دابگیرێ. ئالبێرتۆ وڵامی دایەوە و گوتی هەر سەربازێك لە کاتی مۆڵەتیدا پێویستی بە پشوودان هەیە و باشتر وایە ئانارشیستەکان لە ئوتومبێلەکە دابەزن، ئەگینا ناچار دەبێ بە زۆر فڕێیان داتە دەرەوە. شوفێرەکە، کە تا ئاستی شێتبوون ترسا بوو، لەو لاوە وەستا بوو و هەوڵی دەدا ئەو فرمێسکانەی دەڕژانە سەر گۆناکانی لە ڕێگای لووتیەوە هەڵیانکێشێتەوە. لەم کەین و بەینەدا، سەر گرووپی ئانارشیستەکان، هەر وا تەقەللای دەکرد ئوتومبێلەکە بداتە نیش و لە ئەنجامی هەوڵەکانی ئەودا، گرۆهۆڕێکی زۆر لە ئوتومبێلەکە هەڵدەستا، هەر ئەو گرۆهۆڕەش ئالبێرتۆی کەللەیی کرد. بە تووڕەییەکی شاعیرانە، پەلاماری قۆڵی ئانارشیستەکەی دا و پڕ بە دەنگی، بە زمانی ئەڵمانی بە سەریدا نەڕاندی" دەرێ!! دەرێ!!! " ئانارشیستەکان لە جێی خۆیاندا حەپەسان. تووڕە بوونی ئالبێرتۆ، لە ویژدانپاکی و نییەتخاوێنییەوە هەڵقوڵا. ئانارشیستەکان زەردەخەنەیەکیان هاتێ و لە ئوتومبێلەکە دابەزین. یەکێکیان دۆستانە، بە دەمانچەکەی خۆی بە هێواشی لە پشتی ئالبێرتۆی دا و پێی گوت" جیاوازییەکی نییە، جاری دا بێ دەتکوژین ". سوار بووین. شوفێرەکەمان لووتی سڕییەوە و ماشێنەکەی هەڵکرد و لە نێو هۆراو چەپڵە ڕێزانی خەڵکەکە گەڕاینەوە ڤالینسیا. ڕۆژی بەر لە هاتنم بۆ مالاگا، لەسەر بانگهێشتی ژەنەراڵ "خولیۆ " ئامادەی ڕێ و رەسمی ڕێکردنی سەربازان بووم کە لە شاری " کاستلیۆن "ی لیواریی، کە زۆریش دوورنەبوو لە ڤالینسیا بەڕێوەچوو. ژەنەراڵ خولیۆ، پێشتر، ناوی " یولیۆس دویچ " بوو، هەروەها وەزیری جەنگی کۆماری نەمسایش بوو لە دوای ڕووخانیدا لە ساڵی ١٩١٨. ناوی پاسەوانە تایبەتەکەیشی " کۆنت رۆڤێنتلۆ " بوو کە دەیکردە برازای یەکێك لە ئەندامانی نازیی " رایشتاگ "، بەڵام ئەو، وەك " دویچ " ئەندامی حیزبی سۆسیال دیموکرات بوو. لە ساڵی ١٩١٨ کە حکومەتی کۆماریی لە نەمسا دامەزرا و یولیۆس دویچ بە وەزیری جەنگ دەستنیشان کرا، یەکەم کاری، دەرکردنی ئەفسەرە کۆنە

پەرەستەکانی سوپای پێشوو بوو – ڕێك ئەو کارەی کە کۆماری ئیسپانیا لە ساڵی ١٩٣١ دەبوایە بیکا و نەیکرد. دویچ لە دەگمەن چەپڕەوەکانی ئەوروپا بوو کە زانیاری زۆری لەمەڕ ستراتیژی و زانستە سەربازییەکاندا هەبوو. لەو سەردەمدا نێوەندەکانی باڵی چەپڕەو دیدگا و بۆچوونێکی باشیان سەبارەت بەو پرسانە نەبوو. دویچ کەسێکی نموونەیی بوو. کاتێ بارودۆخ لە نەمسا کەوتە بەر هەڕەشە و مەترسی، سوپای بەرگریی کرێکاریی نەمسایی پێك هێنا کە بە ناوی " شۆتس بۆند " ناوی دەرکرد. " دۆلفۆس " لە شوباتی ١٩٣٤، شۆتس بۆندی هەڵوەشاندەوە. بەڵام دویچ وەك جاران، بە ناو بانگترین کەسی باڵی چەپی نەمسا مایەوە و بە ڕادەیەك لای خەڵکی ڕێزی هەبوو، کەمتر ڕابەرێکی سۆسیالیستی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی، دەیتوانی خاوەنی ڕێزێکی لەو چەشنە بێ. بە پێی پێوەری ئەورووپی، ڕێوە چوونە نمایشییەکان کارێکی نالەبار و گاڵتە جاڕی بوو کە چی لای ئیسپانییەکان نموونەی دیسپلین و ڕازاوەیی سەربازی بوو. مەشقەکان بە هۆی نەبوونی تفەنگ بە هەڵگرتنی دار بە ڕێوە چوو، چونکە سوپا ٩٠٠ کەسییەکە تەنیا ١٤٠ تفەنگیان هەبوو. گرووپی ڕەشاشدارەکان، ڕەشاشەکانیان لێك هەڵوەشاندەوە و پاشان پێکەوەیان ناوە. ژەنەراڵ دویچ کاتگرەکەی دەرهێنا: مەشقەکە نەوەد چرکەی خایاند بوو- کە لە ڕاستیدا زۆر خراپ و مایەی بێ ئومێدی بوو. فەرماندەی گروپەکە جۆرێك لە ژەنەراڵ ڕاما بوو وەك ئەوەی ئەقڵی خۆی لە دەست دابێ. ژەنەراڵ خولیۆ پرسی: " بۆ وا چاوت تێ بڕیوم "؟ فەرماندەکە وڵامی دایەوە: " نەمدەزانی ئەم کارانەش کاتی بۆ دەگیرێ! وامدەزانی تەنیا لە کێبڕکێ وەرزشییەکاندا کات دەگرن، بەڵام ئەمەیش فکرێکی تازەیە " ژەنەراڵ گوتی: " من ئامێرێکی کاتگرتنت بۆ دەکڕم " فەرماندەی گروپەکە وڵامی دایەوە: " زۆر چاکە، ئیدی دەرفەتی چاوتروکاندنیش بە فاشیستەکان نادەین ". هەستێکی پڕ لە خۆشەویستی و ڕێز، لە نێو دڵی هەموواندا سەبارەت بە ژەنەراڵ "خودمان " شەپۆلی دەدا. ژەنەراڵ کە پەنجەوانەیەکی کتانی سپی لە دەستەکانیدا بوو، تەنیا وشەیەکی درێژی ئیسپانیایی نەبوو، بیرکردنەوەیەکی ئەوەندە بەر فراوان و خێرای هەبوو، بە دەگمەن لە کەسێك دەبیندرا. بۆ نموونە ئەو چەتاڵێکی بۆ پێ هەڵواسینی خاکەنازی بچووکی بە کۆڵەپشتی داهێنا بوو کەس شتی وای نەبینیبوو. بەو چەشنە چەتاڵە مرۆڤ وای دەزانی لە سوپایەکی ڕاستەقینەدا خزمەت دەکات. هیچ شتێك بۆ ئەوان، کە هێزە تازە سەرهەڵدراوەکانی کۆماری ئیسپانیا بوون، لەوە خۆشتر نەبوو پێیان بگوترێت لە نێو سوپایەکی ڕاستەقینە دەچن. نوکتەی زۆرم لە بارەی ڕۆژە سەرەتاکانی شەڕی نێوخۆیی گوێ لێ دەبوو. بۆ نموونە جەنگاوەرەکانی

ئەستوونیی ناسراو بە " دووررووتی " رازی نەبوون خاکەنازی بچووك لەگەڵ خۆیاندا بۆ بەرەکانی شەڕ بەرن و بە پۆزێکی کەتەلۆنی و ئانارشیستی یەوە دەیانگوت " ئێمە بۆ شەڕکردن دەچینە بەرەکان نەك بۆ کرێکاری " هەرهەمان ئەو جەنگاوەرانە دوای سەفەرێکی بیست و چوار کاتژمێری بە شەمەندەفەر بەرەو بەرەکانی جەنگ لە " ئاراگۆن " تازە پێ حەسان لە بیریان چووە خۆراك و کەلوپەلی چێشت لێنان لەگەڵ خۆیاندا بەرن و ، تەنانەت بە مێشکیاندا نەهاتبوو، لە جەنگیشدا مرۆڤ نیازی بە تێرکردنی سکی هەیە. جیهان سەری سوڕما بوو لە سەرکەوتنە یەك بە دوای یەکەکانی شۆرشگێڕان لە- باداخۆس، تۆلەدو، تالاڤێرا و بەرەو مەدرید- کە زۆر بە ئاسانی بەدەستیان هێنا بوو. بە پێچەوانەیشەوە، هەر کەسێ کەمترین زانیاری لەمەڕ بارودۆخەکە هەبوایە سەری لەوە سوڕ دەما کە چۆن کۆمار، لە دوای ئەو پەلامارەی لە لایەن سوپاکەی خۆیەوە کرا بووە سەری زیندوو ماوەتەوە. کاتێ دەگەڕامەوە ماڵەوە، بیرم لەو دەکردەوە، ژەنەراڵ لە ژێر فشاری ئەو هەتاوە گەرمەدا کە ئارەقە لە سەرو رووی دەچۆڕا، بۆ پاڵتۆ قورسە سەربازییەکەی دانەکەند. تەنیا کاتێ گەیشتمەوە ئوتێل لەو کارە گەیشتم. پاڵتۆکە، سێدارەی سەربازیی و پەنجەوانەی سپی هەبوو، بەڵام هێشتا یونیفۆرم " پۆشاکی سەربازیی " دەست نەکەوتبوو.

**رۆژی ٢٥/ کانوونی دووەم**، ئەو هەواڵانەی لە بەرەکانی باشوور دەگەیشتن بوونە مایەی نیگەرانی. یاخی بووەکانی دەستیان بە سەر دوو پێگەی ستراتیژی "ماربیلا " لە جادەی کێوی تاریق و "ئەلحەما " لە جادەی " گرانادا "دا گرتبوو. چارەنووسی مالاگا لە چەند هەفتەی داهاتوودا روون دەبێتەوە. بەڵام چوونە مالاگا کارێکی ئاسان نەبوو. رێگای شەمەندەفەر پچڕا بوو. بەنزینیشیان بە کۆپۆن دەدا. چەند رۆژ بوو، دوو رۆژنامەنووسی دیکە بە دوای دەرفەتێکدا بوون تا بچنە ئەوێ. سەرەنجام رۆژی ٢٦/ی مانگ ئەو دەرفەتە هاتە پێش. فەرمانگەی رۆژنامەوانیی وەزارەتی دەرەوە، ئوتومبێل و کۆپۆنی بەنزینیا بۆ سێ سەد و پەنجا کیلۆ مەتر پێمان دا. رێگای مالاگا نزیکەی حەوت سەد کیلو مەتر دەبوو. بەڵام زانیاریمان پێ گەیشت هەرچەندە لە پایتەخت بەرەو باشوور دوور بکەوینەوە بەنزین باشتر چنگ دەکەوێ. ئێمە چوار کەس بووین. خاتوو " گردا. گ "ی رۆژنامەنووسی نەرویجی و "W" رۆژنامەنووسێکی پۆلۆنیایی، شوفێر و من.

# ٢

شەوی ٢٧/ی مانگ بە "ئەلیکانتا "دا تێپەر بـووین و ڕۆژی ٢٨/ی مـانگ گەیشـتینە" ئەلمیریا " لە باشوور. لێرەوە یاداشتەکانم لە بارەی دوا سێ ڕۆژەکانی مالاگا دەست پێ دەکات. یاداشتەکان، کە لە ئەسڵدا نزیکەی بیست لاپەڕەی تـایپکراو بـوو، کـاتی دەسـگیر کـردنم لـە مالاگا، دەستیان بەسەر داگیرا. بەڵام لە نێو زیندانی سیڤیل دا، کە هێشتا ڕووداوەکـان وەکـو خۆیان لە نێو زەینمدا ما بوون، توانیم، زۆر بە وردی، سەر لە نوێ بیاننووسمـەوە و بـە نهـێنی بیاننێرمە دەرەوەی زیندانەکەم. من لـەو یاداشـتانەمدا، کـە بـاس لـە دوا سـاتەکانی ژیـانی شارێکی ڕوو لە وێرانی و، هەڵسوکەوتی سەیری ئەو خەڵکانەی لەوێ ژیان و مردن دەکەم، هیچ دەسکارییەك ناکەم.

## پێنج شەممە ٢٨/کانوونی دووەم، ئەلمیریا

لە خەو هەستام، هێشتا لـە ئاخـاوتنی دوێنێمـدا لەگـەڵ kst " ئەفسـەری خۆبـەخش لـە پاسـەوانیی نێـو دەوڵـەتی " لە"مۆرسـیا " پەسـت بـووم. دەیگـوت لـە پـەلاماری تانکـە ئیتاڵییەکانـدا، لەبـەرەی جـەنگی " پـرادۆ "، چـل ودوو لـە خۆبەخشـکارانی کۆمـاریخوازی ئەڵمانی" کە هەندێکیان لە هاوڕێ هاوبەشەکانمان بوون" لە نێـو سـەنگەرەکەیاندا کۆمـەڵکوژ کراون، چونکە فەرمانی پاشەکشێکردن لە کاتی خۆیدا پێیـان نەگەیشـتبوو. کوشـتنێکی بـێ سوود و بێ مانا. هەمووی لە ئەنجامی ڕۆتیناتی زۆر و کەمتەرخەمی.

**١٠ی بەیانی:** چاوم بە " کامپڵ " کونسوڵی بەریتانیا لە ئەلمیریا کەوت. وەك ئیسپانییەکان، لەسەر پێ و بە راوەستاوی لە بارەی هەموو شتێکەوە قسەمان کرد بێ ئەوەی فەرمووم لێ بکا لەسەر کورسییەك دابنیشم. لەگەڵ ئەوەیشدا کابرایەکی رووخۆش و هاوکار بوو. ئەو دەڵێ لە مالاگا کوشتارخانەیەکی ترسناك بەڕێوەیە. دەڵێن لە توانای خەڵکی دا هەیە تا دوا کەس بەرگری لە شارەکەیان بکەن. هەموو کونسوڵەکانی بیانی، بە هۆی بۆردومانی بێ راوەستانی ئاسمانی و دەریایی، شاری مالاگایان جێ هێشتووە. بەڵام گەمییە جەنگییە بەریتانییەکان هێشتا لە بەندەرەکەن. کە وابێ ئەگەر هەموو رێگاکانمان لێ بگیرێ هێشتا ئومێدێکمان بۆ دەمێنێ. قسەکردن هەندێ هێورمانی کردەوە. کونسوڵە بەریتانییەکان لەم شارە تەنیا و خەمبارەی ئیسپانیادا، وەکو کۆڵەگەی ناو لافاوی کۆتایی دنیان. پتەو و جێگیر. نیوەڕۆ بەرەو مالاگا بەڕێ دەکەوین. جادە تا دێ وێرانتر دەبێ. ئەو ئاوەی لە کێوەکانەوە سەراوژێر دێتە خوارێ لە چەندین شوێندا بەسەر جادەکە کەوتووە. نازانم ئەو لۆرییانەی سەرباز و تەقەمەنییان هەڵگرتووە چۆن دەتوانن بە نێو ئەو لێشاو و لافاوەدا رێ بکەن. لە راستیشدا ناتوانن. جادە، ئەو تەنیا جادەیەی کە مالاگا دەبەستێتەوە بە ئیسپانیای کۆماری، هەر بە جارێ چۆڵ و هۆڵە. ئایا وا بە زوویی مالاگایان جێ هێشت؟ کە چی هیچ کەسێکیش نابینین هەڵبێ. زۆر سەیرە.

## موتریل، کاتژمێر سێ ی دوای نیوەڕۆ

کوێرە گوندی بچووك و پیسی ماسیگرەکان. کەس نازانێ بارەگای فەرماندەیی لە کوێیە. دواجار لە نێو قوتابخانەیەکدا دۆزیمانەوە. ئەمجا بە دوای فەرماندەدا وێڵین. کاتژمێر چوار ئەویشمان دۆزییەوە- پێیوە دیارە پێنج رۆژ دەبێ ریشی نەتاشیوە، بەڕێوەبەری پێشووی فەرمانگەی پۆست و ئەندامی حیزبی سۆشیالیست و دەستە راستی " پریتۆ ". لە وڵامی پرسیاری ئێمەدا، لەوەیا کە هیچ سەرباز و چەك و تەقەمەنیمان لە جادەکەدا بەدی نەکردووە،

تەنیا شانەکانی هەڵدەتەکێنێ و دەڵێ: _ سێ ڕۆژ لەمەو بەر سێ لۆری پڕ لە تەقەمەنی گەیشتە ئەلمیریا. داوایان لە سەندیکای ناوچەکە کرد بارەکانی بگەیەننە مالاگا چونکە لۆرییەکان دەبێ بگەڕێنەوە، بەڵام سەندیکای ئەلمیریا گوێی پێ نەدا و گوتی، ئێمە بۆ گەیاندنی خۆراك پێویستیمان بە لۆرییەکانمان هەیە و پێ داگرییان کرد کە لۆرییەکانی ڤالینسیا بارەکانیان ببەنە مالاگا. بوو بە هەڵلاو بیست لۆری گەڕانەوە ڤالینسیا و بارەکانیان لە نزیك ئەلمیریا داگرت. تەقەمەنیش لە مالاگا نییە. ئێستا تەنیا کارێك کە لە بەردەم شۆڕشگێڕەکاندا مابێتەوە چوونە ناو شارە، ڕەنگە کە گەیشتنە ئەوێ، بیانبینن.

گ.گ هەندێ شتی یاداشت کرد و پێنج خولەك دواتر هەمووی دڕاند.

هەواڵنێرێکی جەنگی هەرگیز ناتوانێ ئەم جۆرە شتانە بنێرێ.

فەرماندە گوتی:_ بە ڕاست، ئێوە ناتوانن بچنە مالاگا. پردەکەی ئەو دیو موتریل ڕووخاوە، جادەکانیش کەوتوونەتە ژێر ئاوی لافاو، دەبێ بوەستن تا بارانەکە هەندێ خۆش بکا.

_کە وا بێ پەیوەندی مالاگا لەگەڵ دنیای دەرەوەی خوێندا پچڕاوە ؟

_تا ئەو کاتەی باران بباریێ، بەڵێ

_چەند ڕۆژە ئەو بارانە دەبارێ؟

_چوار ڕۆژە، تا هەفتەی ڕابردووش، دە ڕۆژ بە سەر یەکەوە باری

_لە کەیێنێوە پردەکە ڕووخاوە؟

_چوار پێنج مانگێك دەبێ

_ئەی بۆ ئەو پردە نەفرەتیە لەو هەموو ماوەیەدا چاك نەکراوەتەوە؟

جارێکی تر شانەکانی خۆی هەڵتەکاند:"ڤالینسیا کەلوپەل و وەستا نانێرێ". بێباکی و خەمساردی ئەو کابرایە دەمارەکانی جووت دەکرد. ئاخر ئەویش وەك من دەزانێ- چارەنووسی مالاگا بەو پردەوە بەستراوەتەوە- منیش باس لە "کەمتەرخەمی تاوانبارانە" دەکەم.

بەڕێوەبەری پێشووی فەرمانگەی پۆستە، بێ هیچ خۆشێلوو کردنێك ماوەیەك سەیری کردم و وەك باوکێك پێی گوتم:"ئێوە بیانییەکان هەر وا تووڕەن، لە وانەیە ئێمە مالاگا لە دەست بدەین، ڕەنگە مەدرید و نیوەی"کەتەلۆنیا"ش لە دەست بدەین، بەڵام دواجار سەر دەکەوین"

لە شێوازی بەڕێوە بردنی جەنگی ئیسپانییەکاندا- لە هەر دوو لایەنی پێکناکۆك دا- جۆرە هەڵسەنگاندنێکی ڕۆژهەڵاتی بە زەقی پێیانەوە دیارە. ئەمەیش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە شێوازی جەنگی ئیسپانییەکان هاوکات بێ پلان و پڕ لە توندوتیژی و ترسە. جەنگەکانی تر

زنجیرەیەك پێكدادانە، ئەمەیان، زنجیرەیەك كارەساتە. كاتژمێرێك دواتر، سەرەڕای رووخانی پردەكە، بەڕێ دەكەوین. واتە دەبێ نزیكەی پانزە كیلومەتر رێڕەوی رێگامان خوار بكەینەوە و بە هەندێ كوێرە رێگادا بڕۆین كە رۆیشتن پێیاندا یەكجار ئەستەمە و پێویست دەكات بە نێو كێڵگەكاندا گوزەر بكەین و دوا كیلۆمەتریش دەبێ لە رووبارێك بپەڕینەوە، دە ئینج ئاوی تێدایە. ئوتومبێلە سووكەكەی ئێمە بە هەندێ رێگادا دەڕوا، ئەگەر ئوتومبێلێكی قورس بوایە هەر لە جێدا دەچەقی. دوا راوەستانمان بەر لەوەی بگەینە مالاگا "ئالموونەكار" بوو. ئوتێلێكی لێیە سەردەمێك ناوبانگی خۆی هەبووە. كۆنت رۆنتێللۆ لە ڤالینسیا رایسپارد بوو. خاوەنی ئوتێلەكە خەڵكی زۆریخە و پیاوێكی قەڵەو و بێ خەوشە و بە زمانی ئەڵمانی داوای لێبووردن دەكات. دەڵێ: "لە ماوەی دوو مانگی رابردوو دا ئێوە یەكەم میوانی منن. ببوورن ئەگەر ئوتێلەكە وەك جاران خاوێن نییە. بەڵام خۆتان دەزانن ئیدی، ئیسپانیا لە جەنگدایە". پێی دەڵێین بەڵێ، بێ ئاگا نین. دوای دوو كاتژمێر چاوەڕوانی ئێوارە نانێكی باش دەخۆین و دیسان بەڕێ دەكەوینەوە. درەنگای ئێوارە دەگەینە مالاگا. ئەوەی بینیمان و هەستمان پێ كرد: شارێكی بوومەلەرزە لێدراو، شەقامەكانی هەر هەمووی وێران، شۆستەكانی چۆڵ و هۆڵ و پڕ لە چاڵ و چوڵە و قۆرتی گەورە، كە ئاسەواری كەوتنە خوارەوەی گوللە تۆپەكان بوو بە سەرییەوە دیار بوو، بۆنێك كە لە مەدریدەوە پێی ئاشنا بووم وەك تۆزی وردە گەچی تێكەڵاو بە باڕووت لە نێو هەوا دا — ئایا تەنیا خەیاڵ دەكەم؟- بۆنی ناحەزی گۆشتی سووتاو. تروسكایی كەمرەنگ و سەرگەردانی لایتەكانی ئوتومبێلەكەمان دەكەوتە سەر دارو پەردووی وێران و وێرانتر.

خاك و خۆڵ، دارو پەردوو، وێرانی و...ئیدی هیچ ! مەدرید لە دوای بۆردومانە ئاسمانییەكەو تۆپبارانەكەدا بە بەراورد لەگەڵ ئەم شارە سەراو بن كراوەدا، بەهەشت بوو.

لە ئوتێل "رێجینا" پارتیزانە بێ سەرو بەرەكان بەڵام روو خۆشەكان، تف هەڵداوێنە سەر زەویە كاشی رێژەكەو، ماهی سوورەوە كراو دەخۆن- تەنیا خۆراكێك كە وەگیر دێت. ئێمە تاكە میوانی ئوتێلەكەین. خزمەتگوزارەكە پێمان دەڵێ، دوای نیوەڕۆی ئەمڕۆ، بومبێكی نیوتەنی لەم نزیكانە خانوویەكی بە سەریەكدا رماندو تەنیا لە ناو ئەو خانووەدا پەنجا و دوو كەسی كوشت. خزمەتگوزارەكانی دیكەیش لە دەوری مێزەكەدا كۆ دەبنەوە و باس لە بۆردوومانەكە و رووبەڕووبوونەوەی خەڵكەكە لەگەڵ رووداوەكەدا دەكەن. ئەوان باسی "برناردۆ" دەكەن كە چۆن خۆی لە پشت مێزەكەوە شاردەوە و "خوسوس" چۆن لە پەنجەرەكەوە سەیری دەرەوەی دەكرد و

"دولورس"ی چێشتلێنەر چۆن پەنجا و حەوت جار هێمای خاچی بەسەر سنگیدا کێشا و پاشانیش لە هۆش خۆی چوو.

لەگەڵ "گ. گ" دا دەچمە دەرەوە پیاسەیەك دەکەم. بەڵام تاریکییەکە ئەوەندە تۆقێنەرە هەر خێرا دەگەڕێینەوە. ئەوەتا دەلەرزین و زۆریش خەمبارین. دەرگاوانی ئوتێلەکە لە ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە رادەمێنێ و دەڵێ: "ئەمشەو شەوی بۆردومانی ئاسمانییە" کچەکەی لە بۆردوومانەکەی دوێنێ دا هەردوو پێی بڕاوەتەوە و زۆر دڵنیا نییە لەوەتیی زاواکەی ژنێکی پێ بڕاوی دەوێتەوە یان نا.

## هەینی، ٢٩/ی کانوونی دووەم

بۆ خواردنی بەیانی نان نییە. بێجگە لە قاوەیەکی تاڵ هیچ شتێکی تر نییە. خۆراکیش لە شار، هەروەك چەك و تەقەمەنی، لە ئەنجامی کەمتەرخەمی و هەست نەکردن بە بەرپرسیارێتی دوایی هاتووە. ئەمەیش دەرەنجامی پردە رووخاوەکەی موتریل. شار بە دوو سەد هەزار دانیشتوانەکەیەوە برسی ماوەتەوە.

هەموو دانە بەیانییەکەی بە سەردانیکردنی فەرمانگەکان رۆیی: فەرمانگەی راگەیاندن و بارەگای فەرماندەیی پارتیزانی. لە هەموو شوێنەکاندا بە گەرمی پێشوازی دەکرێین. رێ و رەسمێکی بێزارکەر و بێ هیچ رێکخستنێك.

ناردنی پەیام بۆتە کارێکی مەحاڵ. ئاسانکاریی سانسۆر بۆ هەواڵنێرە بیانییەکان بە هیچ شێوەیەك نییە و ناکرێ. لە دوای مشت و مڕێکی زۆر، ئەفسەرێکی گەنج، کە کەمێك زمانی فەرەنسی دەزانێ دەبێتە بەرپرسیاری سانسور کردنی راپۆرتەکانمان.

دوای خواردنی فراڤین دەچمە خوارێ تا سەرێك لە بەندەر بدەم. کونسولخانەی بەریتانیا ل بەرامبەر بەندەرە. درزێکی گەورە لە بەشی پێشەوەی باڵەخانەکە دەبینـدرێ. گوللە تۆپێکی شۆرشگێڕەکان بە بێ دەنگی کەوتە ئەوێ. بەڵام نەتەقییەوە. گەمییەی جەنگی بەریتانیا ئیدی لە بەندەرەکە نییە. لەوە ناچێ ئەوروپا هیچ بایەخێك بە مالاگا بدات. دوو سێ ژن و پیاو بە ڕاکە ڕاکە لە بەندەرەکەوە دێن، روویان لە ئاسمان کردووە. ساتێك دواتر ناقوسی کلێساکان دەکەونە لێدان. ئاگادار کردنەوەیە بۆ هێرشی ئاسمانی. تەنانەت فیکەیەکیش بۆ ئاگادار کردنەوە نییە. هەمووان شپرزە و تێك چڕژاو، بەم لاو و ئەو لادا هەڵدێن. ترس و تۆقان زۆر لەوە زیاترە کە لە مەدرید هەبوو. شارەکە بچووکترە و ئارمانجەکان لەسەر لێواری دەریا روونتر

و دیارتر دەبیندرێن. خەلکەکەیش بە تەواوی ورەی بەرداوە. دیار بوو ئەمجارەیان بە هەڵە ناقۆسەکانیان لێدا بوو. پاشان، دیمانە لەگەڵ سەرهەنگ "بیلیالبا" فەرمانـدەی هێزەکانی مالاگا دەکەم ئەویش بە راشکاوی دان بەوەدا دەنێ کە بارودۆخ باش نییە. بەڵام ئەوەش دەڵێ کە دە رۆژ پێشتر بەر لە دەسبەکار بوونی ئەو، بارودۆخەکە لە ئێستا خراپتر بوو. سەرهەنگ دەڵێ: "یەکەمجار سەردانی ئەو بەرەیەی شەڕم کرد کە لە هەمووان مەترسیدارتر بوو. جادە لێوارییەکەی مالاگا- ماربیلا- جبل الگارق نە سەنگەرێکی لێ بوو نە هیچ موکومکارییەك، لە دوو جەنگاوەر زیاتر کەسی لێ نەبوو، ئەوانیش لە مەودای دوو کیلۆمەتریی دوژمن دا دانیشتبوون و جگەرەیان دەکێشا. لێیانم پرسی: "نەفەرەکانتان لە کوێن"؟ گوتیان: "لە پەناگەکانن، ئەگەر شۆرشگێڕەکان هێرشمان بۆ بێنن ئێمە دەیانبینین.. ئەوسا ئاگاداری نەفەرەکانمان دەکەینەوە و پێویست ناکات ئەوانیش بێنە ژێر بارانەکەوە.".

دەخزێمە نێو پێخەفەکەم. کەوتۆتە دڵمەوە رووداوی ناخۆشمان لە پێشە. هەوڵ دەدەم خۆم بخەڵەتێنم و وا لە خۆم بگەیەنم ئەم شتانە هەمووی خەیاڵاتە.

## شەممە ٣٠/کانوونی دووەم

سەردانیکردنی بەرەی شەڕ لە ماربیلا. بە سواریی ئوتومبێل جادە لێوارییەکەمان بڕی. هیچ ئاسەوارێك لە پاسەوان و دێدەوانێك نییە. تا ئەوێ کە پەنجا کیلۆ مەتر رۆیشتین و لە سەنگەرێکی لە بەرد دروست کراوی کاتیی رێگایان لێ گرتین. ئێرە بەرەی شەڕە. لە لای راستەی سەنگەرە بەردینەکەدا جەنگاوەرەکان کەوتوونەتە سەنگەر هەڵکەندن. بە دۆرماندۆری سەنگەرەکەدا لێی دانیشتوون و خاکەنازە بچووکەکانیان ناوەتە سەر ئەژنۆکانیان. "گ. گ" کامێراکەی ئامادە دەکات. فەرمانده بە سەریاندا دەنەڕێنێ: " هاوڕێیان دەست بە کاربن، وێنەتان دەگرن". لێمان دەپرسێ، "ڕامان چیە لە بارەی بەرە شەڕەکەی ئەو؟" منیش دەپرسم کاتێك تانکەکان بگەنە ئێرە، ئەوان چ دەکەن؟ شانەکانی هەڵدەتەکێنێ: "نەفەرەکانم وە دوای خۆمدا دەخەم و دەیانبەمە نێو کێوەکان".

## یەکشەممە ٣١/ی کانوونی دووەم

بریار وابوو سەرهەنگ "ئالفرێدو" کاتژمێر ١١ بە دوامانـدا بێت و بمانباتە شارە دێی "ئانتێ کوێرا". بێ سوود چاوەڕێی دەکەین. نیوەڕۆ مولازمێك لە جەنگاوەرەکان دێتە لامان و دەڵێ ئالفرێدۆ ناساغە و ئەو، راسپێردراوە بمانباتە بەرەی شەڕ. نزیکەی کاتژمێر چوار بەرێ

دەکەوین. بە پێی نەخشە بەسەر ڕێگاکەدا دەڕۆین. ئەوەکا بە هەڵە بە ڕێگایەکدا بڕۆین و بکەوینە ناو دەستی یاخییەکان. بە هۆی بێ سەرو بەری بەرەکانی شەڕ لە ئیسپانیا ڕووداوی لەم چەشنە دێتە پێشێ. بۆ زۆرێك لە ڕۆژنامەنووسەکان و تەنانەت زۆرێك لە ئەفسەرەکانی هەردوولادا ڕووداوی لەم جۆرە ڕوویداوە. دوای بیست خولەك دەرکەوت بە هەڵە بەم ڕێگایە دا هاتووین. ناوی شوێنەکان لەگەڵ ئەوەی لە نەخشەکەدا هەیە یەك ناگرنەوە. سەرنجی مولازمەکەم بۆ ئەم بابەتە ڕاکێشا. بە تەوسەوە لە بیانییەك ڕاما، کە هەمیشە خەیاڵ دەکات لە هەمووان زیاتر شت دەزانێ و، بە قەشمەرییەوە زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوی. وەك هەمیشە، بە درێژایی ڕێگا، هیچ نیشانە و ئاسەوارێك لە پاسەوان و گەشت یان هێمایەك بۆ نزیك کەوتنەوەمان لەر بەرەی شەڕ بەر چاو ناکەوێ. سەرەنجام دوو جەنگاوەر دەبینین کە بەسەر ڕێگایەکەدا دەسووڕانەوە دەرکەوت، کە بە ڕاستی ڕێگامان لێ بزر بووە. ئێمە ئێستا لەسەر جادەی، "ئالغرناتە"ین، نەك ئانتێ کوێرا، کە مەبەستی ئێمە بوو. تا گوندەکەی ئەولا تر کە ناوی "کولمێنار"ە دە- دوانزە کیلۆمەتر ڕێگایە. پرسیم "کولمێنار بە دەست کام لایەنەوەیە" یەکێك لە جەنگاوەرەکان گوتی "بە دەست ئێمەوەیە". یەکێکی تر گوتی "نا، بە دەست یاخیبوەکانەوەیە"

مولازم زۆر پەست بووە. دواجار بەرەو کولمێنار بەڕێ دەکەوین. لە سەرپێچی کۆتایی جادەکە، بەر لەوەی بگەینە گوندەکە، بە وردی تەماشا دەکەین، دڵمان بە توندی لێ دەدا. دەبێ چی ببینین- مووره جامانە سەوزەکان، یان پارتیزانە چەفیە ڕەشەکان؟ نە ئەمیان و نە ئەویان. لە هەموو کولمێنار هیچ کەسێکی سەربازیی بەر چاو ناکەوێ. هێشتا بیست و پێنج کیلومەتر لە بەرەی شەڕەوە، بەرەو باکوور ڕێگا لە پێشمانە. مولازم پێشنیاری کرد، کوێرە ڕێگاکەی ناوەڕاستی دەشتاییەکە، کە لە نێو نەخشەدا نییە، بگرینە بەر، بەرەو ئانتێ کوێرا. دنیا بەرەو تاریکی یە. گوێ بە قسەکەی نادەین و پێداگری لەسەر ئەوە دەکەین ڕاست بەسەر ڕێگاکەدا باژۆین. ئامادە نین گوێمان لە ناوی هیچ کوێرە ڕێگایەك بێ. دوای نیو کاتژمێر دەگەینە بەرەی ئالغرناتە. هەندێ ئارامترە لەو شوێنەی دوێنێ بۆی چووین. ڕەشاشەکان لە دوو لای جادەکە دامەزرێندراون. بەڵام جادەکە کراوەیە و تا ناو سەنگەرەکانی یاخیبووەکان دەچێ کە پێنج کیلۆمەتر دوورترە.

لە ئەقیبی فەرماندەی بەشەکە دەپرسم بۆ جادەکەیان نەتەقاندۆتەوە؟ بە پۆزێکەوە دەڵێ، ئەو هیچ کات کارێکی وا ناکات. چونکە لەوانەیە بۆ پەلاماردانێکی چاوەڕوانکراو پێویستی بە

جادەکە هەبێ. سەنگەرە کۆنکریتیەکانی ڕەشاشەکان، کە لە هەر دوو لای جادەکەدا هەن دەتوانن پێش لە پێشڕەویکردنی هێزی پیادەی دوژمن بگرن.

_بەڵام تانکەکان چی؟

نەقیب شانەکانی هەڵدەتەکێنێ و دەڵێ: "هیچ هێزێك دەرەقەتی تانکەکان نایێ".

دەڵێم: "ئەی ئەگەر هاتن چی دەکەن"؟

_بەرەو کێوەکان دەڕۆین.

## دووشەممە.. یەکی شوبات

سەرەنجام ئەمڕۆ توانیمان سەردانی بەرەی ئانتی کوێرا بکەین کە دوێنێ هەوڵمان دا بیگەینێ. بەرەی شەڕی وا بێ سەروبەرم قەت نەدیوە. بەرەی شەڕ لە هەموو ئیسپانیا، بێجگە لە ناوچەکانی دەوروبەری مەدرید، هاو واتای شارێیە. ئەم بەشە لە شارێی "مالاگا- ئانتی کوێرا- کوردویا" ڕێك بەر لە پەڕینەوە بە ناوەڕاستی ئانتی کوێرادا، لە ڕێڕەوێکی کوێستانیی بەرز تێدەپەڕێ. ئەم زنجیرە چیایە بە ناوی سییێرائیل تورکال" ناسراوە و یەکێکە لە بەرزاییەکانی سییێرا نۆڤادا. ڕێڕەوکە سێ هەزار پێ بەرزە. ترۆپکی هنداو ڕێڕەوەکە، کە شاخێکی یەکپارچەیە بە نزیکەی هەزار و پێنج سەد پێ لە ڕێڕەوەکە هەورازترە. لەو سەرەوەدا، لەسەر "شاخی شەیتان" نەقیب "پێزارۆ" خۆی مات داوە و جادەکەی خوارەوە چاودێری دەکات تا بزانێ شۆڕشییەکان دێن بە وێدا یان نا. ئامێری تەلەفۆن و وایەرێکی پۆلاّیی لە تەنیشتەوەیە. کاتێ شۆڕشگێڕەکان دێن، پێزارۆ دەبێ بە تەلەفۆن ئاگاداری بنکەی خوارەوە بکات. بەڵام چونکە دڵنیایە لەوەی تەلەفۆنەکەی لە کاتی پێویستدا کار ناکات، ئەو وایەرە پۆلاّییەی لای خۆی داناوە کە بە درێژایی هەشت سەد یارد ڕاکێشراوە بۆ بنکەی خوارەوە، کاتێ سەری وایەرەکە لای خۆی ڕادەکێشی زەنگێك لە خوارەوە لێ دەدرێ. جاری وا هەیە باڵندەیەك دەنیشێتە سەر وایەرەکەو دەنووکێکی لێ دەدا و دەبێتە هۆی ئەوەی لە خوارەوە زەنگی ئاگادار کردنەوە لێ بدرێ. شەش مانگە ئەم بارودۆخە ناوهایە. لە دەسپێکی شەڕی نێو خۆییەوە، لەم بەشە سەیر و سەمەرەیەدا، هیچ شتێك ڕووی نەداوە. تەنیا هەورەکانی ژێر پێی پیزارۆیە کە بەردەوام لە قەڵەمڕۆی شۆڕشگێڕانەوە بەرەو سنووری دەسەڵاتی حکومەت و بە پێچەوانەوە لە هاتوچۆدان.

بە ڕاست، پیزارۆ دەڵێ لە نەوەکانی ڕزگارکەری پیرۆیە. شەش مانگ بەر لە ئێستا، کاتێ ئەو و دەستەکەی ئەم بنکەیەیان داگیر کرد، تاقمەکەی نە بەتانییەکیان هەبوو نە فیشەکێك.

شەوەکانی سییرا سارده و لە ژێر پێی ئەوان دا، شاری دوژمن- ئانتی کوێرا- راکشا بوو کە بە دڵنیاییەوە فیشەك و بەتانی زۆریان هەبوو. لە شەوێکی بارانی و سارد دا خوێنی "رزگارکەران" لە نێو دەمارەکانی پیزارۆ کەوتە جۆش و لەگەڵ چەند کەسێك لە تاقمەکەیدا شۆڕ بوونەوە بەرەو ئانتیێ کوێرا و پەلاماری کۆگای ئازووقە و تەقەمەنییان دا و بە کۆڵێ بەتانی و فیشەکەوە گەڕانەوە.

پاش ماوەیێکی تر جگەرەیان لێ بڕا. پیزارۆ دیسان پەلاماری ئانتی کوێرای دا و جگەرەی هێنا. دواتر کە وەرزی بەهاردا هات و جووتیاران تۆیان نەبوو بۆ چاندن، ردێنسپی قەڵاکە، بە رێ و رەسمێکی تەواو، سەرکەوتە سەر شاخی شەیتان و پێشنیاری دایە پێزارۆ، پەلامارێکی ئانتی کوێرا بدات و هەندێك تۆوی گەنمە شامییان بۆ بێنێ. پێزارۆ پەلاماری داو تۆوی گەنمە شامی بۆیان هێنا. بەر لەمە، هیچ کاتێك، نە پەیامنێری بیانی و نە هی ناوخۆ، کەس رێی نەکەوتبووە ئەم بنکە سنوورییە لا تەریکەی شەڕی نێو خۆیی. بۆیە ئەم بۆنەیە بە شێوەیەك ئاهەنگی بۆ ساز کرا. چووینە بنکەی خوارەوە کە لەوێ مەڕێکیان سەر بڕیبوو. کاتێ لە سەر مێزی نانخواردن دانیشتین کەسێك لەو سەرەوە، وایەرەکەی راکێشا و زەنگەکە لێدرا و لەسەر گردۆلکەی بەرامبەرمان تۆپی بە خێر هاتن هاوێشترا. پێزارۆ بە خۆشییەوە هەموو گەنجینەی خۆی نیشانمان دا: رەشاشێك "هەر یەکێك لە ئێمە دەبوایە چەند رێژنەیەك بتەقێنین"، ئەسپە سەربازییەکانی "دووانیانی لە وان هێنایە ژووری دانیشتنی ئەو جووتیارەی کە ئێمە لەوێ نانمان دەخوارد و ئەوانیش بۆنیان بە گۆشتی مەڕەکەوە کرد"، سنووقێکیش پڕ بوو لە نارنجۆکی دەستی "شانازیمان پێ درا هەر یەکەو دانەیەك تاقی بکەینەوە، ئێمەش بە سوپاسەوە قبوڵمان نەکرد". گ. گ سەرنجیانی راکێشا بوو. یەکەم لە بەر ئەوەی ژن بوو، دووەم لە بەر ئەوەی پانتۆڵی لە پێ بوو، سێیەم لە بەر ئەوەی کامێرای وێنە گرتنی پێ بوو، بزنێکیان پێشکەشی کرد. لە کاتێکدا ئەم دێڕانە تایپ دەکەم بزنەکە لە تەنیشت ئامێری تایپەکەم راکشاوە و باعە باع بۆ دایکی دەکات. لەوەیا کە بۆتە سیمبوڵ ئاگادار نییە. سیمبوڵی بێگەردی و پاکیی منداڵانەی ئەو خەڵکە، کە "مورەکان" رژاونەتە سەریان. بە راستی بۆ؟ هیچ هۆیەکی بۆ نییە. هەر ئەو پرسیارەی مێشکمی کون کرد بوو لە پێزارۆشم پرسی، کە ئەگەر تانکەکان هێرش بێنن چ دەکات. وڵامی دایەوە "لێیان گەڕێ با بێن، بە دەستی بە تاڵ تەفروتونایان دەکەین، ئوتومبێلە نەفرەتیەکان!"

"پاشکۆی یاداشتەکان: لەندەن، پاییز- پێنج ڕۆژ دواتر تانکەکان هاتن. نازانم هەر ئەو کاتی پیزارۆ کوژرا یان پاشان گوللەبارانیان کرد"

## سێ شەممە، دووی شوبات

بەیانی، وتارێکم نووسی. نیوەڕۆ سەردانی "سەرپیتر چامرز میچل"م کرد. گەورە پیاوی مالاگایە. لە ساڵی ١٩٣٢، دوا بە دوای بنیاتنانی باخچەی تازەڵانی "ویپسناد"، کە دەرئەنجامی ٣٠ ساڵ بەرنامەرێژییەکەی بوو، خانووێکی هەر لێرە کڕی تا ژیانێکی ئارام و ئاسوودە بباتە سەر. بەڕاستی ئاسوودە و ئارام... ڕۆحە پڕ کێشەکانی وەك ڕۆحی ئەو، توانایەکی سەیریان تێدایە تا بە شێوەیەکی زۆر پاك و بێ گەرد، خۆیان بخەنە نێو کێشمەکێشەکانەوە. تازە لە نووسینی بیرەوەرییەکانی بۆتەوە بە ناوی "سەرقاڵیی ڕۆژگارەکەم". خانووێکی نیوە ئیسپانی و نیوە ڤیکتۆریایی بە سەلیقە و جوان و، باخە ڕازاوەکەی لەم شاری تارماییەدا وەك دوورگەیەکی سیحراوی خۆی دەنوێنێ. بە زوویی بووینە هاوڕێ. سەرپیتر دەعوەتم دەکات ئەگەر بارودۆخەکە بەرەو خراپی ڕۆیی، بگوێزمەوە ناو خانووەکەی ئەو. ئەو سوورە لە سەر ئەوەی، بارودۆخ هەر چییەکی بە سەر بێت لێرە دەمێنێ. وەك بڵێی منیش هەست بەوە دەکەم لێرە دەمێنمەوە. ئەم شارە و چارەنووسەکەی، مرۆڤ بە شێوەیەکی سەیر جادوو دەکات. خۆڕسکاندن لە داوی ئەم سیحر و جادووە کارێکی قورسە. نیگا برسییەکانی هەموو دانیشتوانی ئەم شارە لە ناو چاوەکانی سەر پیتریش دەبیندرێ. برسێتیی خۆی بە ماسیی کەباب کراو و پسکێتی وشك دەڕەوێنێتەوە و سەرەرای چێشتلێنەر و ئافرەتێکی خزمەتکار و باخەوان، دەبێ سکی کچی چێشتلێنەر، و پووری خزمەتکار و ژن و خەسووی باخەوانیش تێر بکات. هەموو ئەوانە لە نێو ژوورەکەی باخەوان دەژین، لە کاتێکدا بیست کەسی دیکەی گوندەکانی دەوروبەریش لە نێو گەراجەکەدا دەژین. "دۆن پێدرۆ" ئاوها کە ئەوانی تر بانگی دەکەن، وەك سەرۆك هۆزە بیابانییەکان لە نێویاندا دەژی. کاتێ گەڕامەوە هوتێل، بزنەکەم لە گەرماوە کە دەرهێنا کە ناویان نا بوو "ژۆزفین" و ڕادەستی شوفێرەکەم کرد تا بۆ سەر پیتەری ببات. پارچە کاغەزێکیشمان لە دەوری ملی ئاڵاند بوو، کە پەیامێکی "میوانداریی ئەفلاتونی" لە سەر نووسراو بوو. لە ژێر هەموو ئەو وشانەی مانای "خواردن" و "خۆراك"یان دەدا هێڵێکی سوورمان کێشا بوو. ئەمەیش وای دەگەیاند کە ژۆزفینی سیمبوڵ،

نابێ بنێردرێته باخچەی ئاژەڵانی ویپسناد و دەبێ بەو پەڕی نیشتیهاوە بخورێ. کاتێ بیر لە بەرەکانی شەڕ دەکەمەوە دەبینم هەموو شتێك گوزارشت لە نائومێدی دەکات. بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەو کپی و بێدەنگییەیە، کە باڵی بەسەر هەموو بەرەکانی شەڕدا کێشاوە. مالاگا، بەلای کەم رۆژی جارێك لە ئاسمانەوە بۆردومان دەکرێت، لە کاتێکا لە هەموو بەرەکانی شەڕدا تاکە گوللەیەك ناتەقێنندرێ. دوا هێرشی شۆرشگێڕەکان لە جادەی گرانا دا و جەبەل تارق، هاوکات دە رۆژ پێش، ئەنجام درا و تەواو. گومان دەکەم بە هۆکارێکی نادیار، وەك هەموو شتەکانی تر کە لەم شەڕە سەیر و سەمەرەیەدا پێشبینی ناکرێن، یاخیبووەکان بیرۆکەی پەلاماردانی مالاگایان لە مێشکی خۆیاندا سڕیوەتەوە. چەند جارێك قسەم لەگەڵ بیلیالبا کردووە. ئەویش هەمان ئەو بۆ چوونەی هەیە. شار هێشتا بێ تەقەمەنی و بێ خۆراکە. بەڵام پێ دەچێ موعجیزەیەك ئەم شارە رزگار بکات. شتێك وەك دووپات بوونەوەی ئەو موعجیزەیەی مادریدی رزگار کرد لە رۆژەکانی دوای شەشەمی نۆڤەمبەر، کاتێ کە حکومەتی "کابالیرۆ" هەڵاتبووە ڤالانسیا و فرانکۆ هەر کاتێ بیویستبا دەیتوانی پێ بنێتە ناو "پۆیرتۆ دل سول". ئامادە کاری بەرگریی هەتا دەیەمی نۆڤەمبەر کرا بوو و فرانکۆ دەرفەتی لە کیس دا بوو. دوای کەمێك دوو دڵی برووسکەیەکم نارد بۆ نیوزکرونیکل:

"بۆچوونی بە هێز هەیە ئەگەری هێرشی شۆرشگێڕەکان بۆ مالاگا لە ئارا دا نەمابێ".

## چوارشەممە، سێی شوبات

هەندێ ئیشم کرد، سەردانێکی قایمقامم کرد، گەشتێکیشم بە نێو شاردا کرد. بە لای کەم نیوەی شار وێران بووە. "پۆمپێیەکی" راستەقینە. نیوەکەی تری شاریش لە باروودۆخێکی نالەبارتر دایە، دیارە ئەگەر نالە بارتر لەوەیش هەبێ. زۆرترینی دوکانەکان و فەرمانگە و بانك و شوێنەکانی تریش داخراون. دانیشتوانەکەی نێو کوچە و کۆڵانەکانیش بە شێوەیەکی دوور لە باوەڕی مرۆڤ، هەژار و تینێك شکاو و بێزار و برسین. خۆشحاڵم گەڕاومەتەوە هوتێلەکەم. گواستومانەتەوە "کالێتا پالاس" کە لە بەرامبەر هێرشە ئاسمانییەکاندا پارێزراوییەکی زیاتری هەیە. زیاتری میوانانی ئەم هوتێلە فرۆکەوانەکانن. دوێنێ دیدەوانی یەکێك لە فرۆکەوانەکانیان پێکا کە ژوورەکەی دەکەوێتە سەر ژوورەکەی من.

فرۆکەوانەکە تا بەیانی دەگریا و هاوڕێکانی بە درێژایی شەو بۆ دڵدانەوەی ئەو، هەر هاتوچۆیان دەکرد. ئەم ئێوارەیە لە بنکەی سەربازیی بیستم "کیپو دلیانو" هێرشێکی گەورەی

لە بەشی باکووری رۆژئاوا دەست پیّ کـردووە. لـە نیّـو بنکـەدا بیّجگـە لـە دەموچـاوە تیّـك چەرژاوەکان و فسکە فسکی گشتی و توورەیی و هەڵچـوون شـتیّکی تـر نـابینی و نابیسـتی. هەسـت دەکەم دوا دیمەنی تراژیدییاکە خەریکە دەست پیّ دەکات. چەند نەفام بووم دویّـنیّ ئـەو برووسکە پڕ لە گەشبینییەم نارد.

## پیّنجشەممە/چواری شوبات

پەلامار دەستی پیّ کرد. سەیر لەوەدایە پەلامار لە ناوچەی "ئاردالیّس- ئالبۆرگۆ" هات و سەیرتریش لەوەدایە کە پاشەکشەیان پیّ کرا. لەسەر گردۆلکەیەکدا سەیری شـەڕەکەم دەکـرد. کوشتاریّکی وەحشیانە. لەگەڵ "ئانتونیۆ پدرۆ خیمنس" سـەربازی هـەلاّتووی خـەڵکی "دوس هەمانۆس"، ناوچەیەکی نزیك "سیڤیل" قسـەم کرد. دەڵیّ لەویّ کارگەیەکی تازە دروستکراوی چەکسازی هەیە. ئیتاڵییەکان دروستیان کردووە و هەر ئـەوانیش بـەڕیّوەی دەبـەن. دەڵـیّ بـە دریّژایی شەو، بیست لۆری، سەربازانی پیادەی ئیتالیایی بۆ بەرەکانی شەڕ دەگوازیّتـەوە. دوای نیوەڕۆ سەریّکم لە "سەرپیتر"دا. ئەو بزنەی خوارد بوو، کە ناومان نـابوو ژوزفـین. جگـەرە و شقارتەی بەرەو تەواو بوونە. بۆ ئەوەی بەشی بیست رۆژی بکات خشتەی بۆ کیّشانی جگەرەکان داناوە. بەڵام هیّشتا چەند بوتڵیّك جن و ڤارمۆتی ئیتالیایی و شـەرابی سـپی ئیسـپانیایی لـە جۆرە باشەکەی مـاوە. مـن و "گ. گ" بەگـەدەی بەتاڵـەوە، چـاکمان خـواردەوە و کـەمیّك هاتینەوە سەر خۆمان. بیّ خواردنەوە، ئەم وەزعە بە ریّ ناکریّ. دەبیّ هاوسەنگییەك لە نیّـوان گوشاری رووداوەکانی دەرەوە و فشارە دەروونییەکـە دروسـت بکـەین. میّشـك بـە هۆشـیاری دەمیّنیّتەوە بەڵام واقیعی توندوتیژ، هیّوریی و ئاسوودەییەك دەبەخشیّ و مـرۆڤ هەنـدیّك لـەو واقیعەدا دادەبڕیّنیّ. ئیّوارەیەکی درەنگ سـەریّکم لە بنکە دا. پرسیاری باودۆخم لە سەرهەنگ ئالفریّدۆ کرد. گوتی: " خراپە. دوژمن هاوکات لە هەموو بەرەکان هیّرش دەکـات". پرسـیارم لیّی کرد شار تا کەی دەتوانیّ دریّژە بە خۆڕاگریی خۆی بدات. گوتی زۆر زۆر، سیّ رۆژ. ناتوانم هیچ پەیامیّك بیّ سانسۆر کردن بنیّرم.

"کاناریاس، بالیریس، ئەلمیرانتە سرورا" گەمییە جەنگییەکانی شۆرشگێڕەکان و سێ کەشتی دیکەی بچوکی جەنگی، بە درێژایی رۆژ، لە لێوارەکانەوە، باکوور و باشووری مالاگا بۆردومان دەکەن. ئەدی کەشتیی هەڵگری کۆماریخوازەکان لە کوێیە؟ نابیندرێ. شۆرشگێڕەکان دەریا و ئاسمانیان لە ژێر دەسەڵاتدایە. نە خۆراکێك، نە تەقەمەنییەك. سەرەتای دەرکەوتنی ترس و تۆقین لە شار. بیستم قایمقام "ل. ا" هەڵاتۆتە ڤالنسیا. دوا هێڵی برووسکەیش، لە نزیك موتریل پەکی کەوت. هەوڵ دەدەم لە رێی جەبەل تارق پەیامی رادیۆیی بنێرم. بەڵام نازانم پەیامەکانم دەگاتە لەندەن یان نا. کاتژمێر پێنجی ئێوارە، وەرگرتنی هەر هەواڵێك لە بەرەکانی شەڕ دەبێتە کارێکی مەحاڵ. من و "گ. گ" بڕیار دەدەین گەشتێك بە ئوتومبێل بکەین بە لێواری دەریادا تا ببینین لەوێ چ روودەدا. ئێمە تەنیا دوو پەیامنێرێکین لە مالاگا مابێتینەوە. هاوپیشەکانی ترمان دوێنێ ئێرەیان جێ هێشت. بێ هیچ کۆسپێك دەگەینە "توره مولینوس". لەوێ ئەفسەری فەرماندە پێمان دەڵێ کارێکی ئاقڵانە نییە لەوە زیاتر بچینە پێشێ. کەشتیە جەنگیەکانی "کیپو دلیانو" بە تەواوی لە "فوین گیرولا" لەنگەریان گرتووە و بەرەی ئێمەیان خستۆتە ژێر ئاگری تۆپەکانیانەوە. دەڵێ سەرگەرمی کەشتیە جەنگییەکان ئامانجگیری و پێکانی ئەو ئوتومبێلانەیە، کە لە جادەی لێوار هاتوچۆ دەکەن. دەمەو بەیان کاتێك عەریفێك و سێ پاسەوانی سەربازیی بە ئوتومبێلێکەوە تێپەڕ دەبوون، بوونە ئامانجی گوللە تۆپێکی یەکێك لەو کەشتییانە. بە ئاگەشگەییەوە ئاماژە بە قرێژی ژێر نینۆکەکانی دەکات و دەڵێ"شتێکیان لێ بە جێ نەما". "گ. گ"مان لە "تورەمولینوس" دانا و من و شوفێر هاژووتمان بۆ پێش. بە ناو "فوین گیرولا"دا تێدەپەڕین. رێك لەو بەری، پێچێك و کەنداوێك هەیە. لە ناو کەنداوەکەدا، کەشتیە جەنگیەکانی "بالتاراس"، ئالمیرانتە سرورا و سێ کەشتی بچووکی جەنگی، لەسەر هێڵێکی راست و جوان دامەزراون، مەودایان تا لێوار لە دوو کیلۆمەتر زیاتر نییەو، رێك وەك مەشقی نیزامیی دەریایی، پێکەوە تۆپەکانیان دەتەقێنن. تۆپخانەیەك نییە تا بەربەرچیان بداتەوە. رەشاشێك بە تووڕە بوونێکی نەزۆك، پاسەوانیی لە لێوار دەکات. ئوتومبێلەکەمان لە پەنای چەند بنچکە دارێك دەشارینەوە و پیادە بەرەو پێش دەچین. لەو لاتری پێچەکەی دواتر، کاروانێکی تەواو لە لۆرییە بار هەڵگرەکان، کە ئازووقە و تەقەمەنییان هەڵگرتووە ریزیان بەستووە. شوفێرەکان ئامادە نین بێنە پێشتر، "چونکە لە رادە بەدەر مەترسیدارە". بەرەی شەڕ، واتە، ئەو سەنگەرە لەرزۆکە لە بەرد دروستکراوانەی هەفتەی

پێش بینیمان، بیست و چوار کاتژمێر بێ هیچ زەخیرەیەك بووە. بە راستی بیرکردنەوە لەوەی "کیپو" بۆ بۆردومانکردنی ئاوها سەنگەر گەلێکی لەرزۆك، پێنج کەشتی جەنگی بێنێتە گۆرەپانی شەڕ، جێی پێکەنینە. دیارە هێزە بەرگریکاری لە شار، زۆر بە جدی وەرگرتووە. ئێستا جادە، راستەوخۆ، بە درێژایی لێوار راکشاوە. دوورتر لە دەریا، هەڵدێرێك هەیە و کۆمەڵێك جەنگاوەر لە پەنای دا خۆیان حەشارداوە. ئەو کۆمەڵە جەنگاوەرە لەوێن تا بەر لە ئەگەری هاتنە خوارەوەی شۆرشگێرەکان بگرن ئەگەر ویستیان بە شەو دزە بکەن. پێمان دەڵێن سەرمان بشارینەوە. ئەگەر لە نێو کەشتی دا، سەری کەسێك ببینن دەماندەنە بەر گوللە. کەشتییەکان رێك بەرامبەرمانن، لەسەر هێڵێکی کەوانەیی، لە هنداو ئێمەوە، "بەرەی شەڕیان"یان خستۆتە ژێر ئاگری تۆپباران کە نزیکەی دوو کیلۆمەتر دوورترە. لە فیلمە سینەماییەکان دەچێ. مرۆڤ وا دەزانێ سەیری ناو قورگی تۆپەکان دەکات. سەرەتا برووسکەی ئاگرەکە دەبینی، دواتر دووکەڵەکە، پاشان گوێت لە گرمەکە دەبێت. دواتریش ڤیززەی گوللە تۆپەکەو، دواتریش دەنگی زرمە و تەقینەوەکەت دەکەوێتە بەر گوێ. جوانترین مەشقی نیشان پێکانە. دوای دە خولەکێك، کەشتیەکان بە هێواشی بەرەو مالاگا پێشڕەوی دەکەن و لە لێوار نزیك دەبنەوە. گوللەکان لە نزیکتر دەکەون. لە مەودای ٥٠٠ یاردی، ٢٠٠ یاردی، پاشان ١٠٠ یاردی. دۆزەخێکی بە راستییە. جەستەی خۆمان بە زەوییەوە نووساندووە. یان بووینەتەوە وەك سفرەی ماسی. زاتی فسکە فسکێکیش ناکەین. وەك ئەوەی ترسی ئەوەمان هەبێ لە ناو کەشتیەکانیاندا گوێیان لە دەنگمان بێ. لە دەرئەنجامی دوا گوللە تۆپ، بارانێك لە بەرد و خۆڵ بە سەرماندا دەبارێ. پاشان ماوەی نێوان تۆپ هاویشتنەکانی زیاتر دەبێت و رێگای خۆیان دەگرن و دەڕۆن. لە "بەرەی شەڕ" هەموو شتێك کپ و بێدەنگە. ئیدی بەرەی شەڕی چی و حاڵی چی. لە راستیدا ئێستا دەبێ هێزی پیادەی شۆرشگێرەکان پێشڕەوی بکەن. بەڵام دنیا تاریك داهاتووە و ئیسپانییەکان حەز ناکەن لە تاریکیدا هێرش بەرن. لە وانەیە تا دەمەو بەیانی هیچ هێرشێك نەکەن. سەرەتای شەو، سەرهەنگ ئالفرێدۆ دێتە ئوتێلەکەم تا نانی ئێوارەم لەگەڵدا بخوات. دەڵێ "الغرناتە و ڤنتاس دیزڤاریا" شەڕەکەیان دۆڕاندووە و ئەمەش بە واتای کۆتاییە. "گ. گ" دەڵێ سبەی لێرە دەڕوا. کە وابێ من دوا "موهیکان" دەبم.

## شەممە/ شەشی شوبات

بە درێژایی دانە بەیانییەکە، چەند هێرشێکی ئاسمانی دەکرێت. لە پێنجشەممەوە تا ئێستا هیچ هەواڵێکم لە لەندەن نییە. بێگومانم لەوەی پەیامەکانم ناگات. چوومە بارەگای قایمقامی مەدەنی، دەمەویست بزانم دەتوانم سوود لە رادیۆ وەربگرم بۆ ناردنی "s.o.s" و بە دنیای رابگەیەنم، کە هێزە ئیتالیاییەکان تەمای داگیرکردنی مالاگایان هەیە؟ بەڵام لەو بارەگایەدا هەمووان وەك شێتیان لێ هاتووە. هەر بەو مەبەستە چوومە بنکەی فەرماندەیی، بەڵام "بیلیالبا" بزرە و فەرمانی داوە رێگە بە هیچ رۆژنامەیەك- هیچ رۆژنامەیەك منم- نەدرێ بێجگە لە هەواڵی دڵخۆشکەر، هیچ هەواڵێکی تر لە بارەی بارودۆخی سەربازی بنێرن. سوپا هەمیشە وا بیر دەکاتەوە ئەگەر ناوی سەرکەوتن لە شکستەکانیان بنێن، بە راستی سەرکەوتنەو، مردووەکان هەڵدەستنەوە و بە رێگای خۆیان دا دەڕۆن. بڕوایان بە کاریگەرییە سیحرییەکانی پروپا گندە درۆزنانەکانیان هەیە، رێك وەك بڕوا بوونی وەحشییە جەنگەڵییەکان بە وێرد و دوعای حەکیمە جادووگەرەکانیان. لەم کاتەدا "گ. گ" خۆی پێچاوەتەوە بڕوا. فەرمانبەرێك بە ئوتومبێلەکەی خۆی دەیگەیەنێتە ڤالنسیا. بە پەلە پرۆزێ هەر ئەوەندە فریا دەکەوم چەند وشەیەك لە سەر پارچە کاغەزێك بنووسم تا لە ڤالنسیا لە رێگەی تەلەفۆنەوە بینێرێ بۆ سەرنووسەری بەشی دەرەوەی نیوز کرونیکل: "مالاگا دۆڕاندی. - ك — هێشتا لەوێیە. هەوڵ بدەن پۆستی وەکیلی کونسوڵی فەخری بۆ "سەرپیتر چامرز" دەستەبەر بکەن بەڵکو ئەو بتوانێ سنوورێك بۆ ئەو کوشتارە دابنێ".

دەوروبەری کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ دەرچوونی بە کۆمەڵ لە مالاگا دەست پێ دەکات. جادەی ڤالنسیا لە نێو لافاوی کاروانی لۆری و ئوتومبێلی بچوك و هێستر و عەرەبانە و ئاپۆڕای جەماوەری ترس داگرتووی تۆقیو و شەڕانگێز دا خنکاوە. ئەم لافاوە هەموو شتێك لەگەڵ خۆی دا رادەماڵێ: خەڵکی سڤیل، جەنگاوەرە هەڵاتووەکان، ئەفسەرە راکردووەکان، قایمقامی مەدەنی و هەندێك لە سەربازانی بنکە. هەر وا، هێزی خۆڕاگری و بڕوا و ورە لە نێو شادەمارەکانی مالاگادا هەڵدەلۆشێ. هیچ شتێك لە بەرامبەر ئەم لافاوەدا توانای بەرگریکردنی نییە. ئەو جادەیەی بەرەو رۆژهەڵات دەڕوا بۆتە یەکساید. ئیدی شتێك لە پایتەختەوە نایێ. نە چەك و تەقەمەنی، نە خۆراك، نە رێکخراوێك و نە رزگارکەرێك- هەر چەندە ئێستاش زۆر درەنگە.

کەس نازانێ چارەنووسی ئەو شەپۆلە لافاوە، کاتێك لەو دیوی پێچی یەکەمی جادەی رۆژهەڵات لە بەر چاوان ون دەبێ چی بەسەری دێ. پروپاگندەی سەیر و سەمەرە کەوتۆتە سەر

زاران: شۆرشگێرەکان هەر ئێستا "ڤێلز" شاری دواتری رۆژهەلاتیان، کە چل و پێنج کیلۆمەتر لێرەوە دوورە داگیر کردووە و لافاوی ئەو خەلکە هەلاتووە راستەوخۆ دەکەونە ناو داوی مەرگەوە. بە پێی پڕوپاگندەیەکی تر، جادە هێشتا کراوەیە بەلام کەوتۆتە ژێر رەحمەتی تۆپبارانی کەشتیە جەنگیەکان و ئەو فڕۆکانەی بە رەشاشەکانیانەوە هەلاتووەکان دەپێکن. بەلام هیچ هێزێك ناتوانێ بەر لەو لافاوە بگرێ. لافاو هێشتا شەپۆل دەدا و بەردەوام تینوێتی خۆی لە سەرچاوەی ترس و دلەڕاوکێ دەڕەوێنێتەوە. کاتژمێر چواری ئێوارە بڕیار دەدەم سەرێك لە "ڤێلز" بدەم و بزانم لەوێ چی روودەدا. شوفێرەکەم هەر چەندە سەردەمێك جەنگاوەر بووە بەلام ترس کەوتۆتە دلێەوە. هەول دەدا رازیم بکات لە ڤێلزەوە یەکراست باژۆین بۆ ڤالنسیا و چیدی نەگەڕێینەوە ئێرە. بۆ هێور کردنەوەی ئەو، دەلێم باشە، هەر کاتێ گەیشتینە ڤێلز بڕیارێك دەدەم. کاتێ ئوتومبێل بەڕێ کەوت بینیم هەموو جانتاکانمان لە نێو ئوتومبێل بەسەریەکدا ریزکراوە، لە حالەتێکدا کە من فەرمانێکی وام نەدابوو. خۆمان رادەستی قەدەر دەکەین تا دەگەینە سەر چەند ڕێچکەیەك کە لە لێوار بەرەو باکوور دابەش دەبێ. شاری ڤێلز چەند کیلۆمەترێك لە دەریاوە دوورە. جادەی هێشتا کراوەیە، دەگەینە ناو ڤێلز. ڤێلز جەنجال و قەلەبالغ و کەس بە کەسە. جەنگاوەرانی سوپای تەفروتونا کراو، لە سەر شۆستەکان و دەروازەکان و ژێر مێزە مەڕمەڕیەکانی چایخانەکان پال کەوتوون و نوستوون. شێوەی سەربازییان بە تەواوی لە دەست داوە. — جل وبەرگی بەریان وەك بوخچەی چلکن و پیس، لێ هاتووە کە هەندێ بێچارە- و بەستەزمانی لەرزۆکی لە نێودا ئاخنرابێ- . ئەوانەیش کە نەخەوتوون بەرەلالای ناو شەقام و شۆستەکان بوونە، جگەرە دەپێچنەوە و چاوەڕێی گەیشتنی جەللادەکان دەکەن. ئەو مرۆڤانە ئیدی مەرگ چاوەڕییان دەکات. هەولیان داوە بە بەرد هاوێشتن رێگا لە پێشرەوی تانکەکان بگرن. راوە رێوی دەستی پێ کردووە- رێویە مرۆییەکان و راوچیە مەکینەییەکان. ئەوانەی بە زیندوویی کەوتنە بەر دەست چەقۆیان کێشا و کاتێ دەستیان بەسترا قەپالیان گرت. ئوتومبێلەکەمان دەست بە جێ لە لایەن جەنگاوەرە ئانارشیستەکانەوە ئابلۆقە دەدرێ.

"ئەو ئوتومبێلەمان پێویستە".

_بۆ چی ؟

_بۆ دانانەوەی دینامیت لە سەر ئەو پردەی دەکەوێتە سەر رێی ڤنتاس.

_بەلام بە منیان گوتووە پردەکە تەقێندراوەتەوە.

_بێ دەنگ بە، وەرە خوارێ.

دوای هەندێك مشت و مڕ، بەرپرسی دەستەی ئانارشیستەکان رازی دەکەم کە لەگەڵمدا بێتە بنکەی فەرماندەیی سەربازی. بنکە چۆڵ و هۆڵە و تەنیا پاسەوانە مەدەنییەکان لە حەوشە دا مێش لە خۆیان دەکەنەوە.

_فەرماندە لە کوێیە؟

_ئەگەر دەتەوێ فەرماندە ببینی دەبێ داواکارییەك بنووسی

_شێت بوویتە؟ شۆرشگێڕەکان تەنیا پێنج کیلۆمەتر لە شارەوە دوورن.

_ گاڵتە دەکەی. شۆرشگێڕەکان حەفتا و پێنج کیلۆمەتر لێرەوە دوورن بەرەو باکوور، ئەولای ڤنتاس.

_گوێت لە دەنگی ڕەشاشەکانیان نییە؟ شۆرشگێڕەکانن.

دواجار، کە پیاوەکە دەزانێ بە راستمە جوولەیەکی سەیر دەکات: سەری بە توندی لە نێو هەر دوو دەستی دا دەگرێ و دەچێتە دەرێ و ون دەبێ. نازانم بۆ، ئانارشیستەکەیش بە دوای دا ڕا دەکات و بزر دەبێ. سەرو سۆراخی فەرماندە لە هەمووان دەپرسم. نە کەس دەزانێ و نە کەسیش بایەخ دەدا. دواجار لە نێو چێشتخانەیەك وەگیری دەخەم- وەك سەگ، ماندوو دیارە و پێ دەچێ دوو رۆژ بێ نەخەوتبێ. هەروا کە بە وردی پرتەقاڵێك سپی دەکات، بە هێمنی گوێ رادەدێرێ بە ئاخاوتنەکانی ئەو سێ جەنگاوەرەی وەکو شێت جووڵە بە سەر و دەستیان دەکەن و قسە دەکەن.

_ئەگەر بە راست پەیامنێریت، سەیری دەوروبەرت بکە و پێویست ناکا هیچ شتێك بپرسی.

_دەنگو باسی پردی ڤنتاس چیە؟

_سعاتێك بەر لە ئێستا تەقاندمانەوە.

_دروستکردنی پردێکی کاتی چەندی پێ دەچی؟

_دوانزەسعات.

_دوایی؟

وەڵامێك ناداتەوە. فەرماندە شانەکانی هەڵدەتەکێنێ و بە وردی دەکەوێتە پاکەکردنی پرتەقاڵێکی تر. ئەو جا پرسی: "دەگەڕێیتەوە مالاگا"؟ شوفێرەکەم گوتی"نا، دەچینە ڤالنسیا". من گوتم "نا، دەگەڕێینەوە مالاگا".

_كه وا بیٚ تكایه یاریدەرەكەی منیش لەگەڵ خۆتان ببەن بۆ مالاگا. من ئوتومبێلم نییـه، بەڵكو ئەو بتوانیٚ هەندیٚ چەك و تەقەمەنیمان بۆ دەستەبەر بكات.

_لە مالاگا هیچ چەك و تەقەمەنییەك نییە.

_دەزانم، بەڵام...

بە پەلە لەویٚ دوور دەكەوینـەوە. شـۆفێرەكەم دەمارەكـانی جـووت بـووە. پرتـە و بۆڵـەی ئەوەیەتی، كە كاتیٚ لەگەڵ فەرماندە قسەمان دەكرد یـەكێك جگـەرەكانی لـە نـاو ئوتومبێـل دزیوە. كۆمیساری یاریدەدەری فەرماندە پێی دەڵیٚ لەم كات و ساتەدا شـتێكی باشـترت نییـە خەفەتی بۆ بخۆیت. بە تووڕەییەوە وڵام دەداتەوە"نە". درزێك لە نـاو جەنجاڵیـدا دەكەینـەوە و دەكەوینە رێی بەرە و مالاگا. بە درێژایی رێگای گەڕانـەوەمان، كۆمیسـار بـە گەشـبینییەوە بەردەوام دووبارەی دەكردەوە: ڤێلز خۆراگری دەكـات، مالاگـا خـۆراگری دەكـات، جـەنگاوەرە ئازاكانمان بستێك بەرەو دواوە ناكشێنەوە. تەمەنی بیست و پێنج ساڵە و لە هـەژدە سـاڵییەوە ئەندامی گەنجانی سۆسیالیست بووە. بە باشی ئاگاداری بارودۆخەكەیە و دەشزانیٚ كـە منـیش ئاگاداری بارودۆخەكەم و سبەی هەموو دنیا ئاگاداری بارودۆخەكە دەبیٚ تەنانـەت ئەگـەر مـن وشەیەكیش نەنێرم. بەڵام مێشكی، كە پڕ بووە لە پڕو پاگندە، هەموو راستییەك لە خۆی دوور دەخاتەوە. لەگەڵ گەیشتنمان بۆ مالاگا و راوەستانمان لە پێش بارەگای فەرماندەیی، شوفێرەكەم بە بڕیارێكی یەكلاكەرەوەوە رایدەگەیەنیٚ چیتر ئامادە نییە بمێنێتەوە. لە راستیدا، من نە مافی ئەوەم هەیە و نە توانای ئەوەی رایبگرم. تەنیا داوای لیٚ دەكەم جانتاكانم لە ئوتێل بگەیەنێتـە ماڵی سەرپیترچامبرز، چونكە پیٚ دەچیٚ ئەو كاتەخراپـەی چـاوەڕێمان دەكـرد هـاتبیٚ. بیسـت خولەك دواتر، شوفێر و ئوتومبێل لە جادەی ڤالنسیا لە بەر چاوم ون دەبن و لەگەڵ ئەوانیشـدا دوا شانسم لە دەر چوون لێرە لە كیس دەدەم. دەمەو ئێوارەیە. هەست دەكەم زۆر تـەنیا و بـیٚ كەسم و لەسەر پێپلیكانەكانی بنكەی فەرماندەیی دادەنیشم. سەرهەنگ ئالفرێدۆ دەمبـینیٚ و دیٚ لـە پـاڵم دادەنیشـیٚ. پـاش كـەمێك دەڵـیٚ "پـیٚ دەچـیٚ دوا شـەومان بـیٚ، دوای چـەند كاتژمێرێكی تر رێگا دەگیریٚ و ئەوانیش، وەكو مشكێك كەوتبێتە ناو تەڵەوە دەمانكوژن".

_ئەگەر بێن چ دەكەی؟

دەستێك بـە سـەر دەمانچـەكەیدا دێـنیٚ:_ هێشـتا پێـنج فیشـەكم مـاوە. چواریان بـۆ فاشیستەكان و پێنجەمیەكەی بۆ خۆم.

دلگرانم لەوەی هەست دەکەم سەرهەنگ رۆڵ دەبینێ و هەروەها لەوەی ئالفرێدۆ، فەرماندەی ڤێنز، ئانارشیستەکان، پاسەوانە مەدەنییەکان و ئەوانی دیکەش، لە وانە خۆیشم، کۆمەڵە منداڵێکین رۆلی پاڵەوانانی "ڤۆلتێر اسکات" گەمە دەکەین و لەوێنا کردنی واقیعیانەی تاڵی مەرگ بێ تواناین. دنیا بە تەواوی تاریك داهاتووە. گرمەی تۆپ و رێژنەی رەشاشەکان لە پشت گردۆلکەکەوە دەبیسترێ. ئالفرێدۆ دەمباتە کابینەی ئەفسەرەکان. دوو بوتڵ کۆنیاك و هەندێ نانی وشك دەخەمە گیرفانمەوە. پاشان بە نێو شارێکی خنکاو لە نێو تاریکیدا، بەرەو ماڵی سرپیتر، کە ئالایەکی نەتەوەیی ئینگلیز لە سەر بانە سپیەکەیدا دەشەکێتەوە، شۆر دەبمەوە.

## یەك شەممە/حەفتی شوبات

کاتژمێر هەشتی بەیانی، پەلامارێکی ئاسمانی لە جیاتی خواردنی بەیانیمان. ئێستا گرمە و زرمەی تۆپباران و رەشاشەکان بە بەردەوامی دەبیسترێ. پاش کورتە ماوەیەك پەلامارێکی تر. یەکێك لە فرۆکەکان، فرۆکەیەکی سپی و تاك مەکینە تا بەرزایی سەد پێ بەسەر بانی ماڵدا نزم دەبێتەوە و رێژنە گوللەیەك بەر دەداتەوە. "لولا"ی خزمەتکاری سەرپیتر، وەزعی تێك دەچێ. بە سەر گردۆلکەکەی بەرامبەرماندا هەڵدەکشێین تا دەوروبەرمان باشتر ببینین. دەنگی بۆمبارانمان باشتر گوێ لێ دەبێ. لێرە و لەوێ دەتوانین ستوونی دووکەڵەکان ببینین. بەڵام مەحاڵە بتوانین وێنەیەکی رۆشن لە بارودۆخە ستراتیژییەکە ببینین. لە کاتی گەڕانەوەماندا، بینیمان دووکەڵێکی چڕ لە پەنجەرەکانی ماڵە دراوسێکەمان هەڵدەکشێ. خانووەکە، کە دەکەوێتە نێوەراستی حەوشەیەکی پان و بەرین، هی ئیسپانییەکی دەوڵەمەندە، کە دوا بە دوای هەڵگیرسانی شەڕی نێو خۆیی، بە یارمەتیدانی سەرپیتر هەڵاتە دەرەوەی وڵات. ئێستا وەك نەخۆشخانەیەکی کاتی سوودی لێ وەردەگیرێ. پاش ماوەیەك چڕیی دووکەڵەکە کەمتر دەبێتەوە و دواتر هەر نامێنێ. ئاشکرایە خانووەکە لە دەرەنجامی بۆمباران ئاگری تێ بەر نەبووە، بگرە بە رووداوێکی چاوەڕوان نەکراو دا ئاگری تێ بەردراوە... بیر کردن لەوەی تا ئێستاش شتی وا بکرێ... دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ — ئەگەر ناوی بنێین خواردن- چوومە ناو شار. سیمای شار لە دوێنێوە گۆڕانی بە سەر دا هاتووە. ئیدی شەمەندەفەرێك لە ئارادا نییە، هەموو دوکانەکان داخراون، لە هەر گۆشە و کەنارێکدا چەند کەسێك کۆ بوونەتەوە و ترس شاری لە ناو تەونە خۆڵە مێشییەکانی خۆی دا تەنیوەتەوە. هەتاو دەدرەوشێتەوە، ئاسمان شینێکی جوانە، بەڵام باڵە کراوەکانی مەرگ شاری خستۆتە باوەشیەوە. رێك لەو کاتەدا کە لە "کالیتا"

تێدەپەڕم، کاروانێکی پێکهاتوو لە شەش فڕۆکەی شۆڕشگێڕەکان، لە بەرزاییەکی زۆر کەمدا، بەسەر سەرمانەوە دەفڕن و تۆوی مەرگ دەپاشن. لەو دیوی پردەکە بە دوای پەناگەیەکدا دەگەڕێم. جەنگاوەرەکان کۆنیاک دەخۆنەوە، یەکێك سروودی "نێو نەتەوە" دەخوێنێ و ئەوی تر بە دەنگێکی کز و زەردەخەنەیەکی گەمژانە سروودی "فالانژیستەکان" دەچڕێ. هەست دەکەم پەتای ترس منیش دەگرێتەوە.دەگەمە بنکەی فەرماندەیی. لە شێوەی پەناگەی شەوانە. ئەو مرۆڤانەی هیچ بە مرۆڤ ناچن لەسەر مێزە و عەردی ژوورەکان نوستبوون. کاتێك کە چاوەڕوانی بینینی سەرهەنگ بیلیالبام، عەریفێك کە هەناسە بڕکێی گرتووە و هاوسەنگی خۆی لە دەست داوە بە ژووریَ دەکەویَ و راستەوخۆ بەرەو لای سەرهەنگ رێنمایی دەکرێت. منیش لەگەلّ ئەو دا خۆم دەکەم بە ژووردا.

بیلیالبا دەپرسیَ "دەنگو باس چیە"؟

_لە جادەی کولمینارەوە بە پانزە تانك بەرەو ئێرە دێن.

_لە چ مەودایەکن؟

_کاتژمێرێك بەر لە ئێستا لە دووری هەشت کیلۆمەتر بوون.

_بەرپەرچ ؟

_نییە. نەفەرەکانمان تفەنگەکانیان فڕیَ داو بەرەو کێوەکان هەلاّتن.

_سوپاس.

عەریف کت و پڕ دەکەوێتە ژێر مێزەکە و دەست بە جیَ خەوی لیَ دەکەویَ. بیلیالیا فسکە فسکێك لەگەلّ هەندیَ لە ئەفسەرەکانی بنکەکەی دەکات. فەرمانێك دەدرێتە یەکێك لە سەربازەکان و بە پەلە لە ژووریَ دەچنە دەریَ.

پێش بیلیالیام گرت. بە توڕەییەوە دەلّیَ "چیت دەویَ؟ نابینی بە پەلەم؟ تەنیا دەتوانم ئەوەندە بلّێم: بارودۆخ دژوارە بەلاّم مالاگا ئازایانە شەڕ دەکات"

لێی دەپرسم " بۆ کویَ دەچیت؟" بەلاّم ئەو رۆیشتووە.

بەرەو لای پەنجەرەیەك ڕا دەکەم و، سەیری خوارەوە دەکەم. بیلیالیا و ئەفسەرەکانی بنکەکەی دەبینم سواری ئوتومبێلێك دەبن. هەموویان شپرزە دیارن. ئوتومبێل بەڕیَ دەکەویَ. لەو ئەفسەرەی دەیناسم دەپرسم"سەرهەنگ بۆ کویَ دەچیَ"؟

سەرهەنگ بە هێواشی ولاّم دەداتەوە"تێی قوچاند"

ئەفسەرێکی تر دەڵێ"دەبوایە بڕوا. پەیوەندیمان تا سعاتێکی تر دەپچڕێ و ئەویش فەرماندەی سەرانسەری بەشی باشوورە، کە وا بێ، دەبوایە بڕوا"

"ئەگەر پەیوەندیمان بپچڕێ چۆن دەتوانێ فەرماندەیی بکات"؟

ئەفسەری یەکەمەکە دووپات دەکاتەوە"تێی قوچاند"

دەپرسم "ئێستا کێ گەورەیە"؟

"گەورە"؟ هەمووان سەریان سوڕماوە. کەس نازانێ.

دەچمە ژوورێکی تر. سەرهەنگ ئالفرێدۆ لە پشت ئامێری تایپ دانیشتووە. هەموو شتێك لە خەونێکی بێ سەروبەر دەچێ. سەرنجم دا سوود لە شریتە سوورەکە وەردەگرێ بۆ تایپ. ئاوهام خوێندەوە:

"شایانی سەرنج. بەم شێوەیە رایدەگەیەنین سەرهەنگ ئالفرێدۆ ج. بە مەبەستی کارێکی گرنگی پێ سپێردراو دەچێتە ڤالنسیا. داوا لە بەرپرسان دەکەین رێگای پەڕینەوە بە ناوبراو بدەن"

لێی دەپرسم: "تۆیش ئالفرێدۆ"؟

سوور هەڵدەگەڕێ: "تویش. تۆش لەگەڵ خۆمدا بە ئوتومبێلەکەم دەبەم. هەموو شتێ کۆتایی پێ هات"

ئیدی ڤۆلتێر سکاتێك لە ئارادا نییە. هەست دەکەم مێروولەکانی ترس بە سەر پێستم دا هەڵدەچن. "ئیکس"ی هاوڕێی هاوبەشمان دەبینم لە حەوشەدا. ناساغە. تایەکی گەرمی لێیە. دەکۆکێ. تف هەڵداوێ.

ئالفرێدۆ دەڵێ "وەرە، هەموو شتێك تەواو بوو"

ئیکس دەڵێ "ون بە، من دەمێنمەوە"

ئالفرێدۆ بە چاوی فرمێسکاوییەوە پێی دەڵێ "بیلیالیاش رۆیشتووە. ئێمە بە زۆر دەتبەین"

ئیکس دەڵێ "ون بە". "ئەو مردووە. هەشتا لە سەدی ئەو کەسانەی ناویان لەم کتێبەدا هاتووە، مردوون".

سواری ئوتومبێلی ئالفرێدۆ دەبین، دایك و خوشك و چەند ژنێکی تریش لە ناو ئوتومبێلەکەی ئالفرێدۆن. هەموویان دەگریێن. کاتێك ئوتومبێل بە رێ دەکەوێ سەرپێترم دێتەوە یاد. لەم ساتانەی دواییدا بە تەواوەتی لە بیریم کرد بوو. دەڵێمە ئالفرێدۆ "دەبێ هاوڕێ ئینگلیزەکەشم لەگەڵ خۆماندا ببەین"؟

شوفێر دەڵێ"مەحاڵە. فاشیستەکان لە "نیورودن". رێگای ماڵیان گیراوە".

_بەڵام من سعاتێك بەر لە ئێستا لەو جیا بوومەوە

_لەو سا تا ئێستا فاشیستەکان هاتوونەتە ناو شار. گوێت لە دەنگی رەشاشەکان نییە؟

دوو دڵم. دەگەینە دەروازەی شار. حەشیمەتی هەڵاتوو، بە چاوی ئێرەیی و رقەوە سەیری ئێمەی بەختەوەر دەکەن کە ئوتومبێلمان پێیە.

هەست بە پەستی و بێزارییەکی زۆر دەکەم. ئەعسابم بە تەواوی وێران بووە. بە شوفێرەکە دەڵێم _راوەستە، دەمەوێ بگەڕێمەوە

ئالفرێدۆ دەڵێ "راگرە"

خۆم لە ئوتومبێل فڕێ دەدەمە خوارێ. ئالفرێدۆ شێتانە سەرو دەست با دەدا. ئوتومبێل لە ناو حەشاماتی خەڵکدا لە بەر چاو ون دەبێ.

دیسان ئێوارەیە. هێواش بەرەو ماڵی سرپیتر بەرێ دەکەوم.

شۆرشگێڕەکان هێشتا نەگەیشتوونەتە ئێرە.

تا رۆژی دواتریش، نەهاتن.

# ٣

دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دووشەممە هاتن. بەڵام جاریٚ یەك شەممەیە. هێشتا دەرفەت بۆ هەڵاتن هەیە. دنیا تاریك و ڕوونە و سێبەرە خەمبار و خاو و خلیچەکانی شەوی ئەندەلوس بە خێرایی نزیك دەبنەوە. نە گلۆپێکی داگیرساو، نە شەمەندەفەرێك و نە پۆلیسێك لە سەر شەقام. هیچ شتێك نییە بێجگە لە تاریکی و، دوا هەناسەکانی مەرگی شارێکی لەسەر لێواری خنکان: دەنگی تەقە و هات و هاواری سەرخۆشێك و شیوەنێك لە شوێنێکی نادیاری شەقام.

جەنگاوەرەکان لە نێو شەقامەکاندا، شێتانە و بیٚ هیچ ئامانجێك ڕاکە ڕاکەیانە. ژنان بە عەبا ڕەشەکانیان، دەڵێی کرمەکانی شەون لە بەر سێبەری خانووەکاندا فڕکان فڕکانیانە. لێرە و لەویٚ دەنگی شکانی شووشە و جامی ئوتومبێل دەکەوێتە بەر گویٚ. ڕەنگە هەر نیو سەعاتێك بەر لە ئێستا بوو خۆم لە ئوتومبێلی ئالفرێدۆ فڕیٚ دایە خواریٚ و دەستم کرد بە شەقام پێوان. ئیدی سەرەداوی بەڕێوە بردنی شار بە دەست کەسەوە نەماوە و هیچ بەرپرسێك و هیچ جۆرە خزمەتگوزارییەکی گشتی لە شار نەماوە، دەمارەکانی شار و ڕەگ و ریشە و ماسوولکەکانی، هەمووی وا خەریکە لە بەریەك هەڵدەوەشێتەوە و ئۆرگانیزمێکی پێشکەوتوو گۆڕاوە بە تەنێکی بیٚ شێوە و نەرم و شل و داڕووخاو. جیاوازی لە نێوان گیان سپاردنی بنیادەمێك و شارێك لە چی دایە؟ مەرگ، ڕووداوێکی سرووشتی بایۆلۆژییە، بەڵام لێرە، تان و پۆی سەرجەمی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و ژێرخانی خودی شارستانییەتیش وا لە بەریەك دەترازیٚ. باجدەر دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی ئەشکەوتنشینی و لە نێو چاوە نزیکبینەکانی، لەو دیو

چاویلکه دەستە شاخییەکەی، ترسێکی سەردەمانی کۆن و سەرەتایی نیشتووە. لەم شەوی بەکشەمەیەدا، حەوتی فێبرایەری ١٩٣٧، شەوی "سن بارتۆلمیۆ"یەکی نوێ بە روونی دەبیندرێ. سوپایەك لە هێرشبەرانی دەرەکی لەو دیوی گردۆلکەکەوە خۆیان مۆڵ داوە تا سەر لە نوێ هێزەکانیان ڕێك بخەنەوە و سبەی، هێرش بکەن و ئەم شەقامانە بکەنە رووباری خوێنی ئەو خەڵکەی لە زمانیشیان ناگەن و هیچ شەڕێك و دوژمنایەتیەکیان لەگەڵ، ئەواندا نییە. ئەو خەڵکەی کە تا دوێنێ بەو ئەندازەیە لە هەبوونیان بێ ئاگا بوون کە سبەی لە بەرامبەر مەرگ و کوشتنیاندا خەمسار دەبن. ڕەنگە هێشتا دەرفەتێك بۆ هەڵاتن هەبێ. ماڵی سرپیتر لە سەر گردێکە و بە دووری کیلۆمەترێك دەکەوێتە دەرەوەی شار. بە نێو کێڵگە تاریکەکاندا دەڕۆم و خۆم لە بەرامبەر دەرگای باخی بینایەکی گەورەی لە شێوەی ڤیللادا دەبینمەوە. وا بزانم ئەو نەخۆشخانەیەیە کە ئەمڕۆ بەیانی، لە کاتێکدا ئاگری تێبەر ببوو و دەسووتا بینیمان. ئێستا تاریك و چۆڵە، دەڵێی قەڵایەکی سیحر لێکراوە. بۆ ماوەیەکی درێژ دەرگای خانووە بچووکەکەی دەرگەوانەکە دەکوتم. پاش ماوەیەك سەرو سیمای دەرگاوانەکە پەیدا بوو. دەمانچەیەکی لە دەست بوو. دەستەکانی بە دەمانچەکەوە و هەموو گیانی دەلەرزێ.

_ئێرە نەخۆشخانەیە؟

_هیچ نەخۆشخانەیەك لێرە نییە، ماڵی سنیۆر بولینە

بولین، ناوێکی ئاشنایە بە گوێچکەمەوە، ئاشنا بەڵام بێزراو. بولین، بەرپرسی بڵاوکراوەکانی شۆڕشگێڕەکانە لە سیڤیل. ناوێکە لە ئیسپانیا هیچ ڕەواجێکی نییە. ئەو وێکچوونی ناوە، ئەگەر تەنیا وێکچوون بێت، دڵە خورپێم زیاتر دەکات. لە دەرگاوانەکەم پرسی، ماڵی "دون پێدرۆ" لە کوێیە؟ بە دەمانچەکەی دەستی ئاماژە بۆ لای چەپ دەکات. "لەوێ، ئەو ماڵەی تەنیشتمان".

_بەڵام ئەگەر ئەو ماڵەی تەنیشتمان بێ، کە واتە ئێرە دەبێ نەخۆشخانە بێ.

_نەخۆشخانە نییە. نەخۆشخانە بوو، بەڵام لە سبەی را جارێکی تر دەبێتەوە ماڵی سنیور بولین.

ئاوها. پیاوەکە ئیدی نالەرزێ و پێوەی دیارە هەست بە باڵا دەستبوونی خۆی بە سەر مندا دەکات. دەرگام بە ڕوودا پێکدادەدا، بەڵام لە کاتێکدا هێشتا، بێ هیچ بڕیاردانێك لەوێ وەستا بووم، ژنی دەرگاوانەکە دێتە دەرێ و مۆمێکی داگیرساوی بە دەستەوەیە و لە ناوەڕاستی کێڵگەکەوە بەرەو باخی سرپیتر ڕێنماییم دەکات. ئەم ڕەفتارەی، یان سەرچاوەی لە سۆزێکی

ئاسایی مرۆڤایەتییەوە هەبوو یان، ئەو ژن و مێردە هێشتا لەوە دڵنیا نین ئـەم شـەوە ئاوسـاوە چـی بەیانییـەکی بـەدوا دێـت. لـە ئاوهـا بارودۆخێکـدا گـێلترین کەسـەکانیش دەبـن بـە سیاسەتمەدار.

سرپیتر لە بەر رۆشنایی چرا نەوتیەکەی، لە پشت مێزی نووسینیدا دانیشتووە. پێوەی دیارە هەمبەر بە رووداوەکانی دەرێ خەمسارده- وێنەیەکی تەواو لە هێوریی سەردەمی ڤیکتۆریا لە کات و ساتی لافاوی کارەساتەکاندا.

کەمێك هەست بەوە دەکەم بوومەتە حەزرەتی ئەیوب. بێجگە لەوەش، هەست بـە ئـازاری ویژدان دەکەم، چونکە بۆ خواردنی ئێوارە، درەنگ هاتوومە و جل و بەرگیشم چڵکنن. کاتێ بە رێگاوە بووم بۆ ئێرە بۆ خۆشاردنەوە لـە پـەلامارێکی ئاسمـانیی لـە نێـو شـەقاری زەوییـەکی کێڵگدراو درێژ بووم.

بە رێ و رەسمێکی تەواو، لە ژێر رۆشنایی مۆم، مـاسی کەباب کراومان دەخۆین و شـەرابی سپی و نابی ئیسپانیایی سرپیتر دەخۆینەوە. "لولا" کە سرووشتێکی گاڵتەجاڕیی هەیـە چـوار مـاسی ئێسقان نەرمی لە نێو سینییەکی زیویی رازاندۆتەوە و دێـنێ. وا دیـارە ئـەویش رۆڵـی "دوا رۆژەکانی پەمپی" دەگێڕێ بـەڵام چـاوەکانی سـوور هەڵگـەڕاون. دیسـان سـەبارەت بـە داهاتوومان قسە دەکەین، کە زۆر رۆشن و باش دیار نییە. سرپیتر دوو نامـەی لـە رۆژنامـەی تایمز بڵاو کرد بۆوە و تێیاندا هێرشی کرد بووە سەر ئاژاوەچیەکان. هەروەها لە قازانجی دەوڵەتی ئیسپانیا، لە چەند ریکلامێکی ئاشکرا دا لە بەریتانیا بەشداری کردبوو. لایەنگیریی ئـەو بـۆ "سوورەکان" بەلای هەموو کەسێکەوە ئاشکرا بوو. بەڵام لە بارەی خۆمەوە، هەندێ رووداو لە سیڤیل کە دواتر ئاماژەیان پێ دەکەم، بەرپرسەکانی ئاژاوەچیانی تـا ئـەوێ ورووژانـدبوو، کـە حوکمی دەسگیر کردنم بۆ دەربکەن و لە بەر ئەو کتێبەی بەم دواییە دا لە پاریس چاپم کرد بوو، بێ هیچ گومانێك نەدەبوا چاوەروانی ئەوە بم ژەنەراڵ "فرانکۆ کیپۆ دلیـانو" دەستخۆشـیم لـێ بکات. لە بەرامبەر ئەو تۆمارە تاوانەمـدا تـەنیا کـارتێکی بـراوەم هـەبوو: ئـاڵای نەتـەوەی بەریتانیا بە سـەر داری ئاڵاکەمانەوە. بەڵام لەم بارودۆخە واقعییەدا، پێ نەدەچوو ئەو ئاڵایـەش کارتێکی ئەو هەندە براوە بێ. لێوارەکانی لە ژێر باو بـاران دا هـەمووی دڕا بـوو و بـێ نـاز و هەندێکیش بێ دەسەڵات و هەیبەت لە بەرامبەر باو باراندا شۆڕ ببۆوە. سرپیتر گوتی: "بزانە، من هەڵنایێم. دوو سـەد هەزار کەس لە مالاگا هەیە، سـەی کاتێ ئاژاوەچیـەکان بـێن رەنگـە پەنجا هەزار کەس گوللەباران بکەن. سەرجەم کونسـوڵەکان رۆیشـتوون و دنیـاش ئەوەنـدە لـە

خەمی مالاگادا نییە، کە واتە دەستیان کراوەیە هەر چییەکی بکەن. بەڵام ئەگەر بزانن بە حیساب "چاودێرێکی بێ لایەن" واتە من، لێرەمە، ڕەنگە تەنیا چل هەزار کەس گوللەباران بکەن. تەنانەت ئەگەر مانەوەم هیچ کاریگەریشی نەبێ دیسانیش دەمەوێ لێرە بمێنمەوە و، ئەگەر زیندوو مامەوە، بە دنیا بڵێم چی لە مالاگا ڕووی دا. هیچ کاتێ تا ئێستا، نە لە "باداخوز" و نە لە "تولەدو" هیچ بیانییەك نەیبینیوە کە ئاژاوەچییەکان کاتێك دێنە ناو شارێك و داگیری دەکەن چی دەکەن. پێم وابێ ئەگەر تەنیا بۆ ئەم مەبەستەش بێ، مانەوەم بێ سوود نییە".

دواتر هەوڵی دا هانم بدات بە جێی بێڵم، دەیویست بۆم بسەلمێنێ کە گیانی من زیاتر لەو، لە مەترسیدایە. من دەکۆشام تێی بگەیەنم مەحاڵە بە تەنیای جێی بێڵم- ئاخر ئەو تەمەنی هەفتاو دوو ساڵ بوو و من تەنیا سی و دوو ساڵ تەمەنم بوو- سەرەڕای دژواربوونی بارودۆخەکە، ئەو پاساوەی من زۆر بە لایەوە خۆش نەبوو. لە ناوبڕەی قسەکانماندا، قوڵپ قوڵپ لە شەرابە سپیەکەمان دەخواردەوە. لولا مۆمەکانی گۆڕی. بە هەیبەتێکی تایبەتیەوە، کەوچکێك مرەبای تووی دا پێمان.

لە ڕاستیدا هەموو ئەوانە، وێکچوونێکی زۆری هەبوو لەگەڵ دوا ڕۆژەکانی پەمپنیی. دواتر هاتینە دەرێ و سەرکەوتین بۆ بەر هەیوانەکەی سەرێ، لەو دوورانە، لە پشت گردە بۆرەکان، ڕیزە ڕۆشناییەکی درەوشاوەمان بینی، کە لە زنجیرە گلۆپە ڕەنگاورەنگەکانی شەوانی ئاهەنگگێڕان دەچوو، کە جووڵەیەکی کەمیشیان هەبوو. تانکی ئاژاوەچییەکان بوو لە کێوەکانەوە، لە دیوی کولمینارەوە دەهاتن بەرەو خوارێ. دیمەنەکەیان کەمێك لە مەستیمانی ڕەواندەوە. سرپیتر گەڕایەوە ژوورەکەی و دواتر کە گەڕایەوە لای من دوو قوتووی بچووکی وەك قوتووی تیخی ژیلێت لە دەستیدا بوو. هەر یەکەیان سرنجێکی دەرزیلێدانی ژێر پێستی تێدا بوو، بە دەرزییەکی سپێرەوە و لوولەیەك حەبی مۆرفین. سرپیتر گوتی: "سەیرکە، وێنەکانی کتێبەکەتم بینیوە"- مەبەستی لە وێنەکانی قوربانیانی ئەشکەنجە دراو و شێوێندراوی دەستی فرانکۆ بوو- "خۆشیم بە بینینیان نایێ. ڕەنگە خراپ نەبێ یەکێك لەم قوتووانە لەگەڵ خۆت هەڵگری". پاشان زۆر بە وردی و زانستی فێری کردم چۆن ئەو دەرزی و سرنجانە بە کار بێنم. لوولەکە ئەو هەندەی دنکە حەب تێدا بوو مرۆڤ بتوانێ بە خواردنیان خۆی لە ترسی هەر چەشنە جەنگێك، ناوخۆیی بێ یان دەرەکی، ڕزگار بکات. سرپیتر شیکردەوە و گوتی: "دیارە دەبێ، بەر لە بە کارهێنانی، دەرزییەکە لەسەر ئاگر دا بنێیت و تەعقیمی بکەیت ئەگینا لەوانەیە

دوچاری پەلمان و هەو کردنت بکات". بە بیریم هێنایەوە کە لە بارودۆخی بەر باسماندا، پەلمانێك یان دوان، چ جیاوازییەکی بۆ مرۆڤ نییە.

سرپیتر گوتی قسەکەم زۆر راستە. چوومە نێو گەرماو و پرۆڤەی دەرزیلێدانی ژێر پێستم دەکرد. لە پەنجەرەی ژووری گەرماوەکەوە دەمتوانی رۆشنایی لایتی تانکەکان ببینم، کە هێدی هێدی نزیکتر دەبوونەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەستم دەکرد دەستم داوەتە تاقیکردنەویەکی زۆر پووچ و بێ مانا و گەمژانە، لەو کارانەی لە منداڵیدا هەمیشە باوکم هەرەشەی تەمێ کردنی دەکرد. دواتر کەوتینە سەر باس و خواسی ئاخاوتنە ئەقڵانی و فەلسەفیەکان. دەنگی تەقەی تاك و تەرا لە ناو شار دەهات و جار ناجارێ رێژنەی رەشاشێکیش دەکەوتە بەر گوێمان. شتێك کە لە هەمووی زیاتر شانازیمان پێی دەکرد ئەوە بوو کە نەماندەهێشت ئەو دەنگە نەشازانە ئاخاوتنەکانمان پێ ببڕن. هەندێ خۆ بە گەورە بینین لە هەڵسوکەوتەکانمانڕا دیار بوو. پێم وابێ سرپیتریش درکی بەو حاڵەتەمان کردبوو وەك من. رەنگە هەردووکمان هەستمان دەکرد لەم بارودۆخە ناهەموارەدا کەمێك خۆ بە گەورە بینین زۆر پێویستە. رۆژی دواتر مالاگا رووخا.

وەك هەمیشە کاتژمێر هەشت چێشتی بەیانیمان خوارد. دەمانزانی بۆردوومان بەر لە کاتژمێر نۆ دەست پێ ناکات. — ئیسپانییەکان تەنانەت لە کاتی جەنگیشدا، درەنگ دەخەون- دەمانەویست چێشتەکەمان لە کەشوهەوایەکی ئاشتیانە وهێمن بخۆین. بەڵام قیسمەت ئەوها نەبوو. هێشتا پارووی دووەم لە دەمماندا بوو کە تارمایی سێ کەشتی جەنگی، لەسەر سنگی دەریای پان و بەرینی ژێر بەر هەیوانەکەمان، کە پاکی و، ئارامی و، رەنگێکی شینی قیزەونی هەبوو، بە دیارکەوت. کەشتییەکان بە خێرایی بەرەو لێوار دەهاتن. بە سەر هێڵێکی راست دا، بە خێراییەکی زۆر نزیك دەبوونەوە. بە پێی ئەزموونمان، دەمانزانی بگەنە مەودای دوو کیلۆمەتر دووری، دەست بە بۆردوومان دەکەن. بەڵام، تۆپیان نەهاوێشت. هێڵێکیان لە دووکەڵ لە دوای خۆیاندا جێ دەهێشت و راستەوخۆ بەرەو بەندەری مالاگا، کە هێشتا بە دەست کۆماریخوازەکانەوە بوو، دەهاتنە پێشێ. ئایا سەرەنجام کەشتییە جەنگییەکان لە لە قەرتاجنە بە هانامانەوە دەهاتن؟ تەنیا بۆ ساتێك گومانێکی وامان لا دروست بوو. تەنیا بۆ ساتێك، بە راستی باوەڕمان کرد لەوانەیە لە دوا ساتەکاندا موعجیزەیەك رزگارمان بکات. پاشان بە دووربین ئاڵای دوژمنمان بە سەریانەوە دەبینی. ئاڵای سوور- زەرد- سووری پاشایەتی. کەمێك دوای سعات نۆ کەشتییەکان گەیشتنە لێواری مالاگا. چاوەڕێمان دەکرد تۆپباران دەست پێ

بکەن. بەڵام وایان نەکرد. تۆپخانەی لێوار بێ دەنگ بوو. هەروەها کەشتییەکانیش. ئاڵاکانی سەریشیان شل و خاو شۆڕ ببوونەوە. تەواو.

ئیدی نەماندەزانی چی روودەدا. ئیدی نەماندەزانی، لەو خوارەوە، لە نێو شارە بێ دەنگەکە چی شتێك روودەدا. بەڵام بە وردی هەموو شتێکمان لە نێو یاداشتەکانماندا تۆمارکرد.

## دووشەممە /١٩٣٧/٢/٨ "ئەو رۆژەی مالاگا رووخا"

**کاتژمێر ٨:٠٠ ی بەیانی،** لە کاتی چێشتخواردندا، بە هۆی دووربینەوە، کەشتییەکانی ئاژاوەچییانمان دەبینی ئاڵای سوور- زەرد- سووریان بە سەرەوە بوو گەیشتنە ناو بەندەری مالاگا. چاوڕێ دەکەین ئاگرمان بە سەردا ببارێنن. بەڵام وا ناکەن.

**کاتژمێر ٨:٣٠ ی بەیانی.** هەشت فڕۆکەی ئاژاوەچییەکان، لە ئاسمان، بە دیار سەرمانەو دەسووڕێنەوە بەڵام هیچ مووشەکێك بەر نادەنەوە.

**کاتژمێر ٩:٠٠ی بەیانی:** کاتی دیاریکراوی هەموو رۆژ بۆ بۆمبارانی تۆپخانە. کە چی دەنگی تەقەیەکیش بەر گوێ ناکەوێ. خۆرە تارێکی دردوشاوەیە و بێ دەنگییەك کە لە شاری تارمایی و مردووان دەکات.

**کاتژمێر ٩:٣٠ی بەیانی:** کۆمەڵێکی پەرتەوازە لە جەنگاوەرە جلشڕەکان لە شارێی کولمنارەوە بەرەو خوار شۆڕ دەبنەوە. زۆربەیان تفەنگێکیشیان پێ نییە. چڕ و چاویان سیس و ماندوو، ردێن نەتاشراو، نیگایان پڕ لە نائومێدییەو ترسی نیچیرێکیان لێ نیشتووە. کەوتبێتە دوای راوچییەوە. ورتەیان لێوە نایێ. هاوسەنگی خۆیان لە دەست داوە و بەملاو بەو لادا دەکەون. بێ ئەوەی سەربەرز بکەنەوە بە تەنیشت ماڵ دا تێپەڕین و لەولاتر، لە سەرپێچی جادەکەدا لە بەر چاوان بزر بوون.

**کاتژمێر١٠:٠٠ی بەیانی:** ئاوارەیەکی بەجێماو- جەنگاوەرێکی بریندار، بێ چەك و نیوەگیان و شەکەت- بە پێش ماڵدا تێپەر دەبێ و داوای ناو و جگەرە دەکات. لە کاتێکا جگەرەکەی بۆ دادەگیرسێنم دەبینم هەموو گیانی دەلەرزێ.

پرسی: " رێگای شار هێشتا کراوەیە"؟

_ "بەڵێ، هێشتا کراوەیە"

_ "نامکوژن"؟

_ "نە، ناتکوژن"

_ "دڵنیای نامکوژن"؟
_ "بەڵێ، دڵنیام ناتکوژن"
_ "خوات لێ رازی بێ، سنیوّر"
دواتریش ملی رێگای گرت و رۆیی. "نازانم کوشتیان یان نە"

**کاتژمێر ۱۱:۰۰ی بەیانی**، گەمییە جەنگییەکان و فڕۆکەکانی یاخیبووان هەروا لە نێو دەریا و لە ئاسمانی ژێر دەسەڵاتی کۆماریخوازان تەراتێن دەکەن. لەگەڵ سرپیتر بڕیارماندا بچینە ناو شار بزانین دەنگو باس چیە. هەر کە لە ماڵ دەرچووین، رەشاشێك لە شوێنێکی نادیار، لەم دەوروبەرانە دەست بە تەقە کردن دەکات. جادە دەکەوێتە ژێر ئاگری رێژنەی گوللە و ئێمەش دەگەڕێینەوە ماڵەوە.

**کاتژمێر ۱۲:۰۰ی بەیانی**، خیزانێکی هەڵاتوو دێنە ناو باخ- پیاوێك لەگەڵ ژنێك و دوو منداڵ و، خەسووی و بارکۆڵێك لە سەبەتە و بوخچەی گەورە، کە پێ دەچێ نوێن بن. "بە پێی نەریتێکی کۆنی شایانی بەزەییدا، لە کاتی روودانی کارەساتە گەورەکاندا- وەك ئاگر کەوتنەوە، لافاو، شەڕ- خەڵکە داماوەکە، بەر هەموو شتێك، نوێن و پێخەفەکانیان دەرباز دەکەن. قاپ و قاچاغ، تاوە و قاپە قوڕینەکان لە گەنجینە زەمینییەکانن و پلەی دووەمیان لە رووی بایەخ پێدانەوە بەر دەکەوێ. ئەو پێش و پاش خستنە لە دەرباز کردنی ئەو شتانەی وا بیردەکەنەوە بایەخی هەبێ بۆ پاراستنیان، رەنگە بە رووت و قووتترین و بێ شەرمانەترین شێوە، پەردە لەسەر بێچارەیی بەردەوامی هەموو چین و توێژەکانی ئەم دنیایە هەڵماڵێ. لە پلەی سێیەمی لیستەکەدا، کەنارییەك بە قەفەسەکەیەوە، پشیلە ماڵییەکە، یان سەگێکی دوو رەگە دێت. ئەوانە نیشانە و دیاردەی بەشی رۆشن وهەتاوگیری ژیانن".

خێزانەکە لە نێو باخەکەدا جێ خۆش دەکەن. بە شێوازە باوەکە، واتە بە دەستی مست کراو- سڵاوی باو لە ئیسپانیای کۆماریخواز- سڵاو و بەخێر هاتنیان دەکەین. بەڵام ئەوان هیچ جوولەیەك بە دەستەکانیان ناکەن و مەڕ ئاسا زەردەخەنەیەك دەکەن. لێیان دەپرسین یاخیبووەکان لە کوێن؟ ژنەکە بە چرپە و چاو داگرتنێکی شەیتانانە دەڵێ:"هێزە میللییەکان لە هەموو شوێنێکن- لێرە- لەوێ"... پاشان پەنجەی لە سەرلێوەکانی دادەنێ، وەك ئەوەی "مور"ەکان لە پشت بنچکە دارەکانەوە خۆیان شاردبێتەوە. لە ژنەکە دەپرسین بارودۆخی شار چۆنە، ئەویش هەر بە هەمان چرپە و چاو داگرتنە شەیتانیانییەکەی دەڵێ: "لەمڕۆ بەیانییەوە ئاڵای سپییان لە سەر بارەگای قایمقامیەتی مەدەنی هەڵکردووە"

## ٤

کـە وابـێ هـەموو شـتێك كۆتـایی پـێ هـاتووە و مالاگـا خـۆی رادەسـت کـردووە. دوا قسەکانی "سەرهەنگ بیلیابا"م هاتەوە بیر، کاتێ بەر لە سـوار بـوونی ئوتومبێلەکـەی گـوتی: "بارودۆخەکە ئاڵۆزە بەڵام مالاگا ئازایانە شـەڕ دەکـات". مالاگـا ئازایانـە شـەڕی نـەکرد. ڕێبەرانی شار خیانەتیان لە شارەکە کرد.- بە خۆیان هەڵاتن و شـاریان سـپارد بـە دەم تیخـی جەللادەوە. کەشتییەکانی یاخیبووان بۆردومانیان کردین و کەشـتییەکانی کۆمـاریخوازان هـەر دەرنەکەوت، فڕۆکەکانی یاخیبـووان تۆوی ترس و وێرانییـان بـە سـەرماندا ڕژانـدو فڕۆکـەکانی کۆماریخوازان هەر دەرنەکەوتن. یاخیبووان تۆپخانە و زرێپۆش و تانکیان هەبوو بـەڵام چـەك و جبەخانەی جەنگیی کۆماریخوازەکان هەر نقەی لێوە نەهات. یاخیبووان لـە هـەموو لایەکـەوە پێشرەوییان کرد و ئەو پردەی کە تەنیا جادەی مالاگای بە کۆمارەوە دەبەسـتەوە بـە درێـژایی چوار مانگ بە شکاوی مایەوە. یاخیبووەکـان دیسـپلینێکی پۆڵاییـنیـان هـەبوو، نەفـەرەکانی خۆیان بە زەبـری رەشـاش دەنـاردە گۆڕەپـانی جـەنگ، کـە چـی بـەرگریکارانی مالاگـا، نـە دیسپلینێکیان هەبوو، نـە ڕێبەرییـەك و نـە پشـتیان بـە کۆمـار قـایم بـوو. ئیتالیاییـەکان، "مۆر"ەکان و بەتالیۆنە بیانییەکان بە ئازایەتی و شارەزایی سەربازانی بە کرێگیراو، لە پێنـاو ئارمانجێك کە هیچ پەیوەندییەکی بە وانەوە نەبوو، دژی خەڵك شەڕیان کرد، کە چی سەربازانی خەڵك، کە لە پێناو ئارمانجی خۆیان دا دەجەنگان پشتیان لـە شـار کـرد و هـەڵاتن. ڕێبـەرە تاوانبارەکانی شـار، کە سـەربازانی خۆیان بە تەنیا جێ هێشت و ڕایان کرد، رادەسـتی دادگـای

سەرپێی کران. کابینەی خەتاباری "لارگۆ کابالرۆ"، کە مالاگای رادەستی قەدەر کرد، ناچار کرا دەست لە کار بکێشتێتەوە. بەڵام حکومەتە خەتاکارەکانی دیموکراسییەتی رۆژئاوا، کە کۆماری ئیسپانیایان رادەستی قەدەر کرد، نە دەکرا رادەستی دادگای سەربازییان بکەیت و نە دەکرا ناچاریان بکەیت دەست لە کار بکێشنەوە. مێژوو ئەوان دادگایی دەکات.ئەویش دەبێتە هەنارەکەی دوای مەرگ. مرۆڤ هەر چەند زیاتر لە چاوەڕوانیکردنی شتێکدا دا بنیشێ، سەرەنجام کاتێ شتەکە دێت، مرۆڤ زیاتر تووشی سەرسوڕمان دەبێت. ئێمە چەندین رۆژ بەر لە ئێستا زانیبوومان مالاگا لە دەست چووە، بەڵام کۆتاییەکەمان بە شێوەیەکی تر چاوەڕێ دەکرد. ئەوەندە هەموو شتێك لە بێدەنگییەکی ترسناك و بێ هەرا و بێ رووداو تێپەریبوو، هەموو ئاماژەکان، گەیشتنی قۆناغی قەیرانیان دەرخستبوو، بەڵام لە بارەی ترۆپکی رووداوەکان لە خشتە برابووین. زۆر بە شاراوەیی، ئالآی سپی لە سەر بورجی مالاگا هەڵدرا بوو. بەیانییەکەی کە، کەشتی و فڕۆکەکانی دوژمن گەیشتن، چاوەڕێ بووین ئاگرمان بە سەردا ببارێنن و ئاگامان لەوە نەبوو ئیدی دوژمنێك لە ئارادا نییە و ئێمە ئەوساش لە ژێر ئالآی "بوربون"دا دەژیاین. ئەم ئالوگۆڕە بێدەنگ و فێڵبازانە، ترسناکتر لە هەر شتێکی تر بوو کە لێی دەترساین. ئەوسا کە هێشتا لە شیرین خەودا بووین خرابووینە ژێر مەرحەمەتی ژەنەراڵ فرانکۆوە.

هەر ئاوهاش پرۆسەی، هاتنە ژوورەوەی سوپای یاخیبووان بۆ ناو شار، بە شێوەیەکی ناسرووشتی و بێ هیچ کاردانەوەیەك ئەنجام درا. یادداشتەکانم درێژەیان هەیە:

**کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ**، سەرو پۆتەڵاکی ئەفسەرێك کە کڵاوی ئاسنینی خاکیی رەنگی سوپای ئیتالیای لە سەر دایە، رێك لە بەرامبەری ماڵەکەی ئێمەدا، لە سەر جادەی کولمنار دەر دەکەوێ. سەیرێکی دەوروبەری خۆی دەکات و بە دەمانچەکەی دەستی گوللەیەکی هەوایی دەتەقێنێ. دەست بە جێ نزیکەی دوو سەد کەس لە سەربازانی پیادە، بە ئارایشێکی سەربازیی لە جادەکە شۆڕ دەبنەوە. سروودەکەی مۆسۆلینی، "جیوڤینیزا" دەڵێنەوە. بە بەر دەرگای ماڵ دا تێپەر دەبن و سلاوی سەربازی دەکەن و ئەو کەسانەیش کە تا دوێنێ بەو پەڕی حەماسەتەوە مستیان لە هەوا دا رادەوەشاند، ئێستا هەر بەو گەرموگوڕی و حەماسەتی ئیسپانیایی، باسکیان لە شێوازی فاشیستەکان بەرز دەکەنەوە. زۆریش ئاسوودە دیارن، بەڵام چونکە بە چاوی نیمچە گێل لە ئێمەی بیانی دەڕوانن، باخەوانەکە بە من و سرپیتر دەڵێ باشتر وایە لە شێوەی ئەوان هەڵسوکەوت و رەفتارمان بگۆڕین "چونکە ئێستا ئیدی حکومەتێکی نوێمان هەیە". پاش ماوەیەك، هەروا کە سوپاکە زیاتر و زیاتر دەبن و تێپەر دەبن و سلاوی سەربازی

دەکەن- هەموومان لە بەر هەیوانەکەی سەریّ راوەستاوین و دەڵێی رۆڵی ئەو بەرپرس و فەرماندانە دەبینین کە رێڕۆیشتنی سەربازان دەبینن- من و سرپیتریش ناچار دەبین بۆ وەرگرتنەوەی سلاّوە سەربازییەکانیان وەکو هەمووان باسکمان بەرز بکەینەوە. شەرمیش دەکەین سەیری یەکدی بکەین. پەرداخێکی پڕ لە کۆنیاك شۆڕ دەکەمەوە ناو قورگم.

**کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ**، دەستەیەك لە سەربازانی پیادەی ئیتالیایی گردەکەی نزیکمان داگیر دەکەن.

**کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ**. فەرماندەی دەستە سەربازییە ئیتالیاییەکەی سەر گردەکە، دێتە ناو باخ و یارمەتی وەردەگریّ خۆی بشوا. زۆر بە ئەدەبەوە خۆیمان پیّ دەناسێنیّ. سرپیتر فەرمان دەدا گەرماوی بۆ ئامادە بکەن. چەند سەربازێکیش بە دوای دا بۆ خۆشتن و ئاو خواردنەوە لە گردەکە شۆڕ دەبنەوە. وشەیەکی ئیسپانیاییش نازانن. زۆر شەکەت و ماندوو دیارن. بە ئەدەبەوە هەڵسوکەوت دەکەن. من و سرپیتر لە سەر کورسی، لە هەیوانەکە دادەنیشین. خۆرەتاوێکی خۆشە. دەنگی شڵپە شڵپی فەرماندەکەمان بەر گویّ دەکەویّ لە نێو گەرماودا. کۆکین لە سەر ئەوەی ئەو کابرایەکی بە رێزە. هێشتا نیگامان لە یەکدی دەدزینەوە. شەرم خەریکە دەمخنکێنیّ و وەکو ئیسفەنجێکی وشك ناو قورگمی بە یەکەوە نوساندووە.

**کاتژمێر چواری پاش نێوەڕۆ**، دەنگی شادی دەربڕین و چەپڵە لێدان لە ناو شار دەگاتە بەر گوێمان. یاخیبووەکان گەیشتوونەتە ناو شار.

**کاتژمێر چوار و نیوی پاش نیوەڕۆ**، ئوتومبێلەکان ئاڵای بۆربۆنیان هەڵکردووە و بە درێژایی جادەکەدا دێن. تانکەکان بە جووڵەیەکی قورس، لە ستوونێکی بیّ کۆتایی، لە کوڵنارەوە شۆڕ دەبنەوە. دەنگی تەقە بە مەودایەکی دیاریکراو لە نێو شاردا بەرگویّ دەکەویّ. یەکێك لە نێو ئەوانەی لە بەر دەرگای ماڵ دا کۆ بوونەتەوە بەر لە هەمووان رای خۆی دەردەبڕێت گوایە چونکە شەڕ تەواو بووە، لە وانەیە ئەو تەقە کردنە مەعنای ئەوە بیّ "ئیعدام کردنی سوورە تاوانبارەکان خەریکە دەست پیّ بکات". دیسان شەو داهات و ئێمەیش دیسان لە سەر کورسیە دەستە دارەکانی سەردەمی ڤیکتۆریا کە پشتیان بەرزە، لە پشت ئەو مێزانەی دەڵێی بۆ کارێکی زۆر رەسمی ریز کراون، لە بەرامبەر یەکدا دانیشتووین.

هەموو ئەو کاغەزانەم سووتاندووە کە گومانێك دروست دەکەن: پێناسەکەی باڵیۆزخانەی ئیتاڵیا لە پاریس، بەڵگەکانی پەڕینەوە، بە ئیمزای بەرپرسانی ڤالانس و، هەموو نوسخەی کتێبەکانم بێجگە لەوەی پێشکەشی سرپیترم، کرد بوو. بەڵام بەڵێنی دا ئەویش لە نێو ببات.

پاشان هەموو ئەو وشە و رستانەم لە یادداشتەکانمدا خەت بە سەر دا هێنا و سڕییەو، کە مەترسییەکیان بۆم دروست دەکرد. ئێستا ئیدی هەر ساتێك لە وانە بوو بێن بە سەر وەختی ئێمەشەوە- ئەگەری ئەوە هەبوو شەو بێن- بەڵام لە دڵمانەوە باوەڕمان بە وەزعەکە نەبوو. ئەم بەیانییە، کاتێ جگەرەکەم دا بووە ئەو جەنگاوەرە لەرزۆکە، هێشتا بیرم لە هەڵاتن دەکردەوە. نیوە بڕیارێکم دا بوو ئامێری تایپ و کاغەزەکانم هەڵگرم و لەگەڵ جەنگاوەرەکان بڕۆم. زیاتر تەمبەڵییەکە بوو کە نەڕۆیشتم. لەو خوارە، شار نوقمی فەوزا و بێ سەروبەری و وەزعێکی تەمو مژاوی ببوو، لێرەش باخ، لە نێو ئارامییەکی قورس، لە ژێر تیشکی خۆرەتاو دا ڕاکشابوو- بە دوور دەزاندرا بێ سەروبەرییەکەی شار تەشەنە بکات و بگاتە نێو ئەم باخە جوان و هێمن و ڕازاوەیە. کەوتمە یادی دیمەنێك لەو شانۆگەرییەی لە بارەی شۆڕشی فەرەنساوە، یەکێك لە نووسەرەکانی سەدەی ڕابردووی ئەڵمانیا نووسیبووی. "دانتۆن" ئاگادار دەبێتەوە کە سبەی "ڕۆبسپیر" دەستگیری دەکات و، ئەویش بە شەو لە ماڵەوە هەڵدێ. دەکەوێتە دڕکەڵان و نێو تاریکییەوە. دنیا ساردەو بای دێ. لە ناکاو ئەو هەستەی لە لا دروست دەبێ کە ئاوارە بوون لە نێو دڕکەڵان و تاریکی لە شەوێکی ئاوها تووش دا، لە جیاتی خەوتن لە نێو پێخەفێکی گەرم ونەرم، ئەو پەڕی شێتییە. روبسپیر و کۆنڤانسیون وا دێنە بەر چاوی کە، تەنیا دێوە زمەیەکی خەیاڵین و هیچی تر ئەقڵی وا دەبڕێ کە گەڕانەوە بۆ ماڵ و خەوتنێکی ئارام باشترین ڕێگایە. هەروایش دەکات. گوشراوەی بیرکردنەوەکانی ئەوهان : "هەرچەندە بە شێوە تیوریش ئاگاداری ئەوە ببین کە، مەترسییەك هەڕەشەمان لێ دەکات، لە ناخی ویژدانمانەوە دەنگێکی زوڵاڵ پێمان دەڵێ : سبەیش ڕۆژێك دەبێ وەکو دوێنێ" بەیانییەکەی ڕۆژی پاشتر دەسگیر دەکرێ.

لە ناخی ویژدانی ئێمەشدا، لەم دوا شەوەدا، هەمان ئەو دەنگە زوڵاڵە بوو دەیگوت سبەیش ڕۆژێك دەبێت وەکو دوێنێ.

کاتژمێر یازدەی بەیانیی ڕۆژی پاشتر دەسگیر کراین.

# ٥

لێرەوە بە سەرهاتەکە، هەندێك گرێی تێ دەکەوێ و پێشهاتەکانیش تێکەڵبوونێکی سەیر و چاوەڕوان نەکراویان تێ دەکەوێ. دەبێ بگەڕێمەوە بۆ دواوە.

لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٣٦، یەکەم مانگی شەڕی نێوخۆیی، لـە لایـەن رۆژنامـەی نیـوز کرونیکلەوە سەردانی پرتوغال و ئیسپانیای یاخیبووانم کرد بوو. لە شاری سیڤیل، کە ئەوسـا، بنکەی فەرماندەیی یاخیبووان بوو، دیمانەیـەکم لەگـەڵ ژەنـەراڵ "کێیپـو دلیـانۆ" ئـەنجام داو دەرفـەتێکی باشـم هـەبوو بـۆ تـاوتوێکردنی ئاسـتی پشـتیوانی سـەربازیی ئەڵمانییـەکان و ئیتاڵییەکان لە یاخیبووان. ئەو بەڵگانەی بە دەستم هێنا، سەرەتا لە رۆژنامەی نیوز کرونیکـل و دواتریش لەو کتێبەی کە، پێشتر ناویم هێنـا، چـاپ کـرا "ئیسـپانیای نغـرۆ کـراو لـە نـاو خوێندا". لە دوای ئەوە ئاژاوەچییەکان هـیچ کاتێـك رێگایـان نـەدا پـەیامنێرێکی رۆژنامـە لیبراڵییەکانی بەریتانیا بچێتە نێو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوانەوە. بە درێژایی مانـەوەم لـە شاری سیڤیل، سەروان بۆلین، بەرپرسی چاپ و بڵاو کردنەوەی یاخیبووان، رێنمای من بوو. هەر ئـەو بۆلینـەش چـاوپێکەوتنەکەی مـنی لەگـەڵ ژەنـەراڵ دلیـانۆ رێـك خسـتبوو. رۆژی دوای چاوپێکەوتنەکە، ئەو رۆژنامەنووسە ئەڵمانییەم بینی، کە چەند سـاڵ بـەر لـە ئێسـتا لەگـەڵی ئاشنا ببووم. ناوی ستریند بێرگ بـوو " کـوڕی ئۆگۆسـت سـتریند بێـرگ نووسـەری گـەورەی سکاندیناڤی"، ئێستا بۆ رۆژنامەکانی سەر بە نازییـەکان کاری دەکرد. کاتێ بە یەك گەیشتین، ئەو لەگەڵ چوار فڕۆکەوانی نازی، لە ساڵۆنی ئوتێلێك لە شـاری سـیڤیل دانیشـتبوو. هـەموو

شتێکی لە بارەی پێشینەی چەپبوون یان "سوور" بوونی من دەزانی، لە حاڵەتێکدا بۆلین لەوە بێ ئاگا بوو. هەمان شەو منی لای بۆلین ئاشکرا کرد.

لە کاتێکی باشدا کاروباری هەڵاتنی خۆم کرد بەرەو جەبەل تارق. بڕیاری دەستگیر کردنم یەك کاتژمێر پاش تێپەر بوونم لە سنوور دەرچوو بوو. بە گەیشتنم بۆ لەندەن بابەتەکەم بڵاو کردەوە. چەند مانگێك دواتر ئەو هاوپیشانەم کە، لە ئیسپانیاوە دەهاتن گوتیان سەروان بۆلین سوێندی خواردووە "ئەگەر دەستی بگاتە "ك" _ واتە من_ وەکو سەگێکی هار بیکوژێ".

ئەو کەسەی کە رۆژی دواتری داگیر کردنی مالاگا لە لایەن یاخیبووانەوە، من و چامرز مێشل _سرپیتر_ی دەستگیر کرد ئەم نەقیب بۆلینە بوو. تازە ئەمە نیوەی یەکەمی پێشهاتەکەیە و نیوەی دووهەمیشی بەم جۆرەیە: نەقیب بۆلین کوڕە مامێکی هەبوو. ئەو کوڕە مامەی ئەو، خانووێکی لە مالاگا هەبوو. ئەو خانووەش هەر ئەو ڤیلایەی تەنیشتی ئێمەوە بوو. ناوی ئەو کوڕە مامەی، سنیور"توماس بۆلین" بوو. ئەو تۆماس بۆلینە و خانەوادەکەی هەموو ژیانیان قەرزارباری سرپیتر بوون. سرپیتر شەوی بەر لە دەسگیر کردنمان، لە سەر سفرەی دوا ناخواردنی ئێوارە کە، لە ماڵی ئەو خواردمان، چۆنێتی رووداوەکەی بۆ گێڕامەوە. تۆماس بۆلین یەکێك بوو لە ئەندامە فالانژەکانی حیزبی فاشیستی ئیسپانیا. رۆژی" ١٨ "ی تەمووزی ١٩٣٦، ژەنەراڵەکان لە سەرانسەری ئیسپانیا دا شۆڕشێکیان بەر پا کرد. لە مالاگاش، وەکو مەدرید و بەرشەلۆنە، شۆڕشییەکان دوا بە دوای شەڕێکی توندی شەقام بە شەقام تووشی شکست بوون و کۆماریخوازەکان، زاڵبوونی خۆیان بە سەر شاردا پاراست. سنیۆر بۆلین خۆی کوتایە ماڵی سرپیتری دراوسێی کە، دەیزانی لە "سوورەکانە" بۆ ئەوەی داڵدەی بدات.

تۆماس بۆلین لەگەڵ هاوسەری و خەسووی و پێنج- شەش منداڵ و دوو- سێ خزمەتکارەکەی هاتنە ماڵ. سرپیتر هەموو عێل و عوربانەکەی بۆلینی لە ماڵەکەی خۆیدا جێ کردەوە. سنیۆر بۆلین هەمان ئەو دوو ژوورەی کە شەش مانگ دواتر بووە جێ حەوانەوەی من، داگیر کرد. سەرەتای هاتنی، پاکەتێکی کە، چەند بەڵگەیەکی لە ناو دا بوو وەکو ئەمانەتێك سپارد بە سرپیتر و ئەویش لە نێو چەکمەچەی مێزەکەی خۆیدا شاردییەوە. رۆژێك دواتر گرووپێك لە ئانارشیستەکان ماڵیان پشکنی. چونکە دەیانزانی نێوان سرپیتر کۆکە لەگەڵ حکومەتی کۆماریی، نەیانویست کێشەی بۆ دروست بکەن بەڵام داوایان لێی کرد بەڵگەکانی ئەو سنیۆری لە نهۆمی سەرەوەدا دەژی ببینن. سرپیتر ناچار بوو بەڵگەکانیان ڕادەست بکات. سەر دەستەی ئانارشیستەکان، کوڕە گەنجێك بوو، پاکەتەکەی کردەوە. یەکەم شت کە تێیدا

دۆزییەوە پێناسەی ئەندامێتی سنیۆر بـۆلین بـوو لـە حیزبـی فالانـژدا و، دوای ئـەویش چـەند وێنەیەکی رووت لەو وێنانەی کە، هەندێك لە کتێبفرۆشییەکانی پاریس لە رێـی پۆسـتەوە بـۆ پیشەگەر و ئەماتۆرییەکانی دەنێرن. گەنجە ئانارشیستەکە لە هەر دوو دۆزینەوەکەیدا خۆشحاڵ دەبیندرا. دوا جار بیرۆکەیەکی زۆر باش بە مێشکی سـرپیتر دا هـات. بـە دەنگێکـی نـەرم و هێواش گوتی: "سـەیر کە، با سەودایەك بکەین، وێنـەکان بـۆ تـۆ و پێناسـەکەش بـۆ مـن".
ئانارشیـستەکە، کە هەر وەك گوتم گەنجێك بوو، سەرەتا تووڕە بوو، دواتر پێی خۆش بوو، پاشان بە هۆی سۆز و خۆشەویستیەکەی بۆ سرپیتر رازی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا دوای چەند رۆژێك سنیۆر بۆلین دەسگیر کرا. بەڵام سرپیتر بە کەفالەتی خۆی ئازادی کرد، پەسـاپۆرتی بـۆ خانەوادەکـەی وەرگرت و سەرەنجام، مەترسـی خستە سەر ژیانی خۆی و، بۆلینی لە مالاگاوە بەرە جەبەل تارق قوتار کرد. شتومەکەکانی بۆلین لە ماڵی سرپیتر مایەوە و ڤیلاکەی بۆلین کرا بە نەخۆشـخانەی سەربازیی.کاتژمێر یازدەی بەیانییەکەی رۆژی سێشەممە، رێکەوتی ٩/ی شوبات دەسگیر کراین.
**کاتژمێر دە و نیو** لە سەربان، لەو شوێنە راوەستا بووم کـە، لێیـەوە دێـدەوانی و سـەیری شارمان دەکرد و ئەو لۆریە پڕ لە سـەربازە ئیتالییانەم دەژمارد، کە بە ریزێکی بێ کۆتـایی لـە کێوەکانەوە شۆڕ دەبوونەوە. ئیتالیاییەکان کۆك و کەیفساز بوون. شـتومەکە سـەربازییەکانیان بێ کەموکوڕی بوون. لە کلاوی ئاسنین بگرە هەتا پۆسـتاڵەکانیان، جیاوازییـەکی زۆری هـەبوو لەگەڵ جلە شڕ و دڕاوەکانی پارتیزانە کۆماریخوازەکاندا. هەر ئەوها کە سـەرو سـیمای شـاد و زیندوو، سەرو سیمای شـادی سـەرکەوتووان، یـەك بـە دوای یەکـدا دەکەوتنـە نـاو مـەودای دووربینەکەم، هەسـتی ناخۆشـی پیـاوێکی هـەژاری ئەفسـانەییم لـە لا دروسـت دەبـوو کـە، بانگهێشت کرابێتە سەر سفرەی خواردنی کابرایەکی دەوڵەمەند. دواتر ئۆتومبێلێکی تایبـەتی زۆر جوان و هەندێك تۆزاویم بینی کە، رازاندرابۆوە بە ئاڵای بۆربون لە جادەکەوە بـەرەو مـاڵی سنیۆر بۆلین سەر دەکەوت. ئەمەم بە سرپیتر راگەیاند. سـرپیتر گوتی: "رەنگە بۆلین بێ لە دوور خراوەیی دەگەڕێتەوە سەر ماڵی خۆی. ئێستا نۆرەی ئەوە ئاگای لە ئێمـە بێ".سـرپیتر بـەرەو ڤیللا چوو. دە خولەك دواتر گەڕایەوە. پەرێشان و رەنگ هەڵبزرکاو. گوتی: "بۆلین بـوو. هـەر ئێستا بە ئۆتۆمبێل لە جەبەل تارق گەڕاوەتەوە".
_"هێشتا لەو وێنە ڤێزەونانەی هەیە"؟

_ "نا. بەڵام کڵاوی بەرخە سوورەی "سوپای کارلیستەکانی" لە سەر دایە، دەمانچەیەکی گەورەی سەربازیشی هەیە. دەڵێ لە ڕاو کردنی "سوورەکان" لە شار، سەرمەست دەبێ و چەند کەسێکیشیان لێ بە دەستەکانی خۆی دەکوژێ.

_هیچ نەبێ سوپاسێکتی کرد؟

سرپیتر شانەکانی هەڵتەکاند و بۆ نهۆمی سەرەوە سەرکەوت تا شتومەکەکانی بۆلین کۆ بکاتەوە. بە تەنیا ماومەتەوە لە نێو باخ دا. دیسان هەست دەکەم پێویستیەکی زۆرم بە خواردنەوەی کۆنیاك هەیە و دەچمە ژووری کتێبخانەکە، تا پەرداخێك بە سەر قوڕگم دا بکەم. کتێبخانە سێ دەرگای هەیە. لە کاتێکدا بە دوای کۆنیاکدا دەگەڕام، هەر سێ دەرگا پێکەوە بە بێدەنگی دەکرێنەوە و سێ ئەفسەر، دەمانچە بە دەست، وە ژووری کەوتن. دووانیان نا ناسم. تەنیا شتێك لێیان کە، سەرنجم رادەکێشێ پۆشاکە سەربازییە نوێکەی بەریانە. سێیەمیان نەقیب بۆلینە. ڕووداوەکانی تر بە خێرایی هاتن و تێپەڕین، وەك ئەو فلیمانەی بە جووڵەی خێرا نیشان دەدرێن. سرنجەکەی دەرزیلێدانی ژێر پێست لە گیرفانمدایە. ئەو هەندەم پێویستە دوو سێ خولەك بە تەنیا بمێنمەوە. بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێ هەوڵ دەدەم بە خشپەیی سەرکەومە نهۆمی سەرێ. کاتێك قاچم نایە سەر پێپلیکانی سێیەم. دەنگێکی گڕ و توڕە لە پشتەوەمڕا بەر گوێم دەکەوێ.

_دەستەکانت هەڵبڕە!

هەر دوو دەستم بەرز دەکەمەوە، بێ ئەوەی ڕووم وەرگێڕم، چاوەڕێی ئەوە دەکەم بۆلین تەقەم لێ بکات. هەست دەکەم پشتی سەرم بە خور دێت، جۆرێك لە بۆشایی، کە زۆریش بەلامەوە ناخۆش نییە و سات بە سات زیاتر دەبێت. دەنگی بەرزی هەناسەی هەر چوارمان دەبیستم.

دابەزە خوارێ!

بە ئاگایی، وردە وردە دێمەوە خوارێ. لەگەڵ خۆمدا بیردەکەمەوە: "ئەگەر جووڵەیەکی نا بە جێ بکەم ئیشم تەواوە".

لە شێوەی گرووپێك لە ناوەڕاستی ژووری کتێبخانەدا راوەستاوین. سێ دەمانچە نیشانەیان لێ گرتووم، دووانیان لە تەنیشتەکانم و سێهەمیش لە پشتەوەمڕا. هەموو شتێك لە خەون دەچێت، هاشەی هەوای دەوروبەرم لە دەنگێك دەچێت لە نێو قاوغ و سەدەفێکی بە تاڵدا دەربچێ. لە نێو ئەو هاشەیەدا دەنگی نەقیب بۆلین دەبیستم، کە روو لە باخەوان دەڵێت:

_ پەت.

باخەوان دەچێتە دەرێ گوریس بێنێ. باخەوانەکە دەبینم دەشەلێ. سرپیتر لە سەر پێپلیکانـەکان دیار دەکەوێ. جانتا دەستییەکەی سنیۆر بۆلین لە نێو دەستی دایە. "دەستەکانت هەڵبڕە".

دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و قیت و رەپ دەوەستێ. چەند چرکەیەك بێدەنگی باڵ بـە سـەر کەشەکەدا دەکێشێ. هەمووومان وەك جەستەی سەهۆڵبەستوومان لێ هات و لە جێی خۆمانـدا چەقیوین. رێك وەك کۆتەڵە لە شەم و مۆم دروستکراوەکانی مۆزەخانەی "مادام تۆسۆ" پاشان کەسی چوارەم، کە کڵاوێکی سووری لە سەرە دێتە ژوورێ. هـەر کـە چـاوم پێـی کـەوت، لـە وێکچوونەکەی بە کوڕە مامەکەی، دەیناسمەوە. سنیۆر تۆمـاس بۆلینـە. زەردەخەنەیـەکی پـڕ مانای لە سـەر لێوە و سەیری ئەم دیمەنە جوانە دەکات. دەپرسم:_ سـرپیتر، ئەمـە هـەر ئـەو پیاوە نییە کە رزگاریت کرد؟

سنیۆر بۆلین بە تەوسەوە پێدەکەنێ. باخەوان دەگەڕێتەوە. پەتی پێ پەیدا نـەبووە و لـە جیـاتی، دوو مەتر وایەری کارەبای هێناوە. بە سـرپیتر دەڵێم: "وابزانم دەیانەوێ لە سێدارەم بدەن". بـە زەیـنم دا دێ گیان دەرچوون بەو وایەرە نەرمە زیاتر درێژە دەکێشێ لە گوریسی ئاسایی.

بۆلین دەڵێ: "بێ دەنگ بە!" و هێمایەك بۆ نەفەرەکەی لای چـەپی دەکـات. ئەفسـەرەکە- گەنجێکی رێك و هەندێك شەرمن و کەسێکی باش دێتە بەر چاو- وایەرەکـە وەردەگـرێ و لـە پشتەوەم رادەوەستێ. دەستەکانم بۆ لای پشتەوە دەسووڕێنێ و هەوڵ دەدا بە وایەرەکە هەر دوو دەستەکانم ببەستێتەوە. بەڵام وایەرەکە زۆر رەق و وشکە. ئەفسـەرەکە، لـە دەورم دەسـووڕێ، دەستەکانم جارێکی تر دەگەڕێنێتەوە پێشەوە، دەڵێی بووکە دارینەیەکی بە دەستەوەیە گەمـەی پێ دەکا، سـەر لە نوێ هەوڵ دەدات دەستەکانم ببەستێ. لە هەموو ئەو ماوەیەدا، بۆلین لوولەی دەمانچەکەی لە سەر لاسەری راستم داناوە و ئەفسەری سێهەمیان دەمانچەکەی ناوەتە سەر لا سەری چەپم. ئەم سێهەمیە، قەڵەوێکە سـەرێکی تەواو رووتـاوە و رووخسـارێکی ئاژەڵییانـەی هەیە. بە درێژایی رووداوەکان، تەوسـە زەردەخەنەیەك بە سەر لێـوە ناحەزەکانییەوەیـە و وەکـو یەکێك شاگەشەکە بووبێ، بێ راوەستان و بە خۆشحاڵییەوە هەناسە دەدات. وەك ئەوەی تەنگـە نەفەسیی هەبێ لە لووتەوە هەناسە دەدات. دەتوانم هەناسەی لە سـەر گوێچـکەم هەسـت پـێ بکەم. هەتا ئەمڕۆ، ئەم جۆرە بیچم و نموودی ئازاردەرانەم تـەنیا لـە وێنـە کارێکاتێرییەکانـدا بینیوە و قەت نەمزانیوە لە راستیشدا ئاوها سیمایەك لـە مرۆڤـی راسـتەقینەدا هـەبێ. ئـەو ناکەسە بە تەوسەوە پێدەکەنی و خێرا و بە دوای یەکدا هەناسە هەڵدەکێشێ. بە روونی پێیەوە دیـارە نەخۆشی دەروونی هەیە. نەفرەتی جەستەییم، تەلیسمە خـەون ئاسـاکە دەشـکێنێ، سـەر لـە نـوێ

هۆشیار و بە ئاگام و ترسم بۆ گەڕاوەتەوە، ترسەکە دەخزێتە ژێر پێستم و چرنوك لە دڵ و ریخۆڵەکانم گیر دەکات. پاشان، بە سەرسوڕمانەوە دەنگی خۆم دەبیستم کە دەڵێم: " گوێ بگرە بۆلین، ئەگەر دەتەوێ بە گوللە لێم بدەیت و بمکوژی، بمبەرە نهۆمی دووەم. بە بەر چاوی سرپیتر ئەم کارە مەکە".

دواتر، زۆر جاران بیرم لەوە دەکردەوە ئایا ئەو قسەیەم، کە رەنگە ژیانمی رزگار کرد بێ، تەنیا بۆ ئەوە کرد تێبینی حاڵ و نەخۆشیی سرپیتر بکەم یان لە بەر پێویستیم بوو بە زیندوومانەوە بۆ کاتێکی زیاتر. لە وانەیە تێکەڵەیەك بوو بێ لە هەر دوو حاڵەت. بەڵام پێم وا بێ هۆکارە دووەمەکەی زاڵتر بوو. بۆلین دەڵێ: "بێ دەنگ بە" بەڵام دوو دڵییەك لە نێو دەنگی دا هەیە. شتێکی تر کە لە یادم ما بێ، ئەوەیە کە سرپیتر دەیویست تۆماس بۆلین بێنێتەوە سەر ئەقڵ. سرپیتر دەیەویست لە ژوورەکەی ئەولاتر، پێنج خولەکێك لەگەڵ بۆلین قسە بکات. سنێور بۆلین تەوس و تانەوە پێدەکەنی، بەڵام دواجار رازی بوو. هەر دووکیان چوونە ژوورەکەی تەنیشتمانەوە. نەقیب بۆلین چاودێری پرۆسەی ئاڵۆزی بەستنەوەی دەستەکانمی کرد و پاشان چووە لای ئەوان. دەرگا بە نیوە کراوەیی مابۆوە. هەر سێکیان مشتومڕێکی کورتیان کرد. لە جووڵەکانیانڕا دیار بوو سرپیتر دەیەویست شەفاعەت بۆ من بکات بەڵام وا دیار بوو چەندان سەرکەوتنێکی بە دەست نەهێنا بوو. لێ نەگەڕان بچمە لایان. لە درزی دەرگاکەوە قیژاندم:

_چ باس و خەبەرە؟

لە ژوورەکە هاتنە دەرێ و سرپیتر بە لە سەرەخۆیی گوتی: _وا دیارە چ کارێکیان بە من نییە، بەڵام کاریان بە تۆ هەیە.

پاشان ئێمەیان برد. هەتا ئەمڕۆیشی لەگەڵدا بێ نەمزانی چ شتێك بوو بە هۆی ئەوەی ئەوە لە مێشکی خۆی وەدەرنێ کە، دەستبەجێ بمکوژێ. ئایا ئاخاوتنەکانم ئەوی هۆشیار کردەوە کە، بە کوشتنی پەیامنێرێکی بیانی دەکەوێتە بەر چ بەرپرسیارێتییەك، ئەویش لە نێو باڵەخانەیەکدا کە ئاڵای بەریتانیای بە سەردەوەیە، یان ئەو خاوەن شکۆیەی کە بەرخی سوور و وێنەی رووتی هەبوو، دواجار قەناعەتی هێنا کە، ناوبژیوانی بکات؟ ئەو ئەندێشەیەی کە، مرۆڤ وا لێ دەکات ژیانی خۆی قەرزاری چەند وێنەیەکی قێزەونی رووت بزانێ، بە راستی کە ئەندێشەیەکی بەرز و شکۆدارە.

# ٦

ئێمەیان بردە دەرەوە و سواری ئوتومبێلیان کردین. دەستەکانی منیان بەستبۆوە بەڵام دەستەکانی سرپیتر، نا. تۆماس بۆلین ون ببوو. ئوتومبێل بە ڕێ کەوت. لەو لاتری پێچی جادەکە، کۆمەڵێك سەرباز پێشیان پێ گرتین. بە مست کەوتبوونە وێژەی جامی ئوتومبێلەکە و دیار بوو ئامادەییان تێدا هەبوو ورد و ئەنجنمان بکەن. بەڵام نەقیب بۆلین هێوریانی کردەوە کە، ئەمە کارێکی دروست نییە و، درێژەمان بە ڕێگا دا. لە پێش بنکەیەکی پۆلیس ڕاوەستاین. ئاڵایەکی نوێیان بە ڕەنگی سوور- زەرد- سوور، لە پێشەوە ڕا، بە سەر دارێکەوە چەقاند بوو. نەقیب بۆلین و ئەفسەرە قەڵەوەکە، لە ئوتۆمبێل دا بەزین. من وسرپیتر ناچار بووین لە نێو ئوتۆمبێلەکە دا بمێنینەوە و ئەو ئەفسەرە گەنجەی دەستەکانی بەستبۆوە چاودێریمانی دەکرد. دوو کاتژمێرێك لە چاوەڕوانیدا ماینەوە. هەتاو دەدرەوشایەوە و دنیا زۆر گەرم بوو. لە بیرم نایێ لە بارەی چییەوە قسەمان دەکرد، وا بزانم زیاتر هەڵیت و پەڵیتمان دەگوت. لە هەموو ئەو ماوەیە دا، وێنەی ئەو کەسانەی لە ژێر ئەشکەنجەدا بوون بە بەر چاومدا دەهات کە، لە نێو کتێبەکەمدا باسم لێیانەوە کرد بوو. بە زمانی ئینگلیزی لە سرپیترم پرسی، بە پێی ڕێککەوتنەکەمان، ئایا ئەو نوسخەیەی لە کتێبەکەم کە، بە دیاری پێشکەشیم کرد بوو، لە نێوی بردووە یان نا. لە وڵامدا گوتی دڵی نەهاتووە کارێکی وا بکات. بە زیانم بوو. بە سرپیترم گوت: "لە تەنیا شتێك کە دەترسێم ئەوەیە ئەشکەنجەم بدەن". سرپیتر گوتی: "باوەر ناکەم ئەشکەنجەت بدەن" پێم وا بێ هەر بەو نییەتە ئەو قسەیەی کرد کە، کاتێ ئەو جەنگاوەرە

بریندارەکە لە منی پرسی دەیکوژن یان نا ولآمیم دایەوە، نا، ناتکوژن. پاشان سرپیتر چەند دێڕێکی لە شیعرەکانی "سوینبۆرن" کە دەیزانی زۆرم حەز پێیە بۆمی خوێندەوە. هەر ئەو دێڕانە لە یەکەم لاپەڕەی بیرەوەریەکانیدا، کە لەم دواییە چاپ کرا، دەبیندرێ.

**"دوعا بکە کە، بەر لە مەرگ، ڕۆژەکانی تەمەنت درێژ بن**

**پڕیش بن لەدڵئارامی و شکۆ، چونکە لە دوای مەرگ**

**نە ئارامییەك هەیە و نە لەدایکبوونێکی تر**

**چیدیش لە بینینی کازیوەیەکی تر را نامێنی**

**ئەو جێیەش کە بۆی دەچی، هیچ ڕۆشناییەکی لێ نییە**

**بژی و لە تەواوی ڕۆژەکانی تەمەنت چێژ وەرگرە.. ئەو جا بمرە**

**کاتێك مەرگ لە ڕێگاوە دەگات، دڵ مەسپێرە بە ترسی سەرە مەرگ**

**ئەوەکا بەر لەوەی ساتی مەرگت بێت، ژیانت لێ بشێوێنێ"**

سرپیتر زۆر لە سەرەخۆ دەئاخاوت. ئەفسەرە گەنجەکە بە سەر سوڕمانەوە لێی رادەما. لێی تێگەیشتم کە، وا دەزانێ ئەمەیش جۆرێکە لە سرووتی ئایینی دوا ساتەکانی ژیان. پاشان لێکدییان دابڕاندین. بۆلین و ئەفسەرە قەڵەوەکە گەڕانەوە و سرپیتریان لەگەڵ خۆیاندا برد. قەت بە بیرم دا نەهات ئەمە دوا جارەو هەرگیز جارێکی تر نایبینمەوە. بەڵام ئەوەی دەست بە جێ لەگەڵ من کردیان ئەوە بوو لە ناو شەقام، سەرەتا وێنەیەکیان لە بەرامبەر لێ گرتم و پاشان وێنەیەك لە تەنیشتەوەمڕا. کۆمەڵە کەسێك لە دەوروبەرم راوەستا بوون و گاڵتە و قەشمەرییان پێ دەکردم. سووکایەتییەکی زۆر گەورە بوو، بەڵام هێشتا دەنگی سرپیتر لە نێو گوێچکەکانمدا دەلەرایەوە:

**"...ئەو جا بمرە**

**کاتێك مەرگ لە ڕێگاوە دەگات، دڵ مەسپێرە بە ترسی سەرە مەرگ."**

ئەو شیعرە ئارامبەخشانە زۆر دڵنەواییان دامەوە و، لە دەروونمدا هەست بە بالآتر بوون، هەستێکی وەك شکۆمەندییەکی وروشێندراو سەری هەڵدا. پاشان بردیانم بۆ بنکەی پۆلیس. کاتێ بە پێش حەوشەی بیناکەدا تێدەپەرین، ئەفسەرێکی فاشیستی مستێکی لە سینگم داو بە شاگەشکەییەوە هاواری کرد: "روسی، رووسی!" ڕێك وەکو ئەو منداڵەی یەکەمجار دەچێتە باخچەی ئاژەڵان و دەقیژێنێ: "تیمساح، تیمساح!" پێم گوت رووسی نیم، بەڵام باوەڕی نەکرد. بە تەوسێکەوە پێکەنی و گوتی: "هەر ئەمشەو دەتنێرینە دۆزەخی مۆسکۆ". منیان بردە

ژوورێکی چۆڵ و پان و بەرین. لە گۆشەیەکی ژوورەکە، چوار پایەکی لێ بوو فەرمانیان پێدام لە سەری دابنیشم. دوو پاسەوانی مەدەنی، لە بەرامبەرم، لە پاڵ دەرگا دانیشتن و تفەنگەکانیان نایە سەر رانیان. ماوەیەك لەم بارودۆخە دا ماینەوە. دواتر قیژ و هۆڕێك لە حەوشەکەوە بەر گوێم کەوت، دواتر گەنجێکیان هێنایە ژووریّ کە، لە پشتی و سینگی رووتی خوێن دەچۆڕا. دەموچاوی جیّ جیّ برا بوو، درا بوو و ورد وخاش کرا بوو. بۆ ساتیّ وامزانی شەمەندەفەرێك بە هەموو فارگۆنەکانییەوە بە سەریدا رەت بووە و ئەمان دەریان هێناوە. بن هەنگڵیان گرتبوو و بە نێو ژوورەکەدا رایان دەکێشا. هاتو هاواری بوو، دەگریا و هاوار و ناڵەی دەکرد. ئەو فالانژیستانەی ئەویان رادەکێشا بە دەنگێکی نەرم پێیان دەگوت: "کوڕی باش، چیدی نامانەویّ لێت بدەین". دەرگا داخراو، ساتیّ دواتر دیسان دەنگی لێدان و شەق تێهەڵدان و دەنگە دەنگی تر بەرزبۆوە. پیاوەکە دەیناڵاند و جار بە جار دەیقیڕاند. قیژاندنەکانی ناوە ناوە بوو. چەند چرکەیەك بێدەنگی باڵی کێشا. ئەوەی دەمبیست هەناسە دانێکی خێرا و خشدار بوو. نازانم لەو چەند چرکە دا چییان لیّ دەکرد. دواتر چەند قیژەیەکی تیژ و ناناسایی و بەرزی لیّ هەڵسا. پاشان بێدەنگ بوو. پاش کەمێك لە ناکاو دەرگا کرایەوە و ئەویان لەو ژوورەی منی تێدا بووم پەلکێشی دەریّ کرد. نەمزانی مردووە یان لە هۆش خۆی چووە. لە حاڵێکدا نەبووم زۆر لێی ورد ببمەوە. پاشان قوربانییە دووهەمەکەیان بردە هەمان شوێن. تا هەمان شت بە سەری ئەویش بێنن، ئەو جا سێهەمی... هەر جارێکیش بە پاڵم دا تێپەر دەبوون بە شێوەیەك سەیریان دەکردم وەك ئەوەی قوربانیی دواتر من بم، بەڵام هیچیان نەدەگوت. لە دوای سێهەمییەکە، کەسی تریان نەبرد. بیّ جووڵە و چاوەڕوان دانیشتم.

وا پێدەچوو پاسەوانە مەدەنییەکان، کە لە بەرامبەرم دانیشتبوون، لە بەرامبەر ئەو رووداوانە دا هەستێکی ناخۆشیان لە لا دروست بووبیّ. لە حاڵەتێکدا کە، لە ژوورەکەی تەنیشتماندا ئامادەکاریی ئەشکەنجە بەر قەرار بوو، ئەوان چاویان بە دیقەت لە سەر من بوو تا کاردانەوەم ببینن و پێدەچوو، هەستی بەزەییشیان بەرامبەر بە من کەمێك جووڵا بیّ. کاتێك قوربانیی سێهەمیان بە مردوویی، یان بە بیهۆشی گەڕاندەوە، پاسەوانە مەدەنییە بە تەمەنترەکە، سەیرێکی منی کرد و شانێکی هەڵتەکاند، کە جووڵەیەکی بێئاگایی بوو بۆ داوای لێبوردن. ئەو جووڵەیە هەموو هەڵکڕاندنی پاسەوانێکی تەمەن پەنجا ساڵە بوو لە هەمبەر ژیان دا. کەسێك کە لە لایەك سی ساڵ پێشینەی خزمەتکردنی لە وڵاتێکی دواکەوتووی سەدەی ناوەڕاستدا هەبوو، لە لایەکی تریش لە وانە بوو خاوەنی هاوسەرێك و چەند منداڵێکی نیوە

برسی و کەنارییەکی مالێکراو بێ. لە توێی ئەو جوولەیەدا، سەر لە بەری فەلسەفەکانی مرۆڤی، دەربارەی شەرم و رادەستبوون و خەمساردی و کار ناتێکەری لە خۆ دەگرت. دەتگوت دەڵێ: "دنیا ئاوهایە، نە من توانای گۆڕینیم هەیە و نە تۆ..." ئەو شان هەڵتەکاندنەی پاسەوانە مەدەنییەکە زۆر زیاتر لە فیزاح و هاواری ئەشکەنجە دراوەکان لە نێو زەینی مندا بە زیندویی ماوەتەوە. ماوەیەکی درێژ- چەندین کاتژمێر، لە راستیدا لە وانەیە دوو کاتژمێر، لە وانەیە سێ یان چوار کاتژمێر- لە سەر ئەو تەپلەکە چارپایەیەی گۆشەی ژوورەکەدا دانیشتم. هەوڵەکەم نیو سعاتێکی خایاند تا جورئەتێك بدەمە خۆم و هەستمەوە و هاتوچۆیەك لە ناو ژوورەکەدا بکەم. سەرەتا پاسەوانە مەدەنییەکان هەندێ پرتە و بۆڵەیان لێوە هات و من سەرلە نوێ دانیشتمەوە. بەڵام دوای نیو سعات یان زیاتر، جارێکی دی هەستامەوە. ئەمجارەیان چیدی نارەزاییان دەرنەبڕی. جگەرەیان دەکێشا و قسەیان دەکرد. پلانێکی دارێژراوم لە ناو مێشکمدا، بە پشوو درێژی و کەللەرەقیی زیندانییەکی کۆن و خاوەن ئەزموون، سەرا و بن دەکرد. شتێکی سەیر، مرۆڤ چەند بە خێرایی ئەو رێگایانە دەدۆزێتەوە. لە بیرم دا بوو، هەر وا کە لە ژوورەکە دا هاتوچۆم دەکرد، سرنجەکان، دوو دەرزی و لوولە پڕ لە دەنکە حەبەکانی مۆرفین، بە هێواشی لە نێو قووتووەکانیان دەربێنم و هەریەکەیان لە شوێنێکدا لە ناو جلەکانم بشارمەوە. هێدی هێدی و بە پشوو درێژی توانیم ئەو کارە ئەنجام بدەم. سرنجەکەم خستە نێو پاکەتی جگەرە و دەرزیەکانیشم لە نێو قۆڵی چاکەتم و لوولەی دنکە حەبەکانی مۆرفینیشم لە نێو دەقی دەسەسرێکدا خستە نێو گیرفانی پشتەوەی پانتۆڵەکەم. پاشان داوام کرد بمبەنە دەستشۆیی. بۆ تواندنەوەی حەبەکان پێویستیم بە کەمێك ئاو هەبوو. پاسەوانەکان دوای راوێژێکی کورت رازی بوون. رێگایان دا دەرگا دا بخەم بە مەرجێ سەقاتەکە دا نەخرێ. دەستشۆییەکە، بە راستی ئیسپانی بوو: هیچ بەلووعەیەکی ئاو لە ئارادا نەبوو. تەنیا چاڵەیەکی هاکەزایی پیس هەبوو لە سەر عەردەکە. ویستم سرنجەکەی لێ پڕ ئاو بکەم بەڵام بێزم بۆوە و لێ گەڕام و هاتمە دەرەوە. دنیا تاریك دا هاتبوو کاتێ نەقیب بۆلین و هاوڕێ قەڵەوەکەی گەڕانەوە. منیان بردە حەوشەکە و نەقیب بۆلین فەرمانی دا بە وردی هەموو گیانم بپشکنن. دوو سەرباز بۆ ئەو کارە تەرخان کران. سەرەتا هەموو گیرفانەکانمیان بە تاڵ کرد. ئەفسەرە قەڵەوەکە، جزدانەکەمی پشکنی. هەموو ئەو کاغەزانەم سووتاندبوو کە، لە وانە بوو مەترسییەکم بۆ دروست بکەن و، ئێستایش لە نێو ئەو جزدانە دا کەمێك پارە، چەند بەڵگەیەکی تایبەتی و دوو برووسکە هەن، لە سەرنووسەری بەشی دەرەوەی رۆژنامەی نیوز کرونیکل لە بارەی هەندێ شتی تەکنیکی کە،

لەگەڵ کۆمەڵێك راسپاردەی تر، داوای کرد بوو هەموو وێنەکان بە پۆستی ئاسمانیی بنێرم. ئەفسەرە قەڵەوەکە پرسی: "مەبەستی چ جۆرە وێنەیەکە"؟ بە سەرسوڕمانەوە وڵامم دایەوە: "ئاشکرایە، وێنەکانی تایبەت بە رۆژنامە" بە سووکایەتییێکەوە پرسی: "لە کەنگینێوە بۆتە باو، ئەم جۆرە وێنانە بە پۆستی ئاسمانیی بنێرن؟" وەکو زۆرێك لە ئەفسەرەکان، گیرۆدەی فۆبیای سیخوڕی ببوو. بەد گومانییەکی تێکەڵ بە کاڵفامیی و زۆڵیی، ترسناکترین تێکەڵاوەیەکە لەو خەسڵەتانەی لە وانەیە مرۆڤێك هەیبێ. بۆم دەرکەوت مشت و مڕ کردن لەگەڵ ئەو بێ ئەنجامە، بۆیە تەنیا شانەکانم هەڵدەتەکاند و بۆ خۆ لادان لە هەر کێشەیەك ئەم کارەشم لە خەیاڵدا ئەنجام دەدا. ئەو جا ئەوەی چاوەڕوان دەکرا رووی دا. ئەو سەربازەی قۆڵی چاکەتی دەپشکنی بە راچڵەکینەوە قیژەیەکی لێ هەڵسا و بە خێرایی پەنجەی گەورەی دەستی بەرە و لێوەکانی برد. دەرزییەکە لە پەنجەی چەقیبوو. لە کاتێکدا بە ترس و توڕەییەوە قومی لە پەنجەی دە دا گوتی: "شتێکی نووك تیژی لە نێو قۆڵی چاکەتەکەی دا شاردۆتەوە". دەرزییەکەم دەرهێنا و لە حەوشە نیوە تاریکەکە دا بەرزم کردەوە. ئەفسەرە قەڵەوەکە چەند هەنگاوێك بۆ دواوە کشایەوە و هاواری کرد: "ئەمە چیە"؟ بۆلینیش وەکو ئەو، پاشە و پاش کشاوە. هەموویان باوەڕیان کرد بوو ئەوەی دەبینن لە و جۆرە دەرزییانەیە کە ژەهری ماری هیندی تێدایە وەك ئەوەی لە فلیمەکانی پۆلیسی دا دەیبینن. بێگومان ساتێکی بە هەیبەت و خۆش بوو. فەرمانیان دا دەرزییەکە لە نێو قاپێکدا دا بنێم، چونکە کەسیان نەیاندەویست دەستی لێ بدەن. دواتر پاکەتی جگەرەمیان پشکنی و سرنجەکە دۆزرایەوە. دەسەسڕەکەیان دیتەوە و حەبەکان ئاشکرا بوو و دواجار خۆم، لە سەر ویستی خۆم دەرزی دووهەمم لە نێو قۆڵی چاکەتم دەرهێنا. بە ئاشکرایی پێمەوە دیارە مەترسیدارترین کەسێکم کە، پێی نابێتە سەر خاکی ئیسپانیا. ماتا هاری و مادام ئیکس لە چاو من کەسانێکی نە شارەزا و بێ ئەزموون و بێ دەسەڵات بوون.. بۆلین پارەکەمی ژمارد، کاغەزێکی بەم ناوەڕۆکەی پێ واژوو کردم:

"پشتراست دەکەمەوە لە کاتی دەسگیر کردنمدا ٧٠٠ فرانکی فەرەنسی و ١٥٠ پستا پارەم پێ بوو". کاغەزەکەی خستە گیرفانی. واتای ئەم کارەی ئاشکرا بوو. بۆلین بەم شێوەیە دەیویست بەڵگەیەکم لێ وەربگرێ تا لە دوای مەرگم ئەو راستیە پشت راست بکاتەوە کە، هەموو هەڵسوکەوتەکانی زۆر رێك و دروست بووە. سەرەڕای ئەمەش، هەندێ وردە پارەی کاتالۆنیم پێ بوو کە، لە سنووری ژێر دەسەڵاتی یاخیبووان نرخێکی نەبوو.

بۆلین گوتی: "هەڵیانگرە، ئەمشەو کە، بەرە و بەهەشت دەچی لەوانە یە بۆ کریّ بە کەڵکت بێن".

داوام کرد لێگەڕێن قەڵەم پاندانەکەم لای خۆم بپارێزم.

وڵامی دایەوە: "ئەمەیان ئیدی لە بەهەشت هیچ سوودی لیّ وەرناگری" قەڵەمەکەی دایە هاوڕیّ قەڵەوەکەی و ئەویش بە خۆشحالییەوە لە نێو دەستیدا سەرا و بنی دەکرد. ئەم قەڵەمە دیارییەك بوو هاوسەرەکەم پێشکەشی کرد بووم. من زۆر بایەخ بە یادەوەری و یادگاری نادەم بەڵام ئەمە ئازاری دەدام کە قەڵەمە کۆنەکەم- هەر ئەو قەڵەمەی لە نووسینی یەکەمین کتێبم لە بارەی ئیسپانیاوە بە کارهێنا بوو- وەك قەرەبوویەکی جەنگیی بکەوێتە دەست ئەفسەرە فاشیستەکانەوە. کاتیّ هەموو گیانمیان پشکنی، تەنیا شتێك کە بۆم مایەوە، کاتژمێرەکەی دەستم بوو لە بەختی باشم ئەویان نەبینی. منیان گەڕاندەوە نێو هەمان ژوور کە ئێستا تاریکی دایگرتبوو، دیسان چەندین کاتژمێر لەویّ مامەوە. بەو پەڕی نا ئۆمێدییەوە لە نێو ژوورە تاریکەکەدا هاتوچۆم دەکرد و تفەنگەکانی پاسەوانە مەدەنییەکان دەتگوت هەتا ناو چاوەکانم درێژ ببوونەوە. لە بەیانی تا ئەو کات هیچ شتێکم نەخوارد بوو، کە چی برسیشم نەبوو. نزیك کاتژمێر دەی شەو، ئەفسەرێکی پلە بچووك هات و فەرمانی دا سواری لۆریم بکەن. پێنج کەس کە تفەنگەکانیان نابووە سەر رانیان لە پشتەوەم دانیشتن. بە بیرکردنەوە و بۆ چوونی خۆم گەیشتمە ئەو ئەنجامەی دەمبەن گوللە بارانم بکەن. لۆرییەکە بەڕیّ کەوت. شەقامەکانی مالاگای رووخاو، وەکو بەریّ، تاریك بوون. سەربازەکان لە هەموو شوێنێك دامەزرا بوون. مۆرەکان بە جامانەی سەوز و لۆچداریان و، فالانژیستەکان و، کەسانی سەر بە بە تالیۆنی بیانییەکان. بەڵام هیچ سەربازێکی ئیتالیایی بەر چاو نەدەکەوت. دیار بوو رێبەرانی یاخیبووان بایەخیان بەوە نەدەدا کە رزگار کەرانی میللەت، بە بەر چاوی مەدەنییەکاندا خۆیان دەر بخەن. بە هەرحاڵ، دانیشتوانە مەدەنییەکان وایان پیّ باشتر بوو بە بۆنەی ئازادییەکەیان لە پشت دەرگا و پەنجەرە داخراوەکاندا ئاهەنگ بگێڕن. تێپەر بوونی لۆرییەکەی تایبەت بە زیندان، قەشمەری و هۆ هۆی بەردەوامی سەربازەکانی لەگەڵ دا بوو. هەوڵمدا بزانم لە کوێی شار داین- وام دەزانی گوللە بارانکردن وەك ئەوەی باوە، لە گۆڕستان ئەنجام دەدریّ و، وەکو شێت، قومم لە دوا جگەرە ئینگلیزییەکەم دەدا. لەو ساتەدا نە هەستم بە ترسێکی زۆر و نە هەستم بە هیچ شتێکی تر دەکرد. تەنیا ئارەزووم هەر ئەوە بوو تا زووە ئەم کارە، بیّ ئەشکەنجەدانم کۆتایی پیّ بیّ. لێکم دەدایەوە رەنگە لە نێو تاریکیدا نەتوانن باش نیشانە بگرن، بۆیە لە وانەیە لە

بەرامبەر گلۆپەکانی لۆرییەکەدا رامگرن، یان هەر لەگەڵ دابەزینمدا بە گوللەیەکی دەمانچە کۆتایی بە ژیانم بێنن. ئەم رێگای دوایە، وەك باشترین رێگای مردن بە زەینمدا هات بەڵام لە رووی خورافە پەرستییەوە جورئەتم نەکرد دڵ بەو ئومێدە خۆش بکەم. سەرەنجام، دڵ و جورئەتێکم دایە خۆم و ئەو ئەندێشانەی لە ناو مێشکمدا گێنگڵیان دەدا رووبەڕووی سەربازێکم کردەوە. راستگۆییەکەم لە ناو ئاخاوتنیدا هەست پێکرد، کاتێ گوتی جارێ گوللە بارانکردن لە ئارا دا نییە و دەیانەوێ بمبەنە زیندان. پاشان، بە ئاگری جگەرەکەم، جگەرەی خۆی دەگیرساند و رووی لە سەربازەکەی پشتییەوە کرد و گوتی: "ئەم کابرایە وا دەزانێ، راست دەیبەن گوللە بارانی بکەن". ئەو سەربازەی کە نەیدەبینی، بە قۆشمەییەوە نەرِاندی بە سەرمدا و گوتی: "هەڵێت و پەڵێت دەڵێ! گولله بارانکردن هە وا بەم ئاسانییەش نییە کاکی خۆم". گەیشتینە زیندان و شوفێر زەنگی شەوی لێدا. لەوەیدا کە زیندان دەبێ زەنگی شەوی هەبێ کارێکی بە جێیە. بەڵام بە لای منەوە هەندێ سەیر بوو. دەرگایەکی گەورەی ئاسنی کرایەوە و بە نێو رێڕەوێکی درێژ و نیوە تاریکدا رۆیشتین و گەیشتینە نووسینگەی زیندان. سەر لە نوێ سەر تا پێمیان پشکنی و، لە سەریان کردم بێجگە لە جلی ژێرەوە، هەموو جلەکانم داکەنم. یەکێ لە فەرمانبەرەکان بە چەکوچێکی ئاسنی لە پاژنەی پێڵاوەمی دا و ئەوی تریان پەنجەکانی دەستی وەکو شانە بە نێو قژی سەرمدا هێنا. چونکە لە قەیتانی گۆرەوی بێزار بووم گۆرەوی بێ قەیتانم لە پێ دەکرد و فەرمانبەرەکە لێی پرسیم هیچ کاتێ خۆم لە شێوەی ژنان لێ کردووە یان نا. جارێکی تر، سەرەرِای پەستیم، زەردەخەنەیەك لێوەکانمی لێکدی کردەوە. فەرمانبەر لە نێو دۆسیەکەمدا نووسی: "گۆرەوی ژنانەی لە پێ بوو" کاتێ ئەو سەرقاڵی نووسین بوو، دەرفەتم بۆ رێك کەوت چاوێك بە دۆسییەکەمدا بخشێنم کە، لە سەر مێزەکەدا لە ژێر دەستی فەرمانبەرەکە کرا بۆوە. بۆلین بۆمی تێگوشیبوو. نووسرا بوو کە، من کەسێکی زۆر مەترسیدارم- وا بزانم ئەمەیان لە بەر دەرزییەکان نووسیبوو- و دەبێ زۆر بە وریاییەوە چاودێریم بکەن و جیا لە زیندانییەکانی تر رامگرن و لایەنی نێو نەتەوەییم هەیە، بە واتای ئەوەی سیخورِم. ئێستاش "گۆرەوی ژنانە" هاتە سەری. ئیدی بەڵگەکان تەواو بوون. سەرەنجام پەنجە مۆریان پێم کرد و، رێگەیان پێدام جلەکانم بپۆشم، بێجگە لە قایشی پانتۆڵم کە، لای خۆیان گلیان دایەوە. دواتر منیان بردە ژوورێکی تاکەکەسی یەکەمجار بوو گوێم لە دەرگای ژووری زیندان بێ کە، لە دیوی دەرەوە پێکدا بدرێ.



دەنگێکی ناشازە. دەرگای ژووری زیندان، نە لە ناوەوە و نـە لـە دەرەوە ڕا هـیچ دەسـك و دەستگیرەیەکی نییە و، ئەگەر قایم پێکـی دانـەدەیت دا نـاخرێ. نزیکـەی چوار پێـنج ئیـنج ئەستوورایيتی و لە پۆڵای یەکپارچە و کۆنکرێت دروست کراوە و هەر جارێ کە قەپات دەکـرێ دەنگێکی گـەورە دەداتـەوە، دەڵێـی گوللەیـەکت تەقانـدووە. بـەڵام تەقانـدنی ئـەم گوللەیـە دەنگدانەوەی نییە و کپ دەبێ. دەنگەکانی نێو زیندان بێ دەنگدانەوە و بێ پـەنان. یەکـەمجار، کە دەرگا بە سـەر زیندانیـدا پێکـدا دەدرێ، ئـەو لـە ناوەراسـتی ژوورەکەیـدا رادەوەسـتێ و سەیرێکی دەوروبەری خۆی دەکا. وا بزانم هەموو زیندانییەك ئەم کارە دەکەن. بەر لـە هـەموو شتێ، زۆر بە خێرایی لە دەرگا و دیوارەکانی رادەمێنێ و ئەو شتانەیش لە نێـو زەیـنی خۆیـدا دەکا بە لیست کە، دەکەونە نێو قەڵەمڕۆیە تازەکەیدا:

قەرەوێڵەیەکی ئاسن

تەشتی دەستشۆیی

ئاو دەست

پەنجەرەی شیش بەست

هەنگاوی دواتری ئەوەیە، شیشەکانی پەنجەرەکـە لـە نێـو دەسـتەکانی دا دەگـرێ و هـەوڵ دەدات خـۆی بـەرز هەڵکێشـێ و سـەیرێکی دەرەوەی ژوورەکـەی بکـات. سـەرکەوتوو نـابێ،

جلەکانیشی، لە خۆخشاندنیدا بە دیوار، گەچی و سپی دەبێ. دەست لە کەللە ڕەقی هەڵدەگرێ بەڵام بڕیار دەدا پڕۆڤەی زۆر بکات و لە خۆ بەرز کردنەوەدا خۆی بە هێز بکات. لە ڕاستیدا، هەموو جۆر بڕیارێکی شایانی ستایش وەردەگرێ: هەموو ڕۆژ بەیانیان وەرزش دەکات، خۆی فێری زمانێکی بیانی دەکات، بە کورتی لێ ناگەڕێ ورەی پێ بڕوخێنن. تۆز و خۆڵی سەر جلەکانی دادەتەکێنێ و درێژە بە سەفەرە دوژێنەرەوەکانی دەدات لە دۆر ماندۆری سنوورە بچووکەکەی- پێنج پێ درێژیی و چوار پێ پانی. تەختە ئاسنییەکەی تاقی دەکاتەوە. سپرینگەکانی شکاون، دۆشەکە فەنەریەکەی چاڵی تێ کەوتووە و سپرینگەکان لە جەستەی دەچەقێ، وەك ئەوەی لە سەر لەلووکێکی لە تێلی پۆلایی دروستکراودا رابکشێت. شکل و فەسالێکی جدی بە خۆیەوە دەگرێ، بڕیار دەدات بیسەلمێنێ کە پڕە لە بوێری و هێزی پشت بە خۆبەستن. دواتر نیگای دەچەقێتە سەر دەرگای ژوورەکەوە و دەبینێ چاوێك بە کونە ڕۆژنەکەی دەرگاکەوە نووساوە و چاودێری دەکات. چاوەکە، بە نیگایەکی سارد و بێ گیان زوومی کردووە بە سەریدا و گلێنەکانی زۆر کراونەتەوە. دەڵێی ئەو چاوە بە هیچ سەرێکەوە نییە. بۆ چەند ساتێ دڵی زیندانییەکە لە لێدان دەوەستێ. چاوەکە لا دەچێ و زیندانیی هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژێ و بە ناو لەپی دەستی ڕاستەی گوشارێکی بە هێواشی دەنێتە لای چەپی سەر سینگی و دواتر بە هەمان هێواشی دەیگوشێ. بۆ ئەوەی دڵ و جورئەتێك بداتە خۆی، بە خۆی دەڵێ: "دەی دەی، نەفامییە مرۆڤ ئەوەندە بترسێ. دەبێ لەو شتانە ڕابێی، ئەو فەرمانبەرەش بەو چاو تێڕینەی، تەنیا ئەرکی خۆی بە جێ دەگەیەنێ. ئەمەش بەشێکە لە زیندانیبوون. بەڵام ناتوانن بمترسێنن، قەت ناتوانن. ئەمشەو پارچە کاغەزێك دەخەمە نێو ئەو کونە ڕۆژنەیەوە..."

کە چی لە ڕاستیدا هیچ هۆکارێك ڕێگر نییە تاکو لە هەمان کات و دەمو دەست، ئەو کارە بکات. ئەم بیرۆکەیە ناو دڵی پڕ دەکات لە خۆشی و شادی. بۆ یەکەمجار ئەو شادییە وەکو سەودایەك بۆ چالاکبوون تاقی دەکاتەوە، ئەو شادییەی کە لەوەو بە دوا- بە بەرزی و نزمییەکی بەردەوام — بێ بڕانەوە جێی بە خەمۆکی و دڵتەنگی دەگۆڕێ و بە پێچەوانەوە. دواتر دێتەوە بیری کە هیچ کاغەزێکی لا نییە بیخاتە کونەکەوە. جووڵەی بێ ئاگایانەی دواتری- بە پێی بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکەی — ئەمەیە کە، تەلەفۆنێك بۆ پەڕاوگە فرۆشەکەی سەر کۆڵانەکەیان بکات یان بە خۆی بچێ و هەندێ کاغەز بکڕێ. ئەم جووڵە بێ ئاگاییە تەنیا دەمێکی کورت دەخایەنێ، ساتێ دواتر لە قورسایی و گەورەیی ڕاستەقینەی بارودۆخەکە دەگات. بۆ یەکەمجار، ئەو ڕاستییە تاڵ و ورە پڕۆکێنەرە بە هەموو ئازارەکانییەوە درك پێ دەکات کە، ئەو لەو دیو

دەرگایەکدایە کە، لە دیوی دەرەوە ، قفلّ دراوە. ئەمەیش تەنیا چەند چرکەیەك دەخایەنێ. ساتێ دواتر میکانیزمی بێهۆشکەر سەر لە نوێ دەکەوێتە کار و ئەو حاڵەتە نیوە هۆشیارییە پڕ بەزەییە کە، دەرەنجامی هەڵکشان و داکشانی بەردەوام و، دارشتنی پلانی قەڵپ و چنینی خەیاڵاتی بێ سەروبنە دەگەڕێتەوە. ئەم مرۆڤە کالفامە دەڵێ: "با بزانم لە کوێ بووم؟ ها، ئا، کاغەز کردنە نێو کونە رۆژنەکە. بێگومان رێگایەك بە دی دەکرێ هەندێ کاغەز پەیدا بکرێ".
ئەو "رێگا"یش هەر بەو "رێگایەك"ە لە فەزا دا هەڵدەواسێ. ئەو لەم جۆرە بیرکردنەوانەدا بە زوویی شارەزا دەبێ- یان باشتر وایە بڵێین ئەم جۆرە بیرکردنەوانە زاڵ دەبێ بە سەری دا. بۆ نموونە دەڵێ: " کاتێ لێرە بچمە دەرێ چیدی خەفەتی پارە کۆ کردنەوە ناخۆم. بە هەر چەرمەسەرییەك بێ دەیگوزەرێنم" یان: "ئەگەر لێرە بچمە دەرێ چیدی لەگەڵ هاوسەرم شەڕ ناکەم. هەر چۆنێك بێ پێکەوە پێکدێین". لە راستیدا، کاتێ ئازاد بکرێ هەموو شتێك "رێگایەکی" دەبێ بۆ پێکهاتن. ئەم راستییە، کە وا مرۆڤی زیندانی، بە سەر ئەم هێڵە کلێشەییەی بیرۆکەکان دا بڕوا و، هەروا کە ئاماژەم پێ دا لە دوای چەند رۆژ بە تەواوی بە سەر مێشکیدا زاڵ دەبێ، بەو واتایەیە کە دنیای دەرەوە رۆژ بە رۆژ زیاتر بۆ ئەو، راستیەکانی خۆی لە دەست دەدات. دنیای دەرەوە دەگۆڕێ بە دنیایەکی خەیاڵی کە تێیدا هەموو شت، بە جۆرێك دەبن بە راستی.

"لە کوێ بووین؟ ها، ئا، کاغەز کردنە نێو کونە رۆژنەکە. بێگومان دەکرێ بە شێوەیەك کاغەز پەیدا بکرێ. بەڵام رێگا دەدەن؟ نا، ئاشکرایە کە رێگا نادەن. ئەی بۆ بیری لێ بکەمەوە؟"با، لیستێکی تەواوتر لە شتەکانی ناو ژوورەکەم رێك بخەم. ئۆی، تەماشاکە، مێزێکی ئاسنی و کورسیەکیشی لێیە کە، سەرەتا نەکەوتە بەر چاومان یان نرخێکی ئەو تۆمان بۆیان دانەنا. دیارە کورسییەکە لە مێزەکە جیا ناکرێتەوە، پێکەوەیان لەحیم کردوون. مخابن. ئەگینا دەکرا لە باتی تەپڵە سوودی لێ وەربگیرێ و کاتی جل داکەندن، وردەواڵەکانی لە سەر دابنێیت وەك کتێبی گیرفانی، دەستە سڕ، پاکەت، شقارتە و..." بەڵام زیندانییەکە لە پڕ دێتەوە بیری نە کتێبی گیرفانی هەیە و نە دەستەسڕ و، پاکەت و شقارتەش لە گیرفانیدا نییە. دیسان میزاجی شێلوو دەبێ. هەرکە چاوی کەوتە سەر شێرەی دەستشۆییەکە، میزاجی سەر لە نوێ دەگەڕێتەوە سەر بارە ئاساییەکە"سەیرکە، ئاوی بۆڕیش لە نێو زیندان دا هەیە، ئاوها کە لە دەرەوە بیرمان لە زیندان دەکردەوە ئەوەندەش خراپ و بێ سەر و بەر نییە. تەختی خەوتنیش ئاسن و رەقە " قەیدی چیە، زۆر تەندروستی تریشە مرۆڤ لە سەر تەختێکی رەق پاڵ کەوێ"، تەشتێکی دەستشۆیی و مێزێك و کورسییەکیشی لێیە-

مرۆڤ لەمە زیاتر چی گەرەکە؟ دەبێ ڕا بێین بە سادەیی بژین: کەمێك وەرزش، کەمێك خوێندنـەوە و نووسین و فێر بوونی زمانێکی بیانی..."

سەفەرە دۆزەرەوەکەی دواتری بەرەو ئاو دەستەکەیە. "نۆی ، لە وانەیشی هەیـە- نـا، بـە ڕاستی زۆر خراپ نییە". سیفونەکە ڕادەکێشێ. کار ناکـات. دیسـان میزاجـی تێـك دەچـێ. کاتێك ئەو بیرۆکە ژیرانەیە دەکەوێتە ناو زەینی کە دەکرێ سەتڵێك لە شێرەکە پڕ بکات لە ئاو و بە تەوژمێکەوە بیکا بە ناو حەوزی ئاو دەستەکەوە و خاوێن بکرێتەوە، جارێکی تر میزاجـی دەگەڕێتەوە سەر بارە ئاساییەکە. کاتێ بۆی دەردەکەوێ شـێرەی ئاوەکـەش لـە کـار کـەوتووە دیسان میزاجی تێك دەچێتەوە. بەڵام کاتێ بە بیری دا دێ، دیارە لە کات و ساتێکی دیاریکراو دا لە ڕۆژ بۆڕییەکان پڕ ئاو دەبن و ئەوسا ئاو لە شێرەکە دێ، میزاجی چاك دەبێتەوە. میزاجی تێك دەچێ- میزاجی چاك دەبێتەوە، تێك دەچێ، چاك دەبێتەوە. بەم شێوەیە هەموو شتێ- لە خولەکەکان، کاتژمێرەکان، ڕۆژەکان، هەفتەکان، سـاڵەکانی داهـاتوو درێـژەیان دەبـێ. چـەند وەختە لە نێو ئەم ژوورە دایە؟ سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەکات: ڕێك سێ خولەکە. گوتم بـاوەڕم وایــە زۆربــەی زیندانییــەکان لــە یەکــەم دوو- ســێ خولــەکی ســەرەتای زیندانیبوونیانــدا هەڵسوکەوتێکی لەم جۆرە، یان شتێکی لەم بابەتە دەکەن. هەر چەندە بارودۆخەکـە سـەختتر و دژوارتر بێت بە هەمان ئەندازە کاردانــەوەی مرۆڤــی زینــدانیش لــە بەرامبــەردا کلێشـەییتر و تەقلیدیتر دەبێ. زۆربەی جارەکان ژیان لە ترۆپکی هەستیار بوونـدا کـەمتر لـە پووچـی و بـێ کەڵکی دوور دەبێ. لە ساتە بە حیساب گرنگەکانی ژیان هەموومان وەکو مـرۆڤ و کەسـەکانی نێو ڕۆمانە کورتەکاندا بایی دوو فلس هەڵسوکەوتی باش دەکەین. بەهای وشە لە نێو سـنوورە جیاوازەکاندا شاردراوەتەوە، لە بەرامبــەر بارودۆخــە واقیعییەکانـدا زمـان لـە ئاخـاوتن کـاڵ دەبێتەوە. کاتێك وەسفکردنی ڕاسـتییە ڕووتـە بێبایەخـەکانی ئاوهـا ترسـناك دێتـە ئـارا، لـە نموونەی ترسی مرۆڤ لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ مەرگ، زمانی دەگۆڕێ بـۆ ئەنـدامێکی ئـەو پەڕی بێکەڵکی جەستە. هێشتا پێنج خولـەك لـە هـاتنم بـۆ نێـو ئـەم ژوورە تاکـە کەسـییە تێنەپەڕیبوو، دەنگی تەقە تەقێك لە کونی کلیلێکی دەرگاکە بـەر گـوێم کـەوت و دەرگـا بـە توندی کرایەوە. لە نێو دەرگادا، دوو فەرمانبەری زیندان، کە پێشتر دیبوویانم ڕاوەسـتا بـوون. یەکێك ئەوە بوو کە، پشکنینی جەستەیی کرد بوو و، ئەوی دیکەشـیان ئـەو کـابرا هـیچ و پووچەی کە، حیکایەتی "گۆڕەوی ژنانەی" لە نێو دۆسیەکەمدا تۆمار کرد.

گوتیان: "Venga- وەرە"

نەوێرام بپرسم بۆ کوێ. جارێکی دیکەش بە نێو ڕێڕەوە درێژ و چۆڵەکەدا و، بە بەرامبەر ریزێکی نەبڕاوەی دەرگا داخراوەکانی ژووری زیندانییان دا تێپەر بووین. لە هەر لایەکی ڕێڕەوەکە، چاوێك بە کونی دەرگایەکەوە نووسا بوو. لە نێوان دوو ریز چاو تێپەر بووین- چاوە دەرپۆقیوە چاوەڕوانەکان، ئەو چاوانەی دەتگوت هی کەس نین. ئەو بەندیوانەی پشکنینی جەستەییمی کرد بوو شاد و کەیفساز بوو. دەستی بەرەو ئەم یان ئەو ژوور درێژ دەکرد و بە پەنجەی گەورەی رووە و خوارەوە ئاماژەی دەکرد و دەیگوت: "بەنگ، بەنگ، سوور، سوور، چەند سوور؟ سبەی هەمووتان فت دەکرێن"

چاوەکان سەیریان دەکرد. لەو دیوی هەر کونێکی دەرگاوە گلێنەیەك هەبوو.

بەندیوان گوتی "ئەتۆش سبەی فت دەکرێی"

هەستم دەکرد ئەژنۆکانم شل و داهێزراون " پیاوی حوکمدراو، بێ هێز و بێ باوەڕ بە خۆ بوونە بە ڕێگادا دەڕۆیی". هەموو حوکمدراوەکان بێ هێز و بێ باوەڕ بە خۆ بوون بە ڕێگا دا دەڕۆن. ئەفرەت لەو کورتە رۆمانە دوو فلسییانە. لە کۆتایی ڕێڕەوەکەدا دەرگایەکی ئاسنی تۆڕدار هەبوو. فەرمانبەرەکە سەقاتەکەی- ترازاند و دەرگا تۆڕ دارەکەی پاڵ پێوەنا. لەو دیوی دا، ڕێڕەوێکی کورتتر هەبوو کە، لەوێشدا چەند ژوورێك هەبوو. ژووری تاکە کەسیی. دەرگای یەکێك لەو ژوورانە دانەخرابوو. مستێکیان لە پشتم دا و فڕێمیان دایە نێو ئەو ژوورەوە و جارێکیتر، دەرگا لە سەرمدا بەیەکدا درایەوە. شتومەکەکان هەر ئەوانە بوو کە، لە ژوورەکەی پێشترمدا هەبوو. بەو جیاوازییەی پەنجەرە شیشکوتکراوەکە هەندێك بچووکتر و کەمێکیش لە هەورازتر بوو. سەرلا دیوارەکەی هنداو تەختە ئاسنینەکە، پڕ بوو لە پەڵە خوێن. پێدەچوو خوێنەکە تازە بێ، چونکە هێشتا بۆن ترشاوییەکی سووکی دەدا. بۆنم کرد، ئیلنجم هاتەوە. هەستم کرد زۆر بەختەرەش و بێچارەم. لە سەر قەرەوێڵەکە پاڵ کەوتم. نە دۆشەکێك لە "کا" لە سەر تەختەکە هەبوو، نە بەتانییەك. زۆر سارد بوو. خەریك بوو رەق هەڵدەگەڕام و شیشە ئاسنینەکانی قەرەوێڵەکە جەستەمیان ئازار دەدا و بۆن ترشاوەکەیش ناو مێشکمی پڕ کرد بوو. کونی ئاودەستەکە گیرا بوو و بەلوعەی ئاویش لە کار کەوتبوو. لە پەنجەرەکەوە دەنگی تاکوتەرا تەقە بەر گوێم دەکەوت، دواتریش رێژنەی بە دوای یەك و، دیسان تاك و تەرا تەقەو، هاتو هاوار و قیژی ناوە ناوەیش. هاوارەکانی بەر لە مەرگ کە، پڕ بوون لە ئازار و ژان بە نێو گوێچکەکانمدا تا ناو مێشکم دزەیان دەکرد و ماوەیەك دوای ئەوەی هاواری کەسەکە بۆ هەمیشە کپ دەبوو، دەنگدانەوەی فیزاح و هاوارەکەی هێشتا لە ناو سەرمدا دەزرینگایەوە.

دەبوایە دیسان بڕشێمەوە. لە سەر تەختەکە پاڵ کەوتمەوە، لە قۆناغی ئەو پەڕی بێچارەییمدا بوم. لەگەڵ خۆمدا بیرم دەکردەوە: "ئێستا ئیدی هیچ نیت، بێجگە لە کەسێکی بێچارە". نەمتوانی بەر لە پێکەنینە تاڵەکەم بگرم. هاتەوە بیرم قایشەکەمیان گل دایەوە، بەڵام هێشتا بۆینباخەکەم هەبوو. بە سەر تەختەکەوە، چنگاڵێکی ئاسنی تایبەت بۆ هەڵواسینی جل هەبوو، بیرم بۆ ئەوە چوو باشترین ڕێگای کۆتاییهێنان بەم نیکبەتیە ئەمەیە. چنگاڵەکە هەندێك نزم بوو، بەڵام هاتەوە بیرم کە، زۆر جاران لە ڕۆژنامەکاندا دەمخوێندەوە، سکرتێرە بە نێو ساڵداچووەکان، کاتێ ئیشەکانیان لە دەست دەدەن وا بە باشتر دەزانن خۆیان بە دەستگیرەی دەرگاوە هەڵواسن. ئەو چەنگاڵەش بە هەرحاڵ لە دەستگیرەی دەرگا خۆ نزمتر نەبوو. تاقیکردنەوەیەکم کرد، بەڵام پێمابوو بە هیچ شێوەیەك ئەمە ڕێگە چارەیەکی لە بار نییە و، پەشیمان بوومەوە. دوای ئەوە، هەستم بە ئارامییەکی نا ئاسایی کرد. خۆشحاڵ بووم لەوەیا کە، لە نێو ژوورێکی تاکە کەسیی زینداندا هێشتا هەناسە دەدەم. هەستم کرد زۆر خەوم دێ و بیرم لە هیچ شتێکیتر نەکردەوە. تا دەمەو بەیان زۆر بە قووڵی و بە ئیسراحەت خەوتم. کاتێ واگا هاتم نەمزانی لە کوێم، کاتێکیش هاتەوە بیرم لە کوێم هیچی لە وەزعەکەم نەگۆڕی. تروسکایی ڕۆشناییەکی مات و کپ، لە پەنجەرە دووکەلاوییەکە، بە حاڵ دەکەوتە ژوورێ. بێ دەنگییەکی قورس بە سەر کەشەکەدا زاڵ بوو. تەنیا لە نێو زیندانەکاندا، هەوا ئەو هەندە پووچ و بەتاڵە. هەمیشە هەستان و دەرچوون لە ناو پێخەف لە بەیانییاندا تەکانێکی گەورەی دەوێ. ئەم بەیانییە هیچ شتێك نەبوو لە پێناویدا لە خەو هەستم. نە کارێك چاوەڕێمی دەکرد نە پلە و پایەیەك و نە ئەنجامدانی ئەرکێك. بۆ یەکەمجار ئەو هەستە سەیر و سەمەرەیەی ئازاد بوونم لە هەموو بەرپرسیارێتییەك تاقی کردەوە کە، یەکێکە لە خەیاڵە شێتانە و فریودەرەکانی نێو زیندان. بە سەر سپرینگەکانی قەرەوێڵەکەدا خۆم خستە سەر تەنیشت و بۆ ئەوەی هەندێ خۆم گەرم بکەمەوە پێیەکانم لە ناو سکم دا گرمۆڵە کرد و هەستم کرد وەکو ئەو منداڵەم لێ هاتووە لە ناوەڕاستی وانەکانیدا لە قوتابخانە هەڵاتبێ. ئەو سا دیسان خەوە کوتکە بردمیەوە. کاتێ واگا هاتمەوە، هێشتا ڕۆشناییەکە کز بوو. دەنگێك لە خەوی هەستاندبووم. گوێم ڕاگرت. کەسێك گۆرانی دەگوت. دەنگەکە دوور نەبوو. ئەو کەسەی ئاوازەکەی دەچڕی بێ گومان لە ژوورێکی بەرامبەرم دا بوو. لە سەر تەختەکەم دانیشتم و هەستم کرد دڵم لە لێدان ڕاوەستا: سروودی"نێو نەتەوە" دەچڕی. بە ئاواز و دەنگێکی خەمبار دەیچڕی. دیار بوو چاوەڕوانی ئەوە بوو زیندانییەکانی دیکەش هاوڕێیەتی بکەن لە چڕینی سروودە حەماسییەکەدا. تاك و تەنیا،

له نێــو ژوورێکــی تاکــه کهســیی، لــه نێــو بێــدهنگی زینــدان و تاریکــایی ترســناکی شــهودا دهیچریکاند. له بارهی زیندان و گرتووخانه ئهڵمانییهکاندا شتم خوێندبۆوه. لــهو نووســینانهدا، چڕینی سروودی"نێو نهتهوه" وهکو دهربڕینی نارهزایهتییهکی سیاسی یان دوا خۆپیشــاندان نــاو دهبرا. بهڵام وێرای ڕێزی زۆرم بۆ شههیده ئهڵمانییهکان، ههمیشه ئهم بهشه لــه نووســینهکاندا وهکــو کــارێکی میلــودرامی و تهحهمولنــهکراو بــه زهینمــدا دههــات. کــه چــی ئێســتا بــه گوێچکهکانی خۆم، دهنگ و ئاوازی کهسێکم دهبیست، که دهیزانــی ئیعــدام دهکــرێ ســروودی "نێو نهتهوه" دهچڕی. به هیچ شێوهیهك پێنهدهچوو له ژێر کاریگهری سۆزدا زێده ڕۆییکردنێك بکات. دهنگێکی خهمبار و نا هاوسهنگ و بێچاره و، شایانی بهزهیی و ســۆز خــۆی دهنوانــد. بڕگه بهندهکهی دوو سێ جار دوو پات دهکردهوه و رای دهکێشا بۆ ئهوهی زیاتر درێژه بکێشێ و گهڕانهوی بێدهنگی زیاتر دوا بخات. ههســتامهوه و لــه پشــت دهرگاکــه راوهســتام، ددانــهکانم وێکدهکهوتن، مستم به نیشانهی ڕێز و سڵاو، بــه هــهمان شــێوهی کــه، لــه گردبوونــهوهکانی ڤالنسیا و مهدرید فێر ببووم بهرز کردهوه. ههستم کرد له نێو ههموو ژووره تاکه کهســییهکانی دهروروبهرماندا، ئهوانیتریش، له پشت دهرگاکان راوهستاون و وهکو من، جــدی و پــڕ ههیبــهت، مــستهکانیان به نیشانهی ڕێز و سڵاو بهرز کردۆتهوه. دهنگی چڕینهکهی ههر دههات، دهمتوانی ئهو له بهر چاومدا به ردێنه نهتاشراوهکهی و دهمو چاوه تێکشکاوهکهی و چاوه له ئهشــکهنجه دهرپهڕیوهکانی وێنا بکهم. دهنگی چڕینی ههر دههات. تهحــهمول نــهدهکرا. چــهند خۆشــیمان دهویــست. بهڵام کهسمان له چڕینهکهدا هاوڕێیهتیمان نهکرد. ترسهکه له راده بهدهر زاڵ بوو.



یەکەم رۆژم لە نێو زینداندا دەست پێ کرد. یەکەم رۆژ لە کوێ سەد و دوو رۆژ. نە خواردنێکی بەیانی دیار بوو، نە دڵۆپێك ئاو دەموچاومی پێ بشۆم و نە شانەیەکیش قژمی پێ دابێنم. هیچ لە دەست نە دەهات بێجگە لەوەی چاوەڕێی بکەم. ژوورەکەم دەپێوا. شەش پێ و نیو بۆ هەوراز و شەش پێ و نێو بەرەوخوار. بە دژوارییەوە هەوڵم دەدا بیر لە شتە خۆشەکان بکەمەوە و هاودەمێکی باش بم بۆ خۆم. یەکەم شت کە بە زەینمدا هات، بڕگەیەك لە چیرۆکەکانی "ساندرز ئدگار والاز" بوو.

"...هەموومان دەبێ تەنیا یەك جار بمرین. من وەکو خۆم هیچ کاتێك دڵم بەم قسەیە خۆش نەبووە. ئەگەر مرۆڤ زیاتر لە جارێك بمردبایە لێی رادەهات، پیرە پیاو! لە مەبەستم دەگەی؟ ئەمە فەلسەفەیە". بە بیرمدا هات، ئەمە فەلسەفە بوو. لە دۆزینەوەی ئەم راستیە کە، بیرکردنەوە لە شتە وزە بەخشەکان و لە راستیدا، کونترۆلکردنی ئاراستەی خەیاڵ چەند کارێکی دژوارە، سەرم سوڕ دەما. ئەگەر کەسێك تەنیا بۆ ساتێك، جڵەوی خەیاڵەکانی ئازاد بکات، ئاراستەکە سەر بە خۆ، بە دیوێکی بەرەواژ دا دەسووڕێتەوە. پارچە شیشێکم لە قەرەوێڵەکە لێ کردەوە و دەستم کرد بە راکێشانی فۆرمۆل و هاوکێشەکانی بیرکاری بە سەر دیواردا. هاوکێشەیەکی سەختی شەلجەمیم شیکاری کرد بەڵام نەمتوانی هاوکێشەی هزلوولی بگەیەنمە ئەنجام. هاوکێشەکان ئەوەندە درێژ بوونەوە هەموو مەودای دیوارەکەی نێوان ئاو

دەست و حەوزی دەستشۆییان گرتەوە. وازم هێنا و سەیرێکی کاتژمێرەکەمم کرد. کاتژمێر یەك بوو. تازە هەستم کرد چەند برسیمە. بیست و نۆ کاتژمێر بوو هیچم نەخوارد بوو. کەللەیی بووم و دەستم دایە کوتانی دەرگای ژوورەکەم. سەرەتا بە مست و دواییش پێلاوەکانم لە پێ کردنەوە و بە پێلاو کەوتمە وێزەی دەرگاکەوە. لە فلیمێکی ئەمریکایی دیتبووم پیاوێك ئەم کارەی دەکرد. بە داخەوە پێلاوەکانی من لاستیك بوون. کەس بە دەنگمەوە نەهات. هەڵچوونم کز بۆوە و دیسان سارد بوومەوە. چاوم نووساند بە کونی دەرگاکەوە و سەیرێکی نێو ڕێڕەوەکەم کرد. تەنیا دەمتوانی بەشێکی کەم لە ڕێڕەوەکە ببینم. مەودای بینینم هەر ئەوەندە بوو بتوانم دەرگای بەرامبەرم ببینم. بەڵام پاش کەمێك توانیم دۆزینەوەی گەورە بکەم، کونە دەرگای بەرامبەرم، لە مەودای کاتیی دیاریکراو، بەردەوام ڕۆشن و تاریك دەبوو. چونکە ناو ژوورەکانی ڕووناکتر بوون لە نا ڕێڕەوەکە، کونەکە وەکو خاڵێکی سپی دەهاتە بەر چاو. کاتێ کونەکە تاریك دا دەهات دیار بوو زیندانییەکەی ژووری بەرامبەرم چاوی خستۆتە سەر کونەکەوە. بەڵام تەنیا تاریکبوونی کونەکەم دەدیت، نەمدەتوانی چاوەکە ببینم. مەودای نێوان کاتەکان لە چەند چرکەیەك تێپەڕیان نەدەکرد. دژوار بوو پیاو بتوانێ بەم ڕێکییە لە مەودای کاتەکاندا سەیری دەرەوە بکات، بگەڕێتەوە و دیسان سەیری دەرەوە بکات. ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێ ئیشارەتم بداتێ. منیش بە هەمان مەوداکانی ڕێك خراو لە لایەن ئەوەوە کەوتمە ئەوەی دەستم لە سەر کونە ڕۆژنەکەدا دابنێم و لای بەرم. پاشان ڕیتمی جووڵەی دەستم هێواشتر کردەوە، دواتر خێراترم لێ کرد، بەڵام ئەو ڕیتمەکەی خۆی تێك نەدا. ئەمجارەیان پەنجەی دەستم جارێ ئاسۆیی و جارێ ستوونی دەخستە سەر کونەکە. سێ جار وام کرد و وازم هێنا. چونکە هات بە زەینمدا کە هێمای خاچم وێنە کردووە. بەڵام کابرای ژووری بەرامبەرم هیچ کاردانەوەیەکی نیشان نەدا. ڕۆشنی و تاریکییەکە، هێشتا هەر لە سەر ڕیتمی جاران، بە شێوەیەکی دووپاتبوونەوە و بێزارکەر بە دوای یەکدا دەهاتن. گوشارێکی زۆرم خستە سەر مێشکم تا تێبگەم مەبەستی ئەو لە و کارەی چییە. باوەڕ ناکەم لە دەرەنجامی هاتن و چوونی ئەو بێ لە ناو ژوورەکەدا، چونکە مەوداکانی نێوان تاریکبوون و ڕۆشنبوونی کونەکە خێراتر لەوە بوو. لە پڕێکدا دۆزیمەوە، تێگەیشتم پیاوەکە چی دەکات. دەتگوت لە بەر چاومە. لە پشت دەرگای ژوورەکەیدا پێیەکانی لێك کرد بۆوە و سەری بەم لاو ئەو لادا خوار دەکردەوە. لای ڕاست، لای چەپ، لای ڕاست، لای چەپ، وەکو ورچێك سەری بلەقێنێ. بێگومان لەو پەڕی نا ئومێدی و بێزارییەوە بوو. دەرگای ژوورەکەم کوتایەوە. هەموو جۆر وێنەیەکم بە پەنجەکانی دەستم لە سەر کونەکە دروست کرد.

هیچ وڵامێکم وەرنەگرتەوە. دیسان میزاجم تێك چوو. سەر لە نوێ گەڕامەوە سەر قەرەوێڵەکە و پاڵ کەوتمەوە و خەوە کوتکە گرتمیەوە. هەوڵمدا بۆ خۆم شیعر بخوێنم. بەڵام مێشکم لە کار وەستا بوو و هیچ فەرمانێکی وەر نەدەگرت. دەوروبەری کاتژمێر چوار دەنگە دەنگێك لە ڕێڕەوەکەوە پەیدا بوو. دەنگێکی چەور، ناوی چل پەنجا کەسی لە سەر لیستێکدا خوێندەوە. دەرگاکان کرانەوە و پاشان پێکدادرانەوە. تەپە تەپی پێ، فسکە فسك و دەنگی پڕ ڕاز و ڕەمز. ئەمجارە لە باتی چاو، گوێچکەم بە دەرگاوە نا. تەنیا شتێك کە توانیم وەریبگرم ئەوە بوو، ریزێك پیاو کە پێیەکانیان بە دوای خۆیاندا ڕادە کێشا، هێواش و بە دوو دڵی بە ڕێڕەوەکەدا دەڕۆیشتن، وەك ئەوەی بە بێتاقەتی و ترس و بە ناویستی خۆیان بە ڕێگا دا بڕۆن. تەپە تەپی پێیەکان دامرکا. چل پەنجا پیاو هەنگاویان بەرەو مەرگ دەنا. لە سەر قەرەوێڵەکەم پاڵ کەوتمەوە و بیرم دەکردەوە ئەو پیاوەی سروودی دەچڕی، ئەویش لە نێویاندا بوو یان نا، تاك تاك گوللە بارانیان دەکەن یان کۆمەڵ کۆمەڵ، بە تفەنگ یان بە ڕەشاش. هێزی خەیاڵم، کە ئیدی لە ژێر فەرمانی من دا نەبوو، دیمەنەکەی دەرەوەی، بە هەموو شێوەکان، پەنجا یان سەد جار بۆمی دووپات کردەوە. گیرۆدەی وەسواسێك ببووم: لە کەللەمی دابوو، کە ئەگەر دیمەنەکان بە هەموو وردەکارەکانییەوە لە بەر چاوامدا وێنا بکەم لە توانامدا دەبێ پێش لە ڕووداوەکە بگرم، چونکە پێشبینیکردنی خەیاڵاوی ڕووداوێك، دەتوانێ ئەگەری ڕوودانی لە نێو ببات. بەڵام لە هەمانکاتیشدا- بێ لە بەر چاو گرتنی ئەو هاودژییەی هەبوو- وەسواسێکی تر ڕایدەکێشام و لە نێو خەیاڵدانی زەینمدا دیمەنی گوللە بارانکردنەکانم دووبارە و دووبارە دەکردەوە. وامدەزانی ئاوها مەرگیان بۆ ئاسانتر دەبێ. جۆرە ئومێدێکی نیمچە وشیارانەیش ئەو باوەڕەی لە لا دروست دەکردم کە ئەو هاو دڵییەی من لەگەڵ ئەواندا بێ پاداشت نامێنێتەوە و من لە پاداشتی هاو دڵییەکەمدا، بە سەلامەتی لێرە دەردەچم. لە هەموو ئەو ماوەیەدا بە بەردەوامی سەیری کاتژمێرەکەمم دەکرد و کاتژمێر پێنج بە خۆمم گوت: " ئێستا ئیدی ئەوان مردوون". دیسان بە بێدەسەڵاتییەوە لە سەر قەرەوێڵەکەم پاڵ کەوتمەوە، چاوەکانم دەکزانەوە، چاکەتەکەم بە سەر سەرمدا دا. خۆزگە بمتوانیبا بۆ مردووەکان و بۆ خۆمیش نزا بکەم و، بێ ئەوەی شەرم دامگرێ، سروودی "مارسیلیز" لە نێو قوڵی چاکەتمدا بخوێنم.

کەمێك پاش کاتژمێر پێنج، منیان لە ژوورەکەم بردە دەرێ. ئەو بەندیوانەی کە پێشتر نەمبینیبوو پرسیاری لێکردم کەسێك بە ناوی "میچێل" دەناسم یان نا، ئەگەر دەیناسم ئایا دەزانم لە کوێیە یان نا. زۆر بە نەرمی قسەی دەکرد. منی بردە نووسینگە. چەند فالانژیستێك

و ئەفسەرێك لە نێو ژوورەكە دانیشتبوون. بە دەنگێكی ماندوو و بێ ئومێد پێیانی گوت: "ئەمیش نازانێ ئەو ئینگلیزە لە كوێیە". ئەفسەرەكە فەرمانی دایە من و بەندیوانەكە، كە لە نێو زیندان بە دوای میچێلّ دا بگەڕێین. لەمەوە تێگەیشتم ئەوان تەنانەت لیستێكی تەواویان لە زیندانییەكان لا نییە. "سوور" بوون بە لای ئەوانەوە بەس بوو، ناو بە كەڵكی چی دێ؟ گۆڕە بە كۆمەڵەكان پێویستیان بە كێڵی قەبر نییە. كون و كەلەبەر و ڕێڕەوەكانی زیندان هەمووی گەڕاین. یەكەمجار سەرمان لە حەوشەكان دا، سێ چوار حەوشەی لێ بوو، هەمووی لێوانلێو لەو كەسانەی چاوەڕوانی گوللەبارانكردنی خۆیان دەكرد: پارتیزانەكان، گوندییەكان و، كەسانێك لە دانیشتوانی گەڕەكە كرێكارنشینەكان. لێرە و لەوێ دەوری یەكیان دا بوو، یان لە سەر ئەرزەكە دانیشتبوون و جگەرەیان دەكێشا. هیچكامیان ردێنیان نەتاشیبوو، نیگا باروتاوی و چاوە چاڵبووەكانی هەموویان وێكدەچوو، كاتێكیش تەماشای من و بەندیوانەكەیان دەكرد، نیگاكانیان پڕ بوو لە ترس و لەرز. دیار بوو بە چاوی هەواڵدەر و سیخور لە منیان دەڕوانی. بەندیوانەكە لێی پرسیم: "دەیبینی"؟ گوتم نە. بەندیوانەكە قۆڵمی گرت و منی راكێشایە ناوەڕاستی حەوشەكەوە. دەوروبەرمان چۆڵ بوو. هەستم دەكرد بە سیخورم دەزانن، رادەی رقیان لێم لە نیگاكانیانڕا دیار بوو. نیگام بەر دابۆوە بەر پێیەكانم. بەندیوانەكە هاواری كرد: "نەترسێن، ئەمجارەیان بە دوای كەسدا نەهاتووین، لە نێوان ئێوە دا كەسێكی ئینگلیزی نییە ناوی میچێلّ بێ؟" كەس وڵامی نەدایەوە و چووینە حەوشەكەیتر. سێ چوار حەوشەیتر هەبوو، لە نێو هەموو حەوشەكاندا هەمان شت دووبارە بۆوە. لێكمدایەوە ئەگەر هەزار و پێنج سەد تا دوو هەزار كەس لە نێو ئەم زیندانە دا بن، ئەوا دەبێ دە هەزار گوللەیان پێوە سەرف بكرێت و بە سەریەكەوە دەبێتە هەفتا هەزار ساڵ تەمەنی نەژیاو. پاشان سەرمان كێشا بە نێو یەك دوو ژوور. لە نێو هەندێ لەو ژوورانە، كە لە ژوورەكەی من گەورەتر نەبوون، پێنج شەش كەسیان تێ ئاخنیبوون. جێگایەك بۆ راكشان نەبوو. زیندانییەكان بە پاڵ یەكەوە لە سەر ئەرز دانیشتبوون. دەتگوت لە نێو فارگۆنی شەمەندەفەرێك دانیشتوون و چاوەڕێی كۆتاییهاتن بە سەفەرێك دەكەن. بە پێش ژوورەكەی بەرامبەر ژووری منیشدا تێپەر بووین. ئەمانە ژووری تاكە كەسیی بوون و لە نێو هەر كامیاندا یەك كەسیان دانا بوو. لە بەندیوانەكەم پرسی ئەو زیندانییەی لە ژووری بەرامبەرمدایە كێیە؟ بە سەر سوڕمانەوە تێی روانیم: "دەبێ كێ بێ، دیارە دەی، سوورێكە وەك خۆت" لە كۆتایی ڕێڕەوەكەدا ئەفسەرێكی گەنج و ڕێكپۆشمان بینی. پێشی پێمان گرت و پرسیاری كرد ئایا چامرز میچێڵمان دۆزیوەتەوە یان نا. بەندیوانەكە گوتی

نا. ئەفسەرەکە بە ئینگلیزییەکی شڕ و شەپڕێو لێی پرسیم ئایا راستە چامرز میچێڵ لە"ئەشرافە ئینگلیزەکانە"؟ لە وڵامدا گوتم "پێموابێ. لە خانەدانێکی کۆنی ئەشرافییە و لە هاورێ زۆر نزیکەکانی پاشایە". ئەوەندە بە دڵنیاییەوە وامگوت رەنگ بە رووخساری ئەفسەرە گەنجەکەوە نەما. بۆ ئەوەی زیاترین سوود لەم هەلە وەربگرم خۆم پێ ناساند و لەوەیا کە ناچار بووم بە سەر و ریشێکی نەتاشراو لە خزمەتیدا بوەستم خەمباریی خۆم دەربڕی. هەندێك ترسا و خۆی ناساند: "فرانکۆ" کەمێکی ما بوو دەستی بخاتە ناو دەستم. لێیم پرسی دەتوانێ کارێك بکات بمبەنە دادگا تا هەر چی زووترە ئەو بۆندژی و بەدحاڵیبوونەی بۆتە هۆی گرتنم لە سەرم لا بچێ. لە وەڵامدا گوتی ئەو مافی خۆتێهەڵقورتانی لە کاری لەم چەشنەیدا نییە، بەڵام سوپای میللی هیچ کاتێك هەڵە ناکات. گوتم لە کاتی شەڕ دا، بێگومان حاڵەتی لەم چەشنە روودەدا. بۆ نموونە بێگومانم لەوەی ئەمە نیاز و ویستی راستەقینەی سوپای میللی نەبووە کە وا من بۆ ماوەی سی و شەش کاتژمێر بێ خۆراك بمێنمەوە. بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە تەوسەوە گوتی: "ها! کە وا بێ تۆ مانت لە خواردن گرتووە". لە وەڵامدا گوتم مانم لە خواردن نەگرتووە، هیچیان نەداوە پێم تا بیخۆم. بەڵام ئەمە گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە بمبەنە دادگایەك و گوێ لە قسەم راگرن. شانەکانی هەڵتەکاند، منیش هەوڵمدا بەر لەوەی بە جێمان بێڵێ ئاراستەی قسەکانم بگۆڕم، بە ئەدەبەوە پرسیارم لێی کرد هیچ خزمایەتییەکی لەگەڵ ژەنەراڵ فرانکۆ هەیە یان نا. لەم پرسیارەمدا تا بنا گوێی سوور هەڵگەڕا و پشتی تێمان و کرد و رۆیی. بەندیوانەکە بە تەوس و تانەوە گوتی: "vamos، دەی، دەبێ برۆین". گەڕاندمیەوە ژوورەکەم. بەر لەوەی بڕوا ویستم شتێکی پێ بڵێم، بەڵام ئەو دەرگای بە روومدا پێکدا دا. دیمەنە خۆشەکەی نمایشەکە کۆتایی هات و، من سەر لە نوێ لە ژوورە تاکە کەسییەکەمدا بە تەنیا مامەوە.

دەوروبەری کاتژمێر حەوت، دەنگی ئەو پێیانەم گوێ لێ بوو کە بە سەر ئەرزدا دەخشان و دەنگی تەق و هۆڕی پێککەوتنی قاپ و غەڵبە غەڵبێك لە رێڕەوەکە دەهات. تاوم دایە بەر کونە رۆژنەکەی دەرگا. دوو بەندیوان، تەشتێکی گەورەیان بە سەر زەویدا رادەکێشا، کە هێندەی تەشتی گەرماوی منداڵان دە بوو، پڕ بوو لە شلەیەکی بۆر. قاوە بوو. دوو کەسی دیکە سەبەتەیەکی زۆر گەورەی پڕ لە نانیان هەڵگرتبوو. دەرگای ژوورەکەی بەرامبەرم کرایەوە و دواجار "ورچەکەم" لە بەرامبەرم دا دیت. سەرەتا تەنیا شتێك کە، لەو تاریك و روونە توانیم ببینم نیوەی خوارەوەی دەموچاوە ریشنەکەی و کراسە شڕ و دڕاوەکەی بوو کە، خوێنی وشکەوە بوو وەك پارچە مقەبا رەقی کرد بوو. لە دوورترین گۆشەی ژوورەکەی لە دەرگاوە، راوەستا بوو،

پشتی دا بووە دیوار و دەستی وەك کەسێك بیەوێ بەرگری لە خۆی بکات لە پێش دەموچاوی ڕاگرتبوو. بەندیوانەکە پیرەمێردرێکی ڕۆحسووك بوو، کەوچك بە دەستیەوە بوو گوتی: "Homre"پیاو"، ئێمە تەنیا قاوەمان هێناوە، لێرە لە ناو زینداندا لێدانێك لە ئارا دا نییە". کەوچکێکی پڕ لە قاوەی دایە ورچەکە و ئەویش بە هەر دوو دەستی وەریگرت و بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە هەڵیقوڕاند. هەناسەی بە دەنگەوە دایە دەرێ و بە مرچە مرچ لێوەکانی لێستەوە، وەکو سەگێك چۆن ئاو دەخواتەوە. هەر چوار بەندیوان ڕاوەستا بوون و سەیریان دەکرد. پاشان یەکێکیان پارچە نانێکی گەورەی لە نێو سەبەتەکە دەرکرد و دای پێی، نانەکەی بە کراسەکەیەوە نووساند و بە چاوە دەرپەڕیوەکانی لە بەندیوانەکان ڕاما، هەمان نیگا پڕ لە ترس و شێتانەکە، هێشتا لە ناو چاوەکانیدا بوو، بە دەنگێکی بەرز هەناسەی دەدا. دواتر بە دەنگێك کە بە گوشارێکی زۆرەوە لە قوڕگی دەرچوو پرسیاری کرد: "ئیدی لێدان نییە"؟

بەندیوانە پیرەکە گوتی: "لێرە، لە ناو زیندان، نا" ئەو جا ویستی دەرگادا بخات کە، بەرامبەرەکەم دەستی درێژ کرد و لە بەر دەرگای ڕاگرت و گوتی: "کەی..."؟ ئەمە تەنیا وشەیەك بوو توانی بیڵێ. بەندیوانی پیر شانەیەکی هەڵتەکاند و دەرگای داخست. کاروانی قاوە و نان، لە ڕیزی بەرامبەردا، ژوور بە ژوور، درێژەی بە ڕێگاکەی دا. مەودای بینینم هەر ئەوەندە بوو بتوانم ژووری ورچەکە ببینم، بەڵام دەمتوانی ببیستم کە، لە کۆتایی ڕێڕەوەکەدا سووڕانەوە و، لە ڕیزی ژوورەکەمدا بەرە و لای من دێن. بەر لەوەی بگەنە ژوورەکەی من، بەندیوانی پێنجەم بە باوەشێك ئاوخۆریی تەنەکە،- قوتووی کۆنە و گالۆنی بچووکی بەنزین- گەیشت. ئاوخورێکی پڕ قاوە و نانێکی گەورەیان دا پێم. بەڵام ماوەیەك بوو لەگەڵ خۆمدا لێکمدەدایەوە، ئێستا کە توانیومە سی و شەش کاتژمێر بێ نان و بێ ئاو بە سەر بەرم، ئایا باشتر وانییە درێژە بە مانگرتنەکەم بدەم و توانای بەرگری لەناو لەشمدا تا ئەوەندەی بکرێ کەم بکەمەوە؟ لەو ماوەیەی کە لە نێو ژوورەکەمدا هەر هاتوچۆم کرد بوو، قیژە و فیزاحی ئەو زیندانیانەی لە بنکەی پۆلیس ئەشکەنجە دەدران، ئەوەندە بە زوڵاڵی و بەردەوام لە ناو گوێچکەکانمدا دەزرینگایەوە دەتگوت تووشی خەیاڵات و وڕێنە بوومە. بیرم دەکردەوە، ئەگەر کارم بگاتە ئەوێ، مرۆڤ هەر چەندە لاوازتر و بێ هێزتر بێ باشترە چونکە زووتر لە هۆش خۆی دەچێ. هەر بۆیە قاوەکەم ڕژاندە نێو ناو دەستەکەوە، نانەکەشم دوای ئەوەی ورد ورد کرد ئەویشم بە هەمان شێوە خستە نێو کونی ئاو دەستەکەوە. ئەو ماوەیەی سەرقاڵی ئەو کارانە بووم، هەستم دەکرد سەر لە نوێ لە ڕەوتی ڕووداوەکاندا ڕۆڵێکی ئەکتیف لە ئەستۆ دەگرم و،

بە جۆرێك لە جۆرەكان خەبات دەكەم. ئەم خەیاڵە كاریگەرییەكی هێوركەرەوەی پـێ بەخشـیم. خۆم لە سەر قەرەوێڵەكەدا گرمۆڵە كرد و هەوڵمدا بنووم. كاتێك هەر ئەو دەنگـە چـەورە، كـە ئەمڕۆ بەیانی بیستبووم، وە ئاگای هێنام، دیار بوو لە حاڵەتی خەوە كوتكەدا بوومە. ئەمجارە دەنگەكە لە پەنجەرە شیشبەستەكەوە، لە یەكێك لەو حەوشانەی كە بەدوای"چـامرز میچـێل" واتە "سرپیتر" دا دەگەڕاین، كەوتە بەر گوێم. ناوی بیست و پێنج هەتا سی كەسی خوێندەوە. نەمدەتوانی بە دروستی بیانژمێرم، ناوە درێژە ئیسپانییەكان گێژیان دەكردم. ئەمجارە، ناوی هەر كەسێكی بانگ كرد بایە دەبوایە كەسەكە بڵێ"بەڵێ"، ئەگەر دەست بە جێ وڵامی نەدابایەوە، دەنگە چەورەكە، یەك ڕێژنە جوێنی پێـدەدا. پاشـان هـاواری كـرد: "هـەموو ئەوانـەی ژووری هەڤدە" "هەموو ئەوانەی ژووری بیست و سێ".

ئەوانە بێناوەكان بوون، كە ئیعدام كـران و بـە بـێ نـاویش نێـژران. تەنانـەت نـەیانتوانی بڵێن"خوایە، خوایە، بۆ راتگوێزام". دەنگە چەورەكە، لەو شەویدا، دوو جاریتریش بەرز بـۆوە. جارێك نزیكەی نیوە شەو- شەست ناو- جارێكیش بەر لە بەرەبەیان. جارێكیتریش لە بەندێكی دوورتری زیندان بەر گوێم كەوت. بەڵام دەنگەكە لاواز و نادیار بوو. نەمتوانی بژمێرم. دواتـر، سپێدەی رۆژێكیتر دەركەوت. ئێستا پێنج شەممەیە، هەتا ٤٨ كاتژمێر بەر لە ئێستا پیـاوێكی سەر بەست بووم، دەمتوانی بە خۆم و بە دەستەكانی خۆم دەرگاكـان بكەمـەوە، شـانەیەك بـە پرچم دا بێنم، خۆم بشۆم، لووتم فن كەم و بە لێدانی زەنگێك بە خزمەتكار بڵێم خواردنەوەیەكم بۆ بێنێ. دەوروبەری كاتژمێر دە "ورچ" یان لە ژوورەكەی خۆی دەرهێنا. ئەمجارەیان هیچ ناوێك نەخوێندرایەوە. بەندیوانێك و دوو سەرباز، بە ڕێڕۆیشتنێكی هاو ئاهەنگ لـە ژوورەكـان نزیـك بوونەوە. بەندیوان دەرگای خستە سەر پشت و روو لە زیندانیی گوتی:

"Valor,Hombre" "ئازا بە، پیاوەكە" و بە پەلە بەرەو ژوورێكی تر رۆیـی. سـەربازەكان ورچەكەیان گرت و دەستەكانیان بەستەوە و بردیانە لایەك لە مەودای بینینی من دەرچوو. سێ جاریتر "Valor,Hombre"م بە مەودای جیاواز لە ڕێڕەوەكە، كەوتە بەر گوێ. دواتر دەنگـەكان كپ بوون و، ئیدی كەسێك لە ژووری بەرامبەردا نەبوو. دوو رۆژی تەواو بـوو هیچـم نـەخوارد بوو، شەوی رابردووش نازانم هیچ خەوتم یان نا. لە دوای"Valor,hombre"یـەكان، ئیـدی بـە تەواوی شپرزە و پەرێشان بووم. بیرم كردەوە كە، بە راسـتی تەحـەمولكردنی ئـەم وەزعـە لـە توانامدا نەماوە و دوو دڵ بووم جارێكیتر ئەو قولاپە تاقی بكەمەوە بۆ خنكاندنی خۆم یان نـا. بەڵام كارەكەم زۆر بە دڵ نەبوو. دەستم لە میلەكانی پەنجەرەكە گـیر كـرد و خـۆم هەڵكێشـایە

سەریّ و لە چوارچێوەی مقەباکەی بەر پەنجەرەکە وە پارچە شووشەیەکم دۆزییەوە. ئەو هەندە تیژ بوو بتوانم بیرۆکەکەی ناو سەرمی پیّ جێبەجیّ بکەم. کەیفخۆش بووم بەو دۆزینەوەیەم بەلاّم بە بیرمدا هات تا شەو راوەستم. لەوەیا کە بریارێکم دا بوو کە، پیّ دەچوو دوا بریارم بیّ ئاسوودەییەك هەموو گیانمی داگرت. بە راستی بووژامەوە و میزاجم تا ئەو پەری، گەرایەوە شوێنی خۆی. تەنیا بۆ تاقیکردنەوە، لە زەینمدا بە سەر دیمەنی بردنی ورچ و دیمەنەکەی بنکەی پۆلیس دا چوومەوە. ئیدی هیچ کارتێکەرییەکیان نەبوو. بیرم لە هاورێکانم و کەسوکارم کردەوە و کەس بە خەیاڵمدا نەهات. شانازیم بەو چوارچێوە ئۆلەمپیاییەی مێشکمەوە دەکرد و بە پێی کورتە رۆمانە دوو فلسییەکە بیرم کردەوە: هیچ هێزێك نییە تۆسقالێك کارتێکەری لە سەر کەسێکدا بکات کە ئیدی دەستی لە ژیان شۆردووە. لە نهێنی ئەو بەد گۆرانە سیحرییە نەگەیشتم مەگەر لە دوای ماوەیەك، ئەو کاتەی کە، لە "سیڤیل" لەگەلّ یەکێك لە هاوبەندەکانم کە، ئەویش بە مەرگ حوکم درا بوو، لە بارەی شێوە جۆراوجۆرەکانی ترس قسەمان دەکرد: واتە بە بریاردانێکی ساختە، زۆر بە ئیسراحەت دوازدە سەعات تەمەنی خۆم درێژ کردەوە. ئەو حاڵەتە ئولەمپیاییەم، ئاوها کە بیرم لیّ دەکردەوە دەرەنجامی خودی بریارەکە نەبوو، بگرە پەیوەندی بەو دوازدە کاتژمێرەوە هەبوو کە وەکو مۆڵەت دابووم بە خۆم. تا ئەو کات، هەر ساتێك گویّ قولاّخی ئەوە بووم کەی دەنگە چەورەکە، ناوی منیش دەخوێنێتەوە. بەو بیرکردنەوە خەیاڵییە، وام بە مێشکدا هاتبوو کە، کاربە دەستانی زیندان و ئەوانەی دەرەوەی ژوورەکەی منیش رێز لەو مۆڵەتە دوانزە سەعاتییە دەگرن کە من بۆ خۆم دانابو. هەر لە بەر ئەوە ئەو هەندە کەیفساز بووم. تا دەمەو ئێوارە لەو حاڵە دا مامەوە و، دواتر کە دەرگا کرایەوە و بەندیوانە پیر و رۆح سووکەکە و یاریدەدەرەکەی، دۆشەگێکی پڕ لە کایان راکێشایە ژوورەکەم کەیفسازتر بووم. دۆشەگێکی کۆن و پیس بوو، کایەکانی ناوی کوترا بوو و بۆنێکی ئازاردەری لیّ دەردەچوو. بەلاّم کاتیّ لە سەر قەرەوێڵەکە دا راخست و لە سەری پالّ کەوتم، سەرەرای ئەوەی هەموو ئەندام و ئێسقانەکانی جەستەم ژانیان دەکرد هەستم کرد بە بەراورد لەگەلّ ئەو سپرینگە ئاسنینانەی کە لە هەموو گیانم دەچەقی، چەندە ئاسوودە و خۆش و نەرمە. بە رەزامەندییەوە پرخە پرخێکم کرد. کاتێك کە دۆشەگەکەم تاقی دەکردەوە دوو بەندیوانەکە سەیریان دەکردم و پێدەکەنین. بێگومان چەندین جار، دیمەنی لەم چەشنەیان بینیوە و جیاوازی نێوان ژووری بیّ دۆشەك و ژووری بە دۆشەك چاك دەزانن. بەلاّم مرۆڤ هیچ کاتێك رازی نییە. نەك هەر دەمویست پێخەفم نەرم بێت بگرە دەمویست گەرمیش بێت تا لە سەری

پالّ کەوم. هەڵبەت نەدەکرا خەونیش بە بەتانییەکەوە ببینی. بۆیە هەوڵمدا بخزێمە ژێر دۆشەگەکە و لە جیاتی بەتانی سوودی لێ وەربگرم بەڵام ئەمە مودێلێکی باش نەبوو. دواجار لە پرتاوێ بیرۆکەیەك کەوتە ناو مێشکم. بەو پارچە شووشەیەی دەستم دۆشەگەکەم هەڵزڕاند و بە پێڵاوەوە خۆم خزاندە ناویەوە. یەکەمجار جێی پێیەکانم تێدا کردەوە و پاشان وەکو کرمێك، وردە وردە خزامە پێشتر تا ئەوەی تەنیا سەرم بە دەردوە مایەوە. هەستم کرد لە مرۆڤە مۆمیا کراوەکانی میسری دەچم و دەستبەجێ چوومە نێو خەوێکی قووڵەوە. بەڵام هێشتا زنجیرە رووداوە خۆشەکانی ئەو رۆژە کۆتایی نەهاتبوو. کاتژمێر پێنج جارێکی تر خواردنیان هێنا، هەر چەندە هێشتا بیست و چوار کاتژمێر بە سەر دوا خواردنماندا تێنەپەریبوو. ئەمجارەیان قوتوویەك گۆشتی گا و پارچە نانێکی گەورەیان دایە هەر نەفەرێك. خواردنی ئەم زیندانە، هەم لە رووی کاتەکانی و هەم لە رووی چۆنییەتیەکەی، هیچ نەبێ دەبێ وەك داهێنانێك باسی لێوە بکرێ. بەو پارچە شووشە خۆشەویستەی لە گیرفانمدا بوو، بیرم کردەوە ئیدی هیچ هۆکارێك بۆ برسی مانەوەم نییە و بە یەك جار هەموو نانەکە و نیوەی گۆشتی ناو قووتووەکەم خوارد. تەنیا شتێك کە پێویستم پێ هەبوو تا خۆشیم تەواو بکات پەرداخێك ئاو بوو. بەڵام دەی، خۆ نابێ مرۆڤ چاوەڕوانی ئەوە بێ لە ژیانیدا، هەموو شتێکی بە یەکەوە هەبێ. سەر لە نوێ خزامەوە نێو دۆشەگەکەمەوە، ماوەیەك خۆم خوراند و دوایی خەوم لێ کەوت. دەوروبەری کاتژمێر دەی شەو، دەنگی تەقە تەق و تەپە تەپی پێ لە ڕێڕەوەکەدا وە ئاگایان هێنام. ئێستا ئیدی لە ناسینەوەی دەنگەکانی ناو زیندان شارەزاییەکی باشم پەیدا کرد بوو، هەر زوو زانیم کۆمەڵە کەسێکی دیکەیان هێناوە بۆ زیندان. دەرگای چەند ژوورێکی تەنیشتم، کە دەنگە چەورەکە، ئەمڕۆ بەیانی، دانیشتوانەکەی راپێچ کردبوو، کرایەوە و داخرایەوە. پاشان دەرگای ژووری منیش کرایەوە. پیاوێکی گەنج هاتە ژوورەوە، یان باشتر وایە بڵێم فڕێیان دایە ژوورێ. دەرگا، بە خێرایی داخرایەوە. راوەستا بوو لە شوێنەکەی خۆی و پالّی دا بەوەوە دیوار و سەری شۆڕ ببۆوە سەر سینگی. کراسەکەی بەری بە شێوەیەك بوو کە ئێستا ئیدی بەلامەوە ئاسایی ببوو، جیڕ بە جیڕ و پڕ لە پەڵەی خوێن. سەری شکاو و پڕ لە برین و پەڵەی خوێن و، نیگا شێتانەکەی چاوەکانیشی ئیدی بە لامەوە نامۆ نەبوو. تەنیا شتێك کە بە لامەوە نوێ بوو، حاڵەتی تایبەتی روخساری ئەو پیاوە بوو: جۆرێك لە شێواوی لە روخساری و دەمو چاویدا بوو کە سەرەتا سەرم لێ دەرنەچوو. چەناگەی خوارەوەی لە جێ چوبوو و لە جومگەکەیەو جیا ببۆوە. بە شێوەیەکی سەیر دەموچاوی خوار و خێچ لێ هاتبوو، دەتگوت سەراوژێریان داناوە. هەر کە چاوم پێی

کەوت نێلنجم هاتەوە. لە ناو دۆشەگەکە هاتمە دەرێ و ئاماژەم بۆی کرد لە سەر قەرەوێڵەکە دابنیشێ. هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو. دەستیم گرت و دوو شەقاو بەرەو قەرەوێڵەکەم برد و یارمەتیم دا دابنیشێ. هەر ئاوها کە راستەوخۆ سەیری پێشەوەی خۆی دەکرد، دەستی بەرەو چەناگەی برد وەك ئەوەی سووتابێ، خێرا دەستی کێشایەوە دواوە. بە پەرێشانی و شەرمەوە، لە پاشماوەی قاورمەکە، کەمێکم دا پێی، بەڵام ئەو تەنیا رووی وەرگێڕا. دیار بوو، نە دەیتوانی قسە بکات و نە دەیتوانی شتێك بخوات. لە وانە بوو نەتوانێ بیریش بکاتەوە، تەنیا ئازاری دەچێشت و دەترسا و چاوەڕێی دوا گولله بوو. لە سەر زەوی، لە بەرامبەری دانیشتم و دەستیم گرتە ناو دەستمەوە. پاش کەمێك دەستی کێشایەوە. هێواش و کوێرانە لە ژێر قایشەکەی پشتی گەڕا و دوو نیوە جگەرەی دەرهێنا. جگەرەکانم لێی وەرگرت و یەکێکیانم بۆی داگیرساند. جگەرەکە ئەوەندە کەمی لێ مابۆوە دەبوایە سەرم ئاسۆیی راگرم تا لێو و کەپووم نەسووتێ. ئەو کابرا تێکشکاوە بە لاچاوێکەوە، بە تەوسەوە پێکەنی و ئاماژەی بە نیوە جگەرەکەی دووەمدا کە بۆ خۆمی هەڵگرم چونکە ئیدی بە کەڵکی ئەو نایەن. چەند خولەکێك لە بەرامبەری دانیشتم. نەمدەوێرا هیچ بڵێم. هەر قسەیەکم بۆ دڵدانەوەی بکردبایە بەلامەوە کارێکی منداڵانە و جۆرێك سووکایەتی بوو. دواتر لە "سیڤیل" بوو ئەو راستیە سادەیەم بۆ دەرکەوت کە لە حاڵەتی ئاوهادا، ناوەڕۆکی ئەوەی دەگوترێ زۆر گرنگ نییە، بە پێچەوانەوە ئاوازی قسە کردن و جووڵەی دەموچاو گرنگە. هەر بۆیە لە زیندانی سیڤیل سێ کەس بە یەکەوە، بەم شێوازە، بۆ ئەو پارتیزانە وردیلەیەی، کە لە هەموو کەسێکی ئاسایی زیاتر لە ئیعدام دەترسا، لایە لایەی مەرگمان بۆی چڕی.

دەیزانی درۆ دەکەین، ئێمەش دەمانزانی کە ئەو دەزانێ درۆ دەکەین، لەگەڵ ئەوەشدا هێور دەبۆوە و قسەکانمانی وەکو دەرمان قووت دەدا. ئەم خەڵوەتە کپە چەند خولەکێك زیاتری نەخایاند، دواتر مێوانەکەمیان برد. کاتێك لە ناو دەرگا دا دەستیان بەستەوە تەنانەت ئاوڕێکیشی نەدایەوە. بە لای چەپ دا، بەرەو دەرگای هاتنە ژوورەوەیان برد. نەمبیست دەرگای ژوورێك دابخرێ. ئومێدوارم خوداوەند بەزەیی پێدا بێتەوە. ئارامییە ئۆلۆمپیاییەکە لە دەروونمدا نەما بوو و بێچارەییم گەڕابۆوە. کاتی هاتبوو پارچە شووشەکە رۆڵی خۆی ببینێ، بەڵام حاڵم لەوە خراپتر بوو بتوانم هیچ کارێك بکەم. هێندەی نووکە دەرزییەك دەربەستی هیچ شتێك نەبووم، تەنیا دەمویست بخزێمە نێو کیسە گەرم و نەرم و پۆخڵەکەی خەو و پەنا ببەمە بەر فەرامۆشییەکی قورس. لە ساتێکی ئەوتۆدا بڕوای تەواوم هەبوو تەنیا تەمەڵی و تەوەزلییەکەم

ڕێگەی لێم گرتووە خۆم بکوژم. دیارە دیسان فێڵم لە خۆم دەکرد. ئارەزووی خۆپاراستن، ئەو هەندە فێڵبازانە و نەمرە، کە چەواشەکارترین ماسکەکان بە سەر ڕووخساری مرۆڤدا دەکێشێ. هەر بەیانی ئەو ڕۆژە خۆی لە نێو پۆشاکی سوقرات دا دەرخستبوو، کە ئارام و ملکەچ دەستی بۆ جامی ژەهر دەبرد. ماسك بە کەڵك هاتبوو. مێشکی لە ساتێکی قەیراناویدا بە سەلامەتی تێپەڕاندبوو. ئێستا لە نێو پۆشاکێکیتردا دەردەکەوت، پۆشاکی "سن سیمونی ستوون نشین" کە لە سەر ستوونە بەردییەکەیدا خۆی گرمۆڵە دەکات و لێ دەگەڕێ تا کرمەکان گۆشتی جەستەی بخۆن.

لەو شەویدا دەنگە چەورەکە، تەنیا یەك جار بەر گوێ کەوت. چیدی ناوەکانم نەژمارد. لە نێو کیسە خەوەکەمدا ڕاکشام و کەوتمە خەوە کوتکەوە، چونکە بە هەمان ئەندازە کە دڵنیا بووم لە وەی، کە دوا بەیانیی ژیانمە، بە هەمان ئەندازەیش دڵنیا بووم کە هیچ شتێك، تەنانەت ترسناکترین ڕووداوەکان، ناتوانن ئارامی و خەمساردیم بشێوێنن. تا دەمەو ئێوارەی ڕۆژی دواتر لە نێو کیسە خەوەکەم نەهاتمە دەرێ. ئەو کاتیش تەنیا بۆ وەرگرتنی بەشە خواردنەکەم-پارچە نانێکی گەورە و قوتوویەکی پڕ لە لۆبیای سپی ئیسپانی- هاتمە دەرێ. یەکەمین جار بوو ئەو لۆبیایەی نێو زیندان ببینم کە زۆریش خۆش نەبوو. پاش کەمێك یەکێك لە نێو ڕێڕەوەکەدا دەستی کرد بە هات و هاوار و داوا کردنی ئاو. هاواری دەکرد"Agua, Agua" و بە شەق و بە مست بە دەرگاکەیدا دەکێشا. بینیم کارێکی بە جێیە. لە دوای خواردنی لۆبیاکە تینوێتی زۆری بۆ هێنام. خەوە کوتکەی زۆریش لە نێو پێخەفەکەدا، ئارەزووی بزاوتی تێمدا بەتین کرد. منیش دەستم کرد بە مستکوتان بە دەرگا و هاوار کردن: "Agua,Agua". پاشان زیندانیی سێیەم دەنگی دایە پاڵ دەنگمان و دواتر هەر هەموو زیندانییانی ئەو بەندە دەرگایان دەکوتا و هاواریان دەکرد"Agua, Agua" بەندیوانەکان هاتنە نێو گۆڕەپانەکە و جنێوبارانیان کردین. چەند ساتێك بێدەنگی باڵی کێشا. پاشان من سەر لە نوێ دەستم کردەوە بە کوتانی دەرگا و هاوار کردن و هەموو بەندەکە بوونەوە هاودەنگم. وامزانی ئێستا دێن و لێم دەدەن، بەڵام نەدەترسام، بە پێچەوانەوە، تەنیا ئارەزووم دەکرد شتێك ڕوو بدات. لە تورەییمەوە نەبوو وام دەکرد، ئەو کارەم تەنیا لە ڕووی هەڵچوون و حەزی زۆرم بوو بۆ ئەنجامدانی کارێك. دوای خەوێکی درێژ هەستم بە سەرزیندوویی دەکرد، سەرحاڵ و تەواو بە ئاگا بووم. زۆر چێژم لە دەرگا کوتانەکە، وەرگرت. دوای چەند خولەکێك پاداشتی کارەکەمان وەرگرت. بەندیوانەکان تەشتێکی گەورەی پڕ لە ئاویان هێنا و ئاویان دایە هەمووان. سەر پشکیان کردم ئاوەکە بە

قوتووه چەورەکەی لۆبیا بخۆمەوە یان بە کەوگیر. منیش دووەمیانم هەڵبژارد. سێ کەوگیری پڕم خواردەوە، ویستم وەکو "ورچ" لێوەکانم بە فلچ و هـۆڕەوە بلێسـمەوە. حـەزی زۆر و ئـارەزووی هەڵچوونم بۆ ئەنجامدانی کارێك هێشتا لە نێو دا مابوو. بیرم کـردەوە بـزانم دەتـوانم چ کارێـك بکەم و بڕیارمدا کورتە چیرۆکێك بنووسم- هەڵبەت تەنیا لە نـاو زەینمـدا. چـونکە نـە پـەڕە کاغەزێکم لا بوو نە پێنووسێك- بە چیرۆکێك لە بارەی ئاژەڵانەوە دەستم پێ کرد کە، بڕیـار وا بوو پێکەنیناوی بێ، کە چی لە دوای دوو سێ ڕستەی سەرەتا چیرۆکەکە، کەوتـە نێـو کـەش و هەوایەکی سۆزداریی ئەوتۆ کە تەحەمول نەکرێ، دیسان لە نێو زەینمدا، هـەموو نووسـینەکەم بە قەڵەمدارێکی گەورەی شین سڕییەوە. پاشان خۆم سەرقاڵی کردنەوەی ئـەو کـۆد و نهێنیانـە کرد کە لە سەر لا دیوارەکانی ژوورەکـەم نووسـرابوون. زۆربـەیان نـاوی کەسـانێك و بـەرواری زیندانیکردنیان بوو کە، دەگەیشتە سـاڵی ١٩٣٤ . ڕەنگـە لـە و سـاڵ دا، دواجـار بـووە کـە دیوارەکانیان سپیکاری کردۆتەوە. لە پاڵ هەندێ لە ناوەکاندا پڕو پاگندەی بێ تاوانیی هەبوو، ڕەنگە زیندانییەکە وای بیر کرد بێتـەوە کـە، بەندیوانـەکان نووسـینەکەی ئـەو دەخوێننـەوە و دەیگەیەننە بەرپرسەکانی سەرووی خۆیان. ژمارەیـەکی زۆر لـەو زیندانییانـە، لـە دوای نـاوی خۆیـان پـیتی یەکـەمی نـاوی حیزبـەکانیان نووسـیبوو. زۆربـەیان سـەر بـە ڕێکخراوەکـانی ئانارشیستی "C.N.T و F.I.E "بوون. کۆمۆنیستەکان قەت پیتی یەکەمی ناوی حیزبـەکانیان نانووسن، بەڵام هێمای داس و چەکوچ، یان ئەستێرەی سۆڤیەتیان دەکێشا. پیتـە یەکەمـەکانی حیزبی سۆشیالیست تەنیا یەك جار نووسرا بوو- سۆشیال دیموکراتەکان، لە هەموو وڵاتەکانـدا، خەڵکێکی پاك و خۆ پارێزن و هیچ شتێك لە سەر دیوار نانووسن. زیاتر لە هەمووان "U.G.T" پیتە یەکەمەکانی ڕێکخراوی یەکێتی کرێکاری سۆشیالیـستی دەکەوتە بەر چـاو. هـەموو ئـەم نووسـینانە، بە ئاشکرایی پەیوەندی بە سەردەمی بەر لە هەڵبژاردنەکانی شوباتی سـاڵی ١٩٣٦ هەبوو. دوای ئەو، چەپەکان دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرتبوو، بە ڕاگەیاندنی لێبووردنی گشـتی، زیندانییە سیاسیەکانیان ئازاد کرد بوو. زیندانییە نوێکان، کە ئەمجارە خـەڵکێکی دیـار و پلـە بەرز بوون، جێی ئەوانیان گرتەوە. ژوورەکەی من لەم ڕووە دەبێ زۆر شانازی بـە خۆیـەوە کـرد بێ. لە وانەیە "تۆماس بولین" لە سەر ئەم قەرەوێڵەیە خەوتبێ و خـەونی بـە کارتـە وێنەییـە جوانەکانی و، بەو کاتەوە بینیوە، کە دەمانچەیەك دەکڕێت و سوورەکانی پـێ دەکـوژێ. بـەڵام سەیر لەوە دایە لەو بەروار بە دواوە- پاشایەتیخوازەکان- فاشیستەکان و لـە وانەیـە تەنانـەت قەشەکانیش- هیچ ئاسەوارێکیان لە خۆیان بە جێ نەهێشتبوو. تەنانەت جـارێکیش چـاوم بـە

"س.ا.د.ا" پیتە یەکەمەکانی حیزبی"گیـل روبلـیس" یـان تەنانـەت بـە خاچـێکی سـادەش نەکەوت. لەگەڵ ئەوەشدا زیندان لە سەردەمی "سوور"ی مالاگا، وەکو ئەمڕۆ، پڕا و پڕ بوو لە زیندانیی. بۆ کۆنخوازەکان پەیڕەوییان لە شێوازی زیندانیانی پێشووتریان نەکردبوو؟ ئایا بـوێری کەمتریان هەبووە، یان وابەستەیی کەمتر بە حیزب، یان هەر نیاز و پێویستییان بە نەمر بوونی خۆیان نەبوو؟ لە نێو نووسینەکاندا نە شیعرێك هەبوو، نە نووسینێکی قێزەون و پیس. ئەوپەڕی لە پاڵ ناوی ژنێك دا چەند سیفەتێکی شاعیرانەیان هەڵکەندبوو، تەنانەت وێنەی خەڵکپەسەندی دڵێکی کونکراوی ئاشقێك و تیرێك بە ناویدا، تەنیا لە دوو جێگا کەوتە بەر چاوم. ئەمشەویش رۆیی. لە دوای ئەو حاڵەتە ئاڵۆزییەی بیست و چوار کاتژمێری رابردوو و، هـەوراز و نشـێوییە بەردەوامەکانی، بارودۆخێکی هێمنی زەینیی باڵی بە سەر وەزعەکەدا کێشا بوو. هاتـەوە بـیرم چوار رۆژم لە زینداندا تێپەراندووە و ئومێدی ئەوەم دایە خۆم کە، هەواڵی دەسـگیر کـردنم بـە شێوەیەك گەیشتۆتە بەریتانیا و لە وانەیە نارەزایەتی دەربڕینێکی لێ بکەوێتەوە. تێپـەڕبوونی زەمەن لە بەرژەوەندی مندایە و ئاستی شانس ئەگەر لە سەدا پێنجیش بێ باشترە لـەوەی هـەر نەبێ. ئەو کاتانەی شەو کە، خەوم دەزڕا بەو قسە و بیرکردنەوانە دڵی خـۆم دەدایـەوە. ئـەوەی نەمدەزانی ئەوە بوو کە، دادگای سەربازیی مالاگا، بێ ئەوەی لـە بـەردەم دادگـادا ئامـادە بم حوکمی ئیعدامی منیان دەرکرد بوو. شتێکی تریش کە، نەمدەزانی ئەوە بوو کە تا ئەو کات-شەممە ١٣/شوباتی ١٩٣٧- پێنج هەزار کەس، لە دوای رووخانی شار، لە مالاگا ئیعـدام کـرا بوون، کە شەشسـەد کەسیان لەم زیندانەدا بوون، کە وا ئێستا منی تێدام.

## ٩

دەوروبەری نیوەڕۆی رۆژی شەممە، کە دەیکردە چوارەمین رۆژی زیندانیبوونم، دەرگای ژوورەکەم جیڕەیکی لێوەهات و کرایەوە. لەبەر دەرگا، لە جیاتی قەلافەتە ئاشناکانی بەندیوانەکان، دوو پاسەوانی مەدەنی بە تفەنگی نێزەدارەوە راوەستابوون. گوتیان: "venga، وەرە"

هێشتا دوا جگەرەکەم لە نێو گیرفانمدابوو. سێ رۆژی رابردوو جگەرەم نەبوو بیکێشم، بەلام ئەمەیانم بۆ ئەو رۆژە هەلگرتبوو کە دەنگە چەورەکە بانگم بکا. گوشارێکی زۆرم هێنابووە سەر مێشکم لەو ساتەدا چۆن دەکرێ کارێکی وا بکەم کۆنترۆلی هەلسوکەوتم لە دوا ساتەکانی ژیانمدا بپارێزم و بیرم بۆ ئەوەچوو رەنگە جگەرە بتوانێ لەو کاتیدا یارمەتیدەرم بێ. کاتێ بینیم دووکەس بە تفەنگە نێزەدارەکانیانەوە لەبەر دەرگا راوەستاون وام بە بیردا هات کاتی داگیرساندنی جگەرەکە هاتووە. تازە جگەرەکەم خستبووە سەر لێوەکانم یەکێك لە دوو پاسەوانە مەدەنییەکە، ئومێدوارترین شتی لە گیرفانی دەرهێنا، کەلەپچەی ئاسنی. دەمزانی ئەوانەی بۆ ئیعدامیان دەبەن بە پەت دەستیان دەبەستنەوە. کەلەپچە نرخێکی گرانی هەیە و کردنەوەی لە دەستەکانی مردوویەك کارێکی لە رادە بە دەر دژوارە. تەنیا کارگەیەك لە ئیسپانیا کە، کەلەپچە دروست دەکات لە "بیلبائۆ"یە، کە هێشتا لە ژێر دەسەلاتی حکومەتدا بوو. لە بازاڕی ئەو کاتی ئیسپانیادا، راپێچکردنی مێگەلی مرۆڤ بەرەو قەسابخانەکان لە ئەژمار نەدەهات بەلام هەست بە قاتی وقڕی کەلەپچە دەکرا. هەر بۆیە لە ساتێکی ئاوهادا، کەلەپچە

ئاسنینه درەوشاوەکە، لە راستیدا، جوانترین دیمەنێك بوو کە، ئـارەزووی بینینـیم هـەبێ. بـێ ئەملاو ئەولا هەر دوو دەستم پێکەوە جووت کرد و کەلەپچە، قرتەیەکی لێوە هـات و داخـرا. میکانیزمی ئالۆز و زیرەکانەی کەلەپچە، کە زۆر سادە دێتـە بەرچـاو، تووشـی سەرسـوڕمانی کردم. هەر ئاڵقەیەکی، ریزە ددانێکی هەبوو کە بـە شـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی ئەنـدازەی هـەر مەچەکێکی رێك دەخست. پاسـەوانە مەدەنییە پیرترەکە، تەنانەت لێی پرسیم ئایا کەلەپچـەکە ئازاری مەچەکم دەدا یان نا- پرسیارەکەی نە دۆستانە بوو نە پەلارهاوێژ، ریتمی پرسـیارەکەی بەشێك بوو لە ریتمی ئەنجامدانی ئەرکەکەی، رێك وەکو ئەو بەرگدرووەی جلێك ئەندازە دەگرێ. پاشان لە رێڕەوەکە تێپەر بووین و گەیشتینە سەر شەقام. لە بەر دەرگـای زینـدان، لۆرییـەك و ئوتۆمبێلێکی پێشبڕکێی بچووك و جوان راوەسـتا بوون. بەرەو ئوتومبێلەکەی پێشبڕکێ چووین. لە سەر کاپووت- قەپاغەکەیدا چوار نیشـانی میـدالیای مـزی بەرچـاو دەکـەوت: یەکـەمیان خاچێکی شکاو، کە دەکەوتە نێو دوو چەمەلۆغەکەوە، دووهەمیان تـەورێکی رۆمـی وەك ئـەو تەورانەی دەروێشەکان لـە سـەر شـانیانی دادەنـێن. سـێهەمیان پێنجتیرێکـی رەشـی فالانـژە ئیسپانیاییەکان، چوارەمینیان لۆگۆی فەرمیی ماڵبـاتی بوربـون. تەنانـەت لـە سـەربزێوترین خەونەکانمدا، خۆم لە ناو ئۆتۆمبێلێکی ئاوها دڵڕفێن و شکۆمەند و جـوان و پـڕ لـە دروشـم و نیشان نەدیتبوو. لە راستیشدا کەیفسازییەکەم بێ ئەنجام بوو، چونکە تا ویسـتمان سـوار بـین، ئەفسەرێك بە قامچییە سوارکارییەکەی، بـە پەلـە بـەرەو لای ئێمـە هـات و بـە پاسـەوانە مەدەنییەکانی گوت کاری پێویستی بەو ئۆتۆمبێلە هەیە و لۆرییەکە بـۆ ئێمـە لـە بـارترە. وا پێدە چوو پاسـەوانەکان دڵگران بووبن بەڵام جورئەتی ئەوەیان نەبوو نارەزایەتی دەربـبڕن و ئێمـە زۆر بە دژواری توانیمان جێی خۆمان لە ناو ئەو لۆرییەدا بکەینەوە کە پێشتر بە چل زیندانی و پاسەوانەکانیان ئاخنرا بوو. لە دوای چوار رۆژ زیندانیبوون لە نێو ژوورێکی بـە تـەنیادا، ئـەو هەندە چێژم لە هەوای تازە و گۆڕانی کتوپڕی شوێنەکەم وەردەگرت لە خۆشییاندا لە نێو پێستی خۆمدا جێم نەدەبۆوە و شاد و کەیفساز سەیری هاوڕێ زیندانییەکانی دەوروبەری خۆمم دەکرد. پاشان سەرنجم کەوتە سەر دەست و مەچەکیان کە، بە پـەت و گـوریس بەسـترا بـۆوە. لـەوەش زیاترن دەسـتەکانی دە- پانزە کەسێکیان بە پەتێکی درێـژ بەیەکـەوە بەسـتبۆوە. وەکـو دنکـە شقارتە پاڵمان دابوو بە یەکەوە و قیت و خنج وەستا بووین. کاتێ لۆرییەکە کەوتە رێ، دەبوایە پاڵ بە یەکترییەوە و بە پاسـەوانەکانەوە بـدەین تـا هاوسـەنگیمان بپـارێزین و بـە سـەریەکدا نەکەوین. شتێك کەمتر لە ژمارەی زیندانییەکان، پاسەوانی مـەدەنیمان لـە نێـودا بـوون کـە،

ئەوانیش بە دەستێکیان تفەنگەکانیان گرتبوو، دەستەکەی تریشیان، بۆ پاراستنی هاوسەنگییان لە گەردنی کەسەکەی تەنیشتیانەوە ئالاندبوو، بێ ئەوەی سەرنج بدەنە ئەوەی، کە ئەو کەسەی تەنیشتیان لە هاوکارەکانی خۆیانە یان یەکێکە لەو کەسانەی پاش نیو سەعاتێکی تر دەبێ گوللەیەك بنێن بە چاوی یان لووتیەوە و ساردی بکەنەوە. جگەرەگەم بە دانە گیراوی هێشتا بە سەر لێوەکانمەوە بوو. ئەو پاسەوانەی کەلەپچەی کردبووە دەستم، جگەرەیەکی بۆ خۆی داگیراند و چی وای نەمابوو جگەرەکەی منیش داگیرسێنێ. گوتم ئەمە دوا جگەرەمە و بۆ دوایی هەڵمگرتووە و جگەرەکەم نایەوە گیرفانمەوە. جگەرەیەکی بۆم پێچایەوە و کیسەی توتن و دەفتەرە جگەرەکەی بە نێو پاسەوانەکان و زیندانییەکاندا گێڕا. پاسەوانێك لە جگەرە پێچانەوەدا یارمەتی ئەو زیندانییانەی دا کە، دەستیان بە توندی بەسترا بووە و جگەرەکەی بۆیان رادەگرت تا دوا قومی لێ بدەن. پاسەوانە مەدەنییەکان لە خۆشنشین یان دێهاتییە ئەندەلۆسییەکان دەچوون، زیندانییەکانیش هەر لە خۆشنشین یان دێهاتییە ئەندەلۆسییەکان دەچوون. هەروا کە بەیەکەوە نووسابووین لە نێو لۆرییەکەدا، لەگەڵ ناهەمواریی رێگاکە هەڵبەز و دابەزمان دەکرد. وا دەهاتینە بەر چاوان وەك ئەوەی کۆمەڵە کەسێك سواری ئەرەبانەیەك بووبێتین و لە گەشتێکی سەیراناویدا، بە دوای شوێنێکی خۆش و سەوزایی دەگەڕێین لە نێو کێو و دەشتاییدا. بە گەیشتن بە شوێنی مەبەست، ئەرکی هەر کەسێك دیار دەبێ: ئەوانەی کە دەستەکانیان بە پەت بەستراوەتەوە پشتیان دەدرێتە دیوارێك و، ئەوانی تریش گوللە ئاگرینەکانیان ئاراستەی جەستەیان دەکەن. لە دۆخێکی ئاساییدا، هەر دوو لایان پێیان باشتر وایە، پێکەوە گەمەیەکی تۆپێن بکەن. بەڵام قەدەر وای رێك نەخستووە، خواوەندی زانا بڕیاری داوە ئاو ها بێ و نە چەشنێکی تر. کە وابێ، نیوە رزگار بووەکەی گرووپەکە، سیغارەکانیان دەپێچنەوە و بە چارە گرژییەوە جارێکی تر سواری لۆرییەکە دەبنەوە و دەگەڕێنەوە. تووتنمان پێکەوە ئالوگۆڕ دەکرد و لەگەڵ هەر بە لادا کەوتنێکدا بە یەکەوە دەنووساین و گەرمایی جەستەی یەکترمان هەست پێ دەکرد بەڵام کەس متەقی لێوە نەدەهات. بێجگە لەو پاسەوانە مەدەنییەی چاویلکەیەکی لە چاو و وەك پلەیەکی سەربازیی، خەتێکی سەر دەستەیی هەبوو، لە بەر تەنگبوونی جێگا، خۆی بە میلەیەکی ئاسنییە نووساند بوو، بە تەوسە پێکەنینێکەوە بە یەکێکیانی گوت: "لە گەڕانەوەدا جێمان رەحەتتر دەبێ". بەڵام تەنیا یەك- دوو کەسێك گوێیان لە قسەکەی بوو. کەسیش وڵامی نەدایەوە. قەشەیەك تێپەڕی و سەیرێکمانی کرد. ئێمەش تەماشای ئەومان کرد. نزیك وێستگە، لۆرییەکە راوەستا و من و

دوو پاسەوانەکەم دابەزین. یەکەمیان خۆی فڕێ دایە خوارێ و یارمەتیمی دا تا منیش دابەزم چونکە من نەمدەتوانی سوود لە دەستەکانم وەربگرم، پاشان دووهەمیان لە دوای من خۆی هەڵدایە خوارێ. لۆرییەکە سەر لە نوێ کەوتەوە ڕێ. زیندانییەکان ئاوڕی لای ئێمەیان دایەوە و من دەمتوانی لە نێو نیگاکانیاندا، تەنانەت لە نێو چاوەکانی پاسەوانەکانیشیاندا، ئێرەیی و سووکایەتی ببینم. ئێمە بیانی بووین، ئێمە پەیوەندی چارە نووسی هاوبەشمان پچڕاند بوو. هەر سێکمان لە لۆرییەکە ڕامابین کە لە نێو هەورێك لە خاك و تۆزدا ون دەبوو. یەکێك لە پاسەوانەکانم میلی تفەنگەکەی راکێشا و پەنجەی بە پەلە پیتکەوە نا، تاوەکو بێ گومان بم لەوەی تفەنگەکەی بە تاڵە و گوللەی تێدا نییە. پاشان سیغاری بۆ هەر سێکمان پێچایەوە و خۆمان کرد بە ناو وێستگەکەدا. ئەو پاسەوانە مەدەنییە کابرایەکی حۆل و دەبەنگ بوو، روخسارێکی گاڵتەجارییانەی هەبوو کە، لە روخساری ئەسپ دەچوو، ددانە گەورە و زەردەکانیشی هەر لە ددانەکانی ئەسپ دەچوون، لووتێکی گێڕی هەبوو، چاوەکانیشی لە چاوە شەکەت و گێژەکانی چاوی ئەو ئەسپانە دەچوو کە ئارەبانەیان رادەکێشا. ناوی "پدرۆ" بوو. ئەوی دیکەیان قورمە پیاوێکی خەپە بوو و قەڵافەتە هەڵقرچاوەکەی، ئەوی وەکو پیاوێکی دێهاتی نیشان دەدا. کاتێ لە ژووری چاوەڕوانیدا بووین لە پدرۆی حۆلم پرسی بە تەمان بۆ کوێم ببەن. گوتی: "بۆ سیڤیل" و نووسراوێکی تایپکراوی نیشانم دا تێیدا نوسرا بوو: "کەس، ئا. ك بریار دراوە بەکەلەپچەکراوی بنێردرێتە سیڤیل و رادەستی قەڵەمڕۆی تایبەتی فەرماندەی هێزە شەڕکەرەکانی بەرەی باشووری سوپای میللی، ژەنەراڵ گونزالس کیپۆ دلیانۆ بکرێت" ئومێدوار بووم بمبەنە "بۆرگۆز" یان "سالامانکا". لە نێو هەموو شارەکانی سەر گوێ زەوی، سیڤیل ئەو ناوە بوو وەك ناخۆشترین ئاواز گوێچکەمی ئازار دەدا. هەر وەك لە نێو هەموو دەسەڵاتدارانی جیهان، ئەو کەسەی زیاتر لە هەر کەسێکی تر لێی دەترسام "ژەنەراڵ گونزالس کیپو دلیانۆ" بوو. هێشتا شەش مانگ بە سەر ئەو رۆژەدا تێپەر نەبووە، کە روو بە روو بینیم. لە دوای ئەو دیمانە رۆژنامەوانییەی لەگەڵی دا ئەنجامم دا بوو، منیش لە پێشەکیەکی کورت بەڵام نا دۆستانەدا، وێنایەکی باشم لە کەسایەتی ئەو نەکێشا بوو، نەك هەر لە بڵاوکراوەکان بگرە لەو کتێبەشمدا چاپ کرا بوو کە بە زمانی فەرەنسی بڵاو کرایەوە. "کیپو" زمانی فەرەنسی دەزانی و ئەگەری زۆر هەبوو، ئێستا کتێبەکە، لەگەڵ دۆسیەکەم، لە سەر مێزەکەیدا بێ. دەمتوانی بیهێنمە بەر چاوم کاتێ برگەی "وێنەی ژەنەراڵە یاخییەکە"ی دەخوێندەوە، رێك وێنەی خۆی بوو، بێ هیچ کەم و زیاد کردنێك. ئیدی خراپتر! ئێستا لە نێو سنووری "قەڵەمڕۆی

تایبەتی" ئەو دا بووم. وەك یەكێكم لێ هاتبوو لە نێو جەنگەڵێكدا رێی لێ ون بـوو بـێ و لـە ترس و پەشۆكاوی خوێدا پێ لە سەر كلكـی پڵنگێـك دا بـنێ. سـواری شـەمەندەفەڕ بـووین. شەمەندەفەڕەكە هی سەردەمی كۆن بوو. بە فارغۆنە بچـووك و قەشمەرجارەكـەی لـە سـنووقە دارینەكان دەچوو كە، بە سەر دوو تایەدا دەڕۆیی. زیگزاك، رێگای خۆمان بەرەو كۆپەیـەك لـە فارگۆنی پلە سێ دا كردەوە كە، لە نێویدا خێزانێكی قەڵەبالغی دێهاتی جێی خۆیان كردبـۆوە: باوك، دایك، داپیرە، كچێكی نیمچە عازەب و منداڵێكی ساوا. ئەندامانی خێزانەكە خۆیان كۆ كردەوە و بە تەنیشت یەكەوە دانیشتن و بە رێزەوە دوو كورسییەكەی تەنیشت پەنجەرەیان بۆ دوو پاسەوانەكە چۆڵ كرد. من بە تەنیشت پدرۆی گێلْ دانیشتم، بـە تەنیشـت منیشـەوە دایـك و منداڵە ساواكە و، لە بەرامبەریشمدا داپیرە و بە تەنیشـت ئەویشـەوە، لـە گۆشـەی ئـەولاتر، كچەكە دانیشتبوو. كچەكە زۆر جوان بوو، بە تیلەی چاوی سەیری جلە پیسەكانی بەرمی دەكرد كە، هاواری دەكرد بیانییەكی پۆخڵم. دەستەكانم وەكو راهیبەكان لە نێـو قوڵمـدا شـاردبۆوە و كەلەپچەكە زۆر نەدەكەوتە بەر چاو. شەمەندەفەڕ لە سەرە خۆ كەوتـە رێ. داپـیرە زوو سـەری قسەی لەگەڵ پدرۆ و لویس كردەوە. سەرەتا لە كەشوهەواوە دەستیان پێ كرد و پاشان لە بارەی بەرهەمی پرتەقاڵ و ئەو جا جەنگ. زانیم لە دوای گرتنمدا "موتریل"یش رووخاوە و چـاوەڕێ دەكرا لە هەر ساتێكدا "ئەلمریا"یش برووخێ. دێهاتییـەكان و پاسـەوانەكانیشم بە ئاشكرا خۆیان لە لایەنگیری هەر لایەنێكدا دەدزییەوە. كاتێ ئاماژەیان بە سوپای فرانكۆ دەكرد نەیانـدەگوت "Losnuestr os" "خۆییـەكان" لـە جێیـدا دەیـانگوت"Los Nacionales" "میللیـەكان". پاسەوانەكان بە لایەنی بەرامبەریان دەگوت"Los Rojos" "سوورەكان" بەڵام داپیرە ئەوانی بـە "Los Valen cionos" "ڤالانسییەكان" ناو دەبرد. ئەو خێزانە خەڵكی "ئانتێ كویرا" بـوون، ئەو لادێیەی كە "پیزارۆ" بۆ وە دەستهێنانی جگەرە و تۆوی گەنمەشامی پەلاماری دا بوون. لە رۆژە سـەرەتاكانی پشێوییەكەی دوای شۆڕش هەڵاتبوونە مالاگا تا لـە نێـو خزمانیانـدا دالـدە بدرێن و ئیدی نەیانتوانیبوو بگەڕێنەوە گوندەكەی خۆیان كە دەكەوتە ئەو دیوی هێڵی شەڕەوە. پاشانیش مالاگا كەتبووە دەست "Los Nacionales" و ئێستاش ئەوان وا دەگەڕانەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان. دۆن لویس لە پیاوەكەی پرسی، بارودۆخ لە مالاگا لـە سـەردەمی سـوورەكاندا چۆن بوو؟ پیاوەكە هەر تـەنیا شـانێكی هەڵتەكانـد و گـوتی، هـیچ كاتێـك سـەری خـۆم بـە سیاسەتەوە نەئێشاندووە. داپیرە گوتی، هەموو كارەساتەكان لە ژێر سەری بیانییەكانە، لـەو لا رووسەكان و لەملایش ئەڵمانەكان و ئیتاڵییەكان. وای گوت و موكوم كێشای بە دەمی خۆیدا و

بە پێکەنینێکی مەکراوی، کە پەشیمانبووەیشی پێوە دیار بوو، پرسیاری لێم کرد کە، ئایا من فرۆکەوانی ئەڵمانیم؟ گوتم: نە، رۆژنامەنووسی بەریتانیم.

کچەکە بە سەرنج و حەزەوە تێی روانیم. دۆن پەدرۆ و دۆن لویس دەمیان کردەوە بەڵام سیاسیانە پێشیان لە قسە کردنی خۆیان گرت.

داپیرە دەیویست بزانێ رای پاشای ئینگلیز لە بارەی "کۆی ئەم کێشەیەی نێو ئیسپانیا چیە". گوتم خاوەنشکۆ لەم بارەیەوە هێشتا نەگەیشتۆتە هیچ ئەنجامێك چونکە بۆ چوونی راوێژکارەکانی تا رادەیەك هاو دژ بەیەکن. ئەوجا "دۆن پدرۆ" چاوێکی فێلبازانەی هەڵتەکاند و ددانە ئەسپییەکانی دەرخست و پرسی، کە لە ئینگلتەرایش " سوور" هەیە یان نا. "دۆن لویس"یش چاوێکی بۆم داگرت و لە پرمەی پێکەنینێکی ناشیرینی دا. هەر دووکیان بە ئەژنوکانیانەوە پاڵە پەستۆیان خستە سەر پێم و، دیار بوو ئەگەر لەم گاڵتە و دڵخۆشییەیان بەشداریم نەکردبایە دڵیان دەرەنجا. منیش ئەو پەری هەوڵی خۆم دا بەشداریان بم. ئەمە نهێنییەکی بچووکی نێوان هەر سێکمان بوو. داپیرە گوتی" دواجار خۆیشی سوور دەرچوو".

ئەم قسەیە پرمەی پێکەنینی دۆن پدرۆ و دۆن لویسی بە دواوە بوو و، داپیرەش لەو کلۆ شەکرەی شکاندبووی لە خۆشییاندا هەڵاوسا. چونکە هەموومان کەیفساز بووین، هەستا و بە یارمەتی دایکە، سەبەتەی خواردن و شووشە شەرابە سوورەکەی لە نێو بوخچەکەدا هێنایە خوارێ. کالباسی بە چێژی بیبەر، پەنیر، نانی سپی و شەرابی پێشکەشمان کرد. پاسەوانە مەدەنییەکان هەر خێرا قبووڵیان کرد و وەریانگرت. من وەرم نەگرت. هەموو خێزانەکە پێداگریی زۆریان کرد منیش بخۆم. دەستەکانم لە نێو قۆڵەکانم دەرنەهێنا. بارێکی نالەبار و ڕەزا قورس بوو. پاسەوانەکان سەیرێکی یەکدییان کرد. پاشان دۆن لویس، بێ دوو دڵی، قۆڵمی گرت و کەلەبچەکەی لە دەستم کردەوە. هەموو ئەندامانی خێزانەکە حەپەسان. داپیرە قیژەیەکی لێوە هات: "ئای مریەمی پیرۆز!" سەیرێکی کردم و بە نەرمیەکی پڕ لە سۆزەوە گوتی "فەقیرەی دایکت!" دواتر پەنیر و کالباسی دامێ و بە جووڵەکانی دەستی خاچێکی لە سەر سنگم کێشا. دەستم بە خواردن کردو تنۆکە ئارەقەکانی سەر نێو چەوانم سڕییەوە. کچەکە رووی وەرگێڕاو، وەکو ئاگر سوور هەڵگەڕا. مناڵە کوڕەکە، کە لە کاتی کردنەوەی بوخچەی خواردنەکە، لەسەر ئەرزی فارغۆنەکە گاگۆڵەی دەکرد خۆی خزاندە باوەشی دۆن لویس و گەمەی بە کەلەبچەکە دەکرد. ئەم رووداوە، چوار کاتژمێر بەر لە گەیشتنمان بوو بۆ ئانتێ کوێرا. ئانتێ کوێرا راستەوخۆ نەدەکەوتە سەر رێگەمان، بەڵام شەمەندەفەرەکە، بەردەوام دەکەوتە سەر هێڵە

لاوەکییەکان. پڕ بە سکمان خواردمان و خواردمانەوە بەڵام ئیدی هەمووان بێ دەنگ ببوون. ناو بە ناو کە بێدەنگییەکە قورس دەبوو، دێهاتییە کەمدووەکە لەو قوژنەی کە دانیشتبوو دەیگوت: " پارچە کالباسێك بدەرە ئەو ئینگلیزە" یان دەیگوت "ئینگلیزەکە تێری شەراب خواردەوە؟" قەت راستە وخۆ نەیدواندم. بەڵام دایکە، کە گەشاوەترین و لە هەمان کاتیشدا دەبەنگترین ئەندامی خێزانەکە بوو، هەروا کە پارچە کێکێکی دەپەستایە ناو دەستم گوتی: "بخۆ سینیۆر. خوا دەزانێ چەنێکیتر ئەوجا دەتوانی شتێك بخۆیت!" لێرەدا دۆن پدرۆ بە گاڵتەوە گوتی: "سبەی گوللە باران دەکرێ"

بەڵام کەس گاڵتەکەی لێ وەرنەگرت و دۆن پدرۆ شەمەزار بۆوە و پێیەوە دیار بوو لەوە گەیشتووە کە گاڵتەیەکی بێتامی کردووە.

لە یەکێك لە وێستگە بچووکەکان، دابەزی بۆ ئەوەی ئاو بێنێ و تفەنگ و کەلەبچەکەی دایە من بۆی هەڵگرم. وای نواند کە، لە پەلەپڕوزێی و شپرزەیی ئەم کارەی کردووە، بەڵام من تێگەیشتم بە ئانقەست وایکرد تا قەرەبووی گاڵتە بێتامەکەی بکاتەوە. لەگەڵ دەستی خۆیدا هەندێك توونن و پاکەتێکی دە جگەرەیی سانیمۆسی هێنا و پێشکەشی کرد. منیش پێشکەش بە هەموواەم کرد. هەر چەندە ئەو سیغارەی خۆیان دەیانپێچایەوە زۆر لەم جگەرەیە باشتر بوو بەڵام لە رووی ئەدەبەوە یەکی دانە سیغارێکیان هەڵگرت. لە ئانتێ کوێرا، خێزانەکە بە هەرا و دەنگە دەنگی زۆر دابەزین. داپیرە دیسان خاچێکی بە سەرمدا کێشا. دێهاتییەکە، بێ ئەوەی نقەیەك لە دەمی دەرچێ پرتەقاڵێکی وێدام، کچەکە دیسان سوور هەڵگەڕا و نەیهێشت نیگای بکەوێتە سەر من. پاشان شەمەندەفەرەکە بەرێ کەوتەوە. عەسرانێکی درەنگ وەخت بوو، هەر سێکمان لە سەر کورسییەکە پاڵمان دایەوە و خەومان لێکەوت. دوای تێپەڕبوون بە چەند وێستگەیەکدا رێبوارێکی زیاتر سوار ببوون، کە پیاوێکی گەنج و رێکپۆش و کەمێك خرپن و هەروەها بە رێزێکی لە چینی هەوراز لە نێویاندا بوون. ئەوانیش سەری قسەیان کردەوە. بۆ خۆ دوور خستنەوە لە هەر کێشەیەکی نوێ، هەر بە خۆم بێ پێشەکی بۆیانم روون کردەوە کە من زیندانیم، هەر چەندە کەلەبچەکەیان لە دوای کردنەوەیدا جارێکی دیکە لە دەستم نەکرد بوو. ئەوە بوو، نوێنەری چینی هەوراز، خۆی خزاندە دوورترین قوژبنی فارگۆنەکە و بەردەوام وای سەیر دەکردم دەتگوت گڕووم. پیاوە گەنجەکە، وەکو دێهاتییەکان، یان هەر کەسێکی دیکەی ناو شەمەندەفەرەکە، رووبانێکی میللییەکانی بە جێ دوگمەکەیەوە بەستبوو، سیغارێکی بۆم راداشت و کاتێ بینی چاکەتم لە بەر نییە و لە سەرمان هەڵدەرزم جلێکی خۆی وێدام. گوتی دەچێتە سیڤیل، چونکە داوایان کردووە وەك سەرباز خۆی بە سوپای فالانژ بناسێنێ. لێیم پرسی

ئەی بۆ جلەکەت دەدەیتە "دوژمنێکت"، شانەکانی هەڵتەکاند و چاوێکی خێرای نووقاند. نازانم ئەم فالانژیستە، یان هەزارەهای وەك ئەو، بە کەڵکی "کێیپۆ دلیانۆ" دێن یان نا. تا گەیشتنمان بۆ سیڤیل کەلەبچەکەیان نەکردەوە دەستم. کاتێ گەیشتینە سیڤیل شەو داهاتبوو. دۆن پدرۆ و دۆن لویس دیسان گۆڕدرانەوە بە دوو کەسی وشك و فەرمی و، بە ڕێڕۆیشتنی سەربازی چووینە ناو وێستگەی جەندرمەکان. لە وێ کەوتنە دەنگە دەنگ کە، بەم درەنگە شەوە چی لە من بکەن. کاتژمێر دوانزە و چارەکێك بوو. ئۆتۆمبێلی حکومەت نەبوو و، شەمەندەفەرەکانی شەقامیش لە کار کردن وەستابوون. دۆن لویس پێشنیاری ئەوەی کرد تەنیا ئەمشەو بمبەنە سەربازخانەی فالانژیستەکان. ڕێك ئەو شتەی زەندەقم لێی چوو بوو. لە دۆن پدرۆم پرسی ناکرێ لە باتی ئەو شوێنە بمبەنە زیندان! بزەیەکی بە تەوسەوە هاتێ و گوتی"ناکا پێت خۆش نەبێ بچیتە لای فالانژەکان؟" گوتم: "نا". هەر دووکیان دەمیان کرایەوە و ماوەیەك فسکە فسکیان بوو بە یەکەوە و پاشان دۆن پدرۆ گوتی دەبێ تەلەفۆن بکەین بۆ بنکەی ناوەندیی. چۆن دواجار، بڕیاردان سەبارەت بە من لە ئەستۆی ئەواندایە. داوای دەفتەری ژمارە تەلەفۆنەکانیان کرد لە یەکێ لە جەندرمەکان ئەویش گوتی لای نییە. بەڵام ژمارە تەلەفۆنی هەموو فەرمانگەکان لە سەر پلیتی کوشکی تەلەفۆنەکان نووسراوە. ئەوە بوو چووینە کوشکی تەلەفۆناتەکە. سەر دیوارەکە پڕ بوو لەو ژمارانەی بە پێنووسی دار نووسرا بوو. خوێندمەوە"بنکەی فەرماندەیی ئیتاڵیا، ژمارەی فلان و فیسار". "سەربازخانەی پیادەی ئیتاڵیا، ژمارەی فلان و فیسار"، "سەربازخانەی پیادەی ئیتاڵیا ژمارە دوو، ژمارەی فلان و فیسار". "کۆمیسارییای ئیتاڵیا، ژمارەی فلان و فیسار". لە دوای دوا دیدارم لە سیڤیل، گەشتیارێکی زۆر روویان لەم شارە کردبوو. دەرەنجام بە هەوڵی هەرسێکمان توانیمان ژمارە تەلەفۆنی بارەگای هێزەکانی باشوور بدۆزینەوە. دۆن لویس پەیوەندی کرد و نیو کاتژمێر دواتر ئۆتۆمبێلێك هات بە شوێنماندا. لە شەقامەکانی "سیڤیل" تێپەڕدەبووین، بە بەردەم هوتیل مەدرید کە، وەختێك شوێنی حەوانەوەم بوو، بە بەردەم هوتێل کریستینا، کە "سترێند بێرگ" و فرۆکەوانە ئەڵمانییەکانم تێیدا بینیبوو، بە پێش سەربازخانەی فالانژیستەکان، کە بینیبووم زیندانییەکان لە کاتێکا خوێنیان لێ دەچۆڕا لە کانگاکانی ریۆتینتۆوە دەیانبردنە ژووری تێپەڕ بووین و چووینە ناو بارەگا ناسراوەکەی"ژەنەراڵ رادێر". کاتێکی پڕ لە وەهم و ترس بوو، خراپتر و ناخۆشتر لەم کاتەی وەك ئێستا سواری ئۆتۆمبێلێکیان کردبووم و بەرەو زیندانی مالاگایان دەبردم، کە من وام هەست دەکرد بەرەو گۆڕستانم دەبەن. "دۆن پدرۆ و دۆن لویس" بێدەنگ بوون و خۆزگەم دەخواست قەت بە جێم نەهێڵن. ڕێڕەوەکان، شەو هێندە بێدەنگ بوون

دەتگوت تۆزی مەرگیان پژاندۆتە ئەو ناوەوە. تەنیا لە دوو سێ ژوورێکدا دیار بوو چەند کەسێك هێشتا کاریان دەکرد. ئێمەیان ماوەیەك لەم ژوور بۆ ئەو ژوور بردو کەس نەیدەزانی چیمان لێ بکات. دواجار خۆمان لە فەرمانگەی "کردنەوەی شیفر و جفرەکان" بینییەوە. لەوێ فەرمانبەرێکی زۆر رووخۆشمان بینی گوتی، هەر سێکتان دەتوانن لەم ژوورە لە سەر ئەرز بخەون. دۆن لویس تازە خۆی گرمۆلە کردبوو دەیویست پۆستاڵەکانی لە پێ بکاتەوە، ئەفسەرێك هات و لەوێی دەرکردین. گوتی ئەم کابرایە لە کوێ و فەرمانگەی جفرە کردنەوە لە کوێ، جێی لە بنکەی پۆلیسە. ئەوە بوو ئاوارە و سەرگەردانی دۆزینەوەی بنکەی پۆلیس بووین.

"دۆن پدرۆ و دۆن لویس" شەکەت و بێزار ببوون و میزاجیان تێك چوو بوو. دیار بوو بوومەتە سەربار بە سەریانەوە و ئەگەر بە دەست ئەوان بوایە بەرەڵلایان دەکردم بڕۆم. بەڵام ئەمە کارێکی نامومکین بوو. دواجار خۆمان لە نێو بنکەی پۆلیسدا دۆزییەوە. خۆمان لە نووسینگەیەك بینییەوە کابرایەکی زۆر گرژومۆن و رەزا قورس، هەندی شتی لە بارەمەوە تۆمار کرد و پەنجە مۆریان پێ کردم. دەنگی دا دوو عەریف هاتن. بەرامبەر مێزەی سەرۆکەکەیان قیت راوەستان- لە دوو مەیموونی غۆریللا دەچوون- قاچیان کێشا بە عەرزدا و یەکێکیان زۆر بە زمانێکی رەسمی پرسی : "una flagelacion?"

"Flagelacion" واژە و چەمکێکە کە، لە بنکەکانی پۆلیسی ئیسپانیا، بە بەشە تێهەڵدانی هەر گیراوێك دەگوترێت لە کاتی هاتنە ژووریدا واتە تێهەڵدانی پێشوازیلێکردن!. کارێکی نایاساییە بەڵام لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکان بە فەرمی جێبەجێ دەکرێت، لە فەرەنسا پێی دەڵێن"Passer a tabac" و لە ئەڵمانیاش پێی دەڵێن"die erst eabreib ung". دۆن لویس جورئەتێکی دایە بەر خۆی و هەندێك چەمایەوە و چەند قسەیەکی چرپاندە بنا گوێی سەرۆك بنکەکە. تەنیا شتێك کە گوێم لێ بوو ئەمە بوو "Periodista Ingles" _ پەیامنێری ئینگلیزی_ ئەوە بوو "لە بەشە تێهەڵدانەکە" بەخشرام.

هەناسەیەکی بە نارامیم هەڵکێشا و دوو غۆریللاکە، کە راوەکەیان لە کیس چوبوو، منیان فڕێ دایە نێو شوێنێك وەکو قەفەزێك بە شیشی ئاسنینەوە دروستکرابێ وا بوو. دۆن لویس و دۆن پدرۆ چەند خولەکێك دواتر، کاتێ نووسراوە ئیدارییەکانیان مۆر و ئیمزا کرا، هاتن و بە بەردەم قەفەزەکەدا رەت بوون. بانگیانم کرد و بۆ هەموو هەڵسوکەوتە جوانەکانیان بە درێژەی رێگادا سوپاسیانم کرد. شەرمەزارییەکی زۆر دایانیگرت و دەستیان بە نێو میلە ئاسنینەکاندا هێنایە ژوورێ و بە نۆرە تەوقەیان لەگەڵدا کردم. غۆریللاکان ئەبڵەق مابوون بە بینینمان. دوو هاوڕێکەم رۆیشتن. ئەوان جیاواز نەبوون. دوو کەس لە نێو بیست و پێنج ملیون ئیسپانیایی

بوون کە، لە زۆربەی کاتەکاندا میهرەبان و بە بەزەیین. بەر لەوەی لـە ڕێگـای سـەفەرەکەماندا وەك هاوڕێمان لێ بێ، ئەگەر فەرمانیان پێکرابا تیرۆرپ تێمهەڵدەن یان گوللەبارانم بکـەن، بـەو پەڕی خوێنساردییەوە ئـەمکارەیان دەکـرد. ئەگـەریش هاوبەنـدم بوانایـە تاکـە جگەرەکـەیان لەگەڵدا بەش دەکردم. لەو لایشەوە ئەگەر لەگەڵ ئەو دوو غۆریللایە لە نێـو شـەمەندەفەرێکدا هاو سـەفەر بواینایە، ئەگەری زۆر بوو بە هەمان ئەو هەستەی ئەم دوو هاوڕێیـە، لێکـدی جیـا دەبووینەوە. سەیرێکی غۆریللەکانم کرد. ئەوانیش تێمڕامان. بیرم لەوە کردەوە ئەگەر لە "بەشـە تێهەڵدانەکە" نەبەخشرابامایە چی بەڵایەکیان بە سەرم دەهێنا. بەڵام ئێستا کە بەخشرا بـووم، مەرئاسا دەمیان هەڵپچڕی و جگەرەیەکیان وێدام. لە بەرامبەردا منیش بزەیەکم  بە روویاندادا و بیرم لەوە کردەوە چەند کارێکی گاڵتە جاڕییە ئەو هەندە بایەخ بە کەسایەتیی تاکیی مرۆڤێك بدەین. کەسایەتیی تاك چەندە کەم پەیوەندی بـە شوناسـەکەیەوە هەیـە، بـە پێچـەوانەوەیش، چەندە زۆر، بەو ئەرکەی کۆمەڵگە دەخاتـە ئەسـتۆی و، گۆڕەپـانێکی چـەندە بەرتەسـك بـۆی دەمێنێتەوە تا تێیدا مەیلە سرووشتییەکانی خۆی دەربخات. چی جیاوازییـەکی هـەبوو کـە دۆن لویس و دۆن پدرۆ و جەندرمەکانی نـاو ئۆتۆمبێلەکـە، گوێچـکەیەکی ئاشـنا بـە مۆسـیقایان هەبوایە، پشیلەیان خۆشتر بویستبایە یان سەگ، باش بوانایە یان خراپ؟ لە پرێکا وەك ئـەوەی تێگەیشتبم کە، بۆ ڕێبازی ئەنارشیسـتی ئـەو هەنـدە ڕەواجـی هەیـە لـە ئیسـپانیا. بـە لای ئەنارشیستەکانەوە، ئەژادی مرۆڤ بە سادەیی گوێز وایە: هەر هێندەیە کـە، توێکڵـە ڕەقەکـەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکەی بشکێنی و تامی ناوکـە خۆشـەکەی نـاوی بچـێژی. تیۆرییـەکی سەرنجڕاکێشە. بەڵام بە لامەوە زۆر گومانـاوییە قەت نەبووە دار گوێزێك، گوێزی بـێ توێکڵـەی پێوە بێ. هیچ کاتێك مرۆڤ، هێندەی ئەو کاتەی لە نێو قەفەزێکی ئاسـنیندا بەنـدکراوە و دوو غۆریللا پاسەوانی لێ دەکەن نیگەرانی داهاتووی مرۆڤایەتی نییە و، پێی باشە بیر لە هـەموو شتێك بکاتەوە بێجگە لە داهاتووی خۆی. باوەڕم وایە تەنیا شتێك کە دڵی پیاوێکی حوکمدراو بە مەرگ، ئەویش لە سەر کورسی کارەبایی، خۆش بکـات ئەوەیـە کـە، بڵـێن ئەسـتێرەیەکی کلکدار داڕژاوە و لە ڕێگایە بەرەو زەوی و سبەی هەر کە بگاتـە سـەر زەوی دنیـا سـەراو بـن دەکات. دەوروبەری کاتژمێر دوو یان سـێی دوای نیوەشـەو، ئـەتومبێلێك هـات و منیـان بـە پاسەوانیی هەر دوو غۆریللاکە، بە نێو شارە خەوتووەکـەدا، بـە سـەر پردی "گوادالکـویر" و، شەقامە چۆڵ و هۆڵەکاندا گواسـتەوە بۆ زیندانی لاتەریکی سیڤیل.

# ١٠

لە دووررا بینای زیندان وەکو سێبەرێك لە تاریکیدا دەرکەوت و، ئاسوودەییەکی پێ بەخشیم، وەك ئەو ئاسوودەییەی، پانزە کاتژمێر بەر لە ئێستا، بینینی کەلەبچە پێی بەخشیم. ئێستا ئیدی لەوە گەیشتبووم کە، تەنیا لە بنکەکانی پۆلیس و بارەگاکانی فالانژیستەکان و لە سەربازخانەکان هەڵسوکەوتی نارێك لەگەڵ زیندانییاندا دەکەن و تێیان هەڵدەدەن نە لە نێو زیندانەکاندا. زیندان دوو رێگای بەرەو دەرەوە هەبوو. ئازادی یان گوللە بارانکردن. بەڵام تا ئەو کاتەی مرۆڤ لە زینداندایە واتە لە ئەماندایە. بینا زەبەلاحەکەم بە هەستێکی پڕ لە خۆشەویستی و رێزەوە سەیر کرد. پووکانەوەی هەر شارستانییەتێك، خۆی لە هەندێ هێمای سەیردا دەنوێنێ: بۆ نموونە لەم راستییەدا کە ئیدی دیوارە بەردینییەکانی زیندان بۆ پاراستنی کۆمەڵگە نییە لە زیندانیی، بەڵکو بۆ پاراستنی زیندانییە لە کۆمەڵگە. زیندانی سیڤیل چەند ساڵێك دوای سەرکەوتنی شۆرشی ئیسپانیا لە ساڵی ١٩٣١ یان ١٩٣٢ دروست کرا بوو. کۆمارە گەنج و بەرزە فڕەکە، ئارەزووی ئەوەی هەبوو لە هەموو روویەکەوە شان لە شانی رۆژئاوای پێشکەوتوو هەڵسوێ، یان تەنانەت ئەگەر بتوانێ وە پێشیشی بکەوێ. لە نێو باشترین دەستکەوتەکانیدا، دەبێ گۆڕانکاریی لە بواری سزاکاندا لەبەرچاو بگیرێ کە، تا ئەوسا لە ئیسپانیا لە ئاستی سەدەکانی ناوەڕاست بوو. "زیندانە نموونەکان" کە لە مەدرید، بەرشەلۆنە و سیڤیل دروست کرا، لە راستیدا باشترین و مودێرنترین زیندانەکانی ئەورووپا بوون. بە نێو باخچە

جوانەکەی بەردەم دەرگا سەرەکییەکەدا تێپەڕ بووین، لە زەنگمان دا- لێرەش یەك زەنگی شەوانە هەبوو- دەروازەکە کرایەوە. سێ ڕێڕەوی درێژ، لە ژێرەوە ڕێڕەوی تریان لێ دەبۆوە. یەکێك ڕاستە و ڕاست بۆ پێشەوە و دووانەکەی دیکە، یەکێك بەرە و لای ڕاست و ئەوی دیکەش بەرە و لای چەپ. ریزە ژوورێکی وەك یەك و بێ بڕانەوە لە هەر دوو لای ڕێڕەوەکەدا هەبوو. دوو ریز بە سەر یەکەوە لە هەر لایەکدا. ژوورەکانی نهۆمی سەرەوە بەرەو هەیوانی بەر تەسکتردا دەکرایەوە، کە قالدرمەی ئاسنی هەبوو. لە هەر ژوورێکدا، یەك ژمارە و یەك چوار چێوەی "ناو"ی هەبوو، کلاو ڕۆژنەیەکیشی تێ خرا بوو. هەر شتێك کە دەکەوتە بەر چاو یان لە ئاسن دروست کرابوو یان لە کۆنکریت. هەموو شتێك بە شێوەیەکی سەیر هاو قەبارە، بەرامبەر بە یەك و ئۆتۆمبێلئاسا دەکەوتە بەر چاو. بە تێڕامان لەو پەیکەرە ناسنینە، مرۆڤ وایدەزانی لە نێو ماتۆڕخانەی گەمییەیەکی جەنگیدایە. لە ناوەڕاستی ژێر هەتاوگرەوەکەوە لە بەرامبەر دەرگای هاتنە ژوورەوەدا، یەك شێوە ژوورۆکەی شووشەیی هەبوو: ئۆفیس. بۆ جاری سێیەم قۆناغەکانی تۆمار کردنی زانیارییەکانم بڕی. دیاریکردنی شوناس و پەنجە مۆریان پێ کردم. هەڵسوکەوتی کارمەندەکان بە شێوەیەك بوو مرۆڤ وای هەست دەکرد لە نێو زینداندا نییە، بەڵکو لە فەرمانگەی تاپۆدا لە نێو کۆمەڵێك فەرمانبەری بەڕێز و هەندێك شەکەت و ماندوو دایە. غۆریلاکان ڕۆیشتن. بەندیوانێکی گەنج، ڕێکڕەفتار و کەمردوو وەریگرتم و لە ڕێڕەوە سەرەکییەکەی تێپەڕاندم. لە نێو چوارچێوەی "ناو"ی سەر دەرگای ژووری یەکەم، لە لای ڕاستەوە کە، بە بەردەمیدا تێپەڕین- ژووری ژمارە ٤٤- ناوی "کابالرۆ" نووسرا بوو.

"لارگۆ کابالرۆ"، لەو سەردەمدا سەرەکوەزیرانی ولاتی ڤالینسیا بوو. دەمزانی کوڕەکەی، دوای ئەوەی لە سیڤیل کەوتبووە دوای شۆڕشەوە، شۆڕشگێڕەکان وەك بارمتە ڕایانگرتبوو. چەند ڕۆژێك بەر لە وەی پاریس جێ بهێڵم، ڕۆژنامەکان بلاویان کردەوە کە ئیعدام کراوە. کە وا بێ ئەم هەواڵە درۆ بووە. چونکە کارتی ڤیزیتی "کابالروی" کوڕ، لێرە، لە سەر دەرگای ژووری ژمارە "٤٤"دا بوو. بە زۆر جێگەی ئومێدواری بوو و حەزم لێ بوو دەرگاکە بکوتم و بانگی بکەم "خۆتی"؟

بە بەر دەرگای ژوورەکانی ژمارە ٤٣ و٤٢ یش دا تێپەر بووین. ناوی ئیسپانیاییان بە سەرەوە بوو. لە پێش ژووری ژمارە "٤١" ڕاوەستاین و بەندیوانەکە دەرگای کردەوە. کە وا بێ، ئەمە ماڵی تازەمە. ژوورێکی چوار گۆشە و دڵخواز بوو- هەڵبەت ئەگەر بکرێ وەسفێکی وا بۆ شوێنێکی وا بکرێ_ یەکەم شت کە لە ژوورەکەدا سەرنجمی بۆ لای خۆی ڕاکێشا پەنجەرە

گەورەکەی بەرامبەر دەرگا بوو. ژێرەوەی پەنجەرەکــە لــە ئاســتی ســەری مرۆڤێکــی راوەســتاو دەستی پیَ دەکرد، بۆیە مرۆڤ دەیتوانی قۆڵەکانی لە سەر نشێوییەکەی دیوارەکــە دابــنێ و بــە ئارەزووی خۆی سەیری دەرەوە بکات. پەنجەرەکە رووەو حەوشە دەکرایەوە، حەوشەی گەورە و پڕ خۆڵ و خاشاکی زیندان، قالّدرمەیەکی ئاسنینیان بــە یــەك پارچــەیی بــە پێشــی دا کوتیبــوو، پشتەوەی قالّدرمەکەیان بە تۆڕێکی لە سیمی باریك دا پۆشاندبوو، زیاتر لەو دەرگــا تۆڕییانــە دەچوو، بۆ نەهاتنە ژووری مێشوولّە دروست دەکران. قەرەوێڵەیەکی ئاســنیان بــە دیــواری لای راستەوە نووساندبوو کە، دوای خەوتن دەکرا قیت بکرێتەوە بە سنگی دیوارەوە و بــەم شــێوەیە پانتاییەکی زیاتر لە ژوورەکە بۆ هەڵبەز و دابەز دەمایەوە. لە بەر دەمیدا مێزێکــی ئاســنی و کورسیەکیش کە پێیەوە لەحیم کرا بوو داندرا بوو. ئەوانەیش وەکو قەرەوێڵەکە دەق دەدران. لە بەر پێی قەرەوێڵەکەدا دەستشــۆرێکی گــەورە هــەبوو بــۆڕی ئاویشــیان بــۆ راکێشــا بــوو. لــە بەرامبەریشیدا ئاو دەستەکە بوو. بەندیوانەکە دۆشەکە پڕ لە "کا"یەکەی تاقی کردەوە. مۆر و بەروار بە لەزگەیەك بە دۆشەکەکەوە نووسێندرا بوو. بە دڵنیاییەو بۆ ئەوە بووە بــزانن دوا جــار کەی "کا"یەکەی ناویان گۆڕیوە و پاکیان کردۆتەوە. بەتانییەکی خوریی باشــی هێنــا و گــوتی بەیانی ئەم بەتانی و دۆشەکە بە بــەتانی و دۆشــەکێکی پــاکتر دەگۆڕنــەوە. پاشــان ئــارەزووی شەوێکی خۆشی بۆ کردم و دەرگای لە دیوی دەرەوە بە لێوردبوونەوەیەکی تەواو داخست و قفڵی دا. لە دوای مالاگا، وامدەزانی لە نێو هوتێلێکی زۆر خۆش دام. بەرەو لای پەنجەرەکە چــووم و سەیرێکی دەرەوەم کرد، شەوێکی پڕ ئەستێرە بــوو، حەوشــەیش بێــدەنگ و ئــارام. رووبــەڕوی پەنجەرەکەم، لە راستای دیواری ئەو بەری حەوشەکە، پاسەوانێك، نێزە لــە ســەرشــان پاســەوانی دەدا و جگەرەی دەکێشا. بەکەمە هاوکارییــەکی هێزی خەیاڵ، مرۆڤ دەیتوانی خەیاڵی بۆ ئــەوە بچێت کە خولانەوەی پاسەوانەکە بۆ چاودێریکردنی ئێمە نەبوو، بــەڵکو بــۆ پاراســتنمان بــوو. کاتژمێر دوو و نیو بوو. لە سەر دۆشەکی کا، پاڵ کەوتم و مەستی خۆشی و ئارەزووی هەبوونی بەتانییەك بە ســەرمەوە، خەوم لێ کەوت. لە دەنگی کەڕەنا واگا هــاتم، چــارەگی دەویســت بــۆ حەوتی بەیانی. وامزانی کەڕەناکە، زوڕنای واگا هێنانە لــە خــەو، بــەلام خــۆم لــە گێلــی دا و خەوتمەوە. جاری دواتر کە بێدار بوومەوە کاتژمێر نۆ بــوو. لــە پەنجەرەکــەوە دەنگــی هــاوار و پێکوتان دەهات. سەیرێکی دەرەوەم کرد، حەوشە پڕ بوو لە زیندانی، کە بــە گەرموگوڕییــەکی ئیسپانیایی خەریکی کێبڕکێیەکی تۆپی پێ بوون. هەندێك وەکو یــاریزان و هەنــدێکیش وەکــو تەماشاچی. چوار سەد- پێنج سەد کەسێك دەبوون لە حەوشەکەدا. جلەکانیان هاوشێوە نەبوو و

لە نێو چوار دیوارییەکی گەورەی بە درێژایی و پانیی نزیکەی سەد بە شەست یارد بە ئازادی دەسووڕانەوە. کاتێك چاوم کەوتە سەر بەندیوانێکی یونیفۆرم لە بەر، کە دەمانچەیەکی لە نێك و دارێکی پلاستیکی لە دەستدا بوو و لە ناوە دەخولایەوە و لێرە و لە وێ لەگەڵ زیندانییەکدا دوو قسەی دەکرد و تەنانەت لەگەڵ تاك و تەرایان بە دەم قسە کردنەوە کورتە پیاسەیەکیشی دەکرد. هەموو زیندانییەکان جلوبەرگی مەدەنییان لە بەردا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا شێوە و رووخساریان تا رادەیەك لە یەك دەچوو. چونکە بەشی هەرە زۆریان دێهاتییە گەنجەکانی ئەندەلۆسی بوون و یەك جۆر جلوبەرگیان لە بەر دا بوو: کراسی کەتانی رەنگ هەڵبزرکاوی سەوزی مەیلە و شین و شتێکی وەکو غەرگە. ئەو جا ریشی نەتاشراو، سەری بێ کڵاو و روخسارە هەتاو بردەڵەکانیان، جۆرێك لە هاوشێوەیی و وێکچوونی پێیان دەدا. ئەو جحیلۆکانەی یاری تۆپێنیان دەکرد، لە ناو حەوشەکە بە دوای تۆپ دا ڕاکە ڕاکەیان بوو، ئەو تۆپەی لە پارچە پەڕۆ دروست کرا بوو و بە بەن و دەرزوویش گرێ درا بوو. کۆمەڵێکی دیکە بە درێژایی بندیوارەکەوە، خەریکی شەقتێهەڵدانی یەکدی بوون. کاتێك یەکێکیان لە ژێر پاڵەپەستۆی لێدانەکە چەمابۆوە، لەپەوروو لەگەڵ جفتەکهاوێژەکەدا دەکەوتنە ئەرز، شریخەی پێکەنینیان بەرز دەبۆوە. بەندیوان لە پاڵیان راوەستابوو، ئەویش چێژی لە دیمەنەکان وەردەگرت. ئەوانەی هەندێك زیاتر چوبوونە ناو تەمەنەوە، وردە بەردیان تێدەگرتە نیشانەیەك. ئەوانی تریش خۆیان دا بووە بەر پانتایی بەر تەسکی سێبەرەکە و کتێبیان دەخوێندەوە. هەموو ئەو فستیڤالە وەرزشییە، رێك لەو دیو پەنجەرەکەوە، کە لەو دیو دەکەوتە ئاستی زەوی بەڕێوە دەچوو. لە دوای مۆتەکە خوێناوییەکەی مالاگا، هەموو ئەمانە وەکو خەونێك وا بوو بۆم. پێنج رۆژی تەواو لە نێو ژوورە تاکە کەسییەکەمدا کە بۆگەنیوی خوێن و پیسایی دەدا خۆم گرمۆڵە کرد بوو و کەسێکم بێجگە لە بەندیوانەکە نەبینیبوو و دەنگی کەسێکیشم بێجگە لە دەنگە چەورەکەی چاوەشە نەدیارەکەی مەرگ بەر گوێ نەکەوتبوو. هەر دەنگەدەنگی نێوحەوشەو، گۆڕینی دیمەن و هەمەجۆریی دەموچاوەکان و، چارەنووسە مرۆییەکان کە، خۆیان دەخستە بەر چاوان، ئەو پەڕی سەرمەست و کەیفسازی کرد بووم. بە سەر باسکەکانمدا چەمامەوە سەر رەفتەکە، بەرەو حەوشەکە دەستم بۆیان راوەشاند و بانگیانم کرد. سەرەتا ئەو راستییە کە کەس گوێی لە دەنگم نەبوو یان نەیانویست گوێیان لێ بێ نیگەرانی نەکردم. تەنانەت لە و کات و ساتدا، ئەوەی کە کەسێك بە بەردەم پەنجەرەکەمدا گوزەر ناکات، یان لە راستیدا فەزایەك بە پانایی چەند پێیەك لە پاڵ دیوارەکەدا بە بەتاڵی مابۆوە و منی لە حەوشەکە دا دەبڕاند

سەرنجمی بە لای خۆیدا را نەکێشا. دەنگی تەقە تەقێك لە کونی کلیلەکەدا بەر گـوێم کـەوت، ئاوڕم دایەوە بزانم کێیە دێت. یەکەمینجار بوو لە دوای دەستگیر کردنمەوە، بێ ئەوەی نـاو دڵـم لە ترسا بەتاڵ بێتەوە ، دەمبیست دەرگای ژوورەکەم دەکرێتەوە. هەر ئەو بەندیوانـە بـوو کـە، دوێنێ شەو وەریگرتبووم. چاوێکی بە نێو ژوورەکەمدا گێڕا و دەستی کرد بە جوێن پێـدانم کـە بۆ بە دەنگـی کـەرەنای یەکـەم هەڵنەسـتاوم و ئـەرزی ژوورەکـەمم نەشـۆردووە. ئـەو هەنـدە هاتوهاواری بە سەردا کردم دیوارەکان کەوتبوونە لەرزە لەرزەوە، بەڵام جێی نیگـەرانی نـەبوو. جوێنی پێدام. رێك ئاوها کە عەریفێك جوێن بە سەربازێکی نەشارەزا دەدات. منیش وەکو ئەو سەربازە نەشارەزایە وڵامیم دایەوە کە، تازە هاتۆتە سەربازخانە و رێگە و جێگـە نـازانێ. زوو هێور بۆوە و بۆی روونکردمەوە کە یەکەمجار دەبێ ناوماڵە بەردرێژەکە گەسك بدەم و پاشان بـە سەتڵێك ئاو و کۆنە پەڕۆیەك خاوێنی بکەمەوە. گەسکەکەم دەست دایە و خەریکی گەسکلێدان بووم، بەڵام ئەو هەندە خۆم بە نەزان نیشان دا تا بەندیوانەکە بێتاقەت بوو، گـوتی دەبـێ بلـێم پاککەرەوەیەك بێت و فێرە گەسلێدانت بکات. دەرگای کـردەوە و لـە رێڕەوەکـەدا دەنگـی دا : "ئاغل... ئاغلیتۆ".

فریشتە بچوکەکە بە پێخشان هات و بە خێرایی مەیموونێك کەوتە گەسکلێدانی ژوورەکەم. شێوەی لە پیرێژن دەچوو. پێستی وەکو کاغەز سپی و پڕ چرچ و لۆچ بوو و قەڵافەتی منـاڵێکی دوانزە ساڵانەی هەبوو. تەنانەت یەکجاریش سەیری من یان بەندیوانەکەی نـەکرد، هـەروا کـە چوار دەست و پێ بە دەوری ژوورەکەمدا دەخشی، چاوەکانی وەك چاوەکانی مشکی شـەوگێڕ، خێرا خێرا بەملاو بەو لادا دەسووڕایەوە. لە کەمتر لە دوو خولەك هەموو ناو ژوورەکە گەسـك دراو بە ئاو شۆردراو بە رواڵەت پاك و خاوێن ببۆوە. خۆشترین بەشی یارییەکە بوو. دوای ئەوەی فریشتە بچووکەکە و بەندیوانەکە رۆیشتن بینـیم کـە بـەردەکان وەك پێشـوو پـیس و چڵکنن. کەمێك دواتر خواردنی بەیانییان هێنا. پیاڵەیەکی تەنەکەی پڕ لە قاوەیەکی بـە تـام، کـە لـە تەشتێکی گەورە بە کەوچك تێیان دەکرد، لەگەڵ نانێکی سپی. ئاغلیتو بوو خواردنەکەی هێنا. پێدەچوو لێرە وەکو جۆکەر وا بێ. داوام لێی کرد پێیان بڵێ دەمەوێ ریشم بتاشـم، تـاوەکو لـە دادگا لە تاوانبارەکان نەچم، چونکە چاوەڕێم دەکرد هەر سعاتێك راپێچی دادگام بکـەن. بـەڵام ئاغلیتۆ بایەخی بە داواکەم نەداو دەرگای بە رووما داخست.

دیسان خەریکی ئێشکگریم، گەڕامەوە بەردەم پەنجەرەکە و تا نیوەڕۆ خۆم بە تەماشاکردنی جموجۆڵی نێو حەوشەکەوە سەر گەرم کرد. هێدی و لە سـەرەخۆ دەسـتم کـرد بـە هەڵبـژاردنی

کەسانێك لە چینە بێ ناونیشانەکان. سەرەتا زەینم کەوتە سەر پیرەمێردێك. تەمەنی لە ٧٠ ساڵی تێپەڕی کردبوو، کاتی بە ڕێگا ڕۆیشتندا کەمێك قەمبور دەیدایە چاو. ساقۆیەکی خوریی فشۆڵی لە بەر دابوو. هەر زوو هاودەردیی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. پاشان سەرنجم کەوتە سەر سێ- چوار منالکار کە تەمەنیان لە دەوری ١٣- ١٤ ساڵان بوو. وای بۆ چووم بارمتە گەلێك بن لە ماڵباتە سوورەکان. سێ- چوار پیاوێکی دیکە، کە زۆر ڕێکپۆش بوون و پانتۆڵەکانیان ئەوەی پەڵەولۆچ بێ تێیاندا نەبوو، پێڵاوەکانیان وا بۆیاخ کرا بوو دەبریقایەوە، دوورتر لە خەڵکەکەی دی پیاسەیان دەکرد. لای خۆمەوە نازناوی "ڕێکپۆشەکان"م پێیان دا و سەریشم سوڕما کە ئەمانە ئیدی بۆ چی هێنراونەتە ئێرە.

هەروەك لەگەڵ خۆمدا بیرم لەوە کردەوە دەبێ هەموو ئەوانە زنیدانی سیاسی بن یان خەڵکی ئاساییشیان لە نێو دا هەیە. ڕواڵەتیان وایدەردەخست زیندانیی سیاسی بن. نۆ_دە کەسێکم تێیاندا بینی ڕۆبانێکیان بە ڕەنگی ئاڵای بۆربۆنەکان بە کراسەکانیانەوە بەستبوو و ئەوانی دیکەش هیچ لێیان دوور ناکەونەوە. ئەمە، لەگەڵ وێناکردنی زەینی من بۆ ئەو حاڵەتەی زاڵە بە سەر زیندانە سیاسییەکاندا نەدەگونجا.

لە حەوشەکەدا هەموان جگەرەیان دەکێشاو توتن و کاغەزی سیغار بە ئازادی دەستا و دەست دەکرا. بەو خووەی کە لە ماوەی سەفەرەکەمدا بە جگەرە کێشانەوەم گرتبوو سەختی و ڕەنجی خۆ دوور خستنەوە لە جگەرە، جارێکی تر بەلامەوە زۆر ئەستەم بوو. تۆڕە سیمییەکەی پێش پەنجەرەکەم بە ئەنگوست کون کرد بەو ئەندازەیەی کە جگەرەیەکی پێدا تێپەڕ بێ. کارێکی زۆر ئاسان بوو. تەنیا دەبوایە کەمێك ئەنگوستم بە سەر شوێنێکدا فشار بدەم ئەوجا تاڵەکانی لێك فش دەبوونەوە و کون و کەلێنێکی لێ دروست دەبوو. دەمزانی لە دەرەوەدا ناو ژوورەکەم تاریك دەبیندرێ. بۆیە دەموچاوم بە میلە ئاسنینەکانەوە نووساند و بە هێما و ئیماژە ئەوانەی ناو حەوشەم تێگەیاند کە جگەرە یان هەندێ توتنم دەوێ. سەرەتا وامزانی بە ڕێکەوت کەسێك سەیری لای من ناکات. بۆیە دەستم کردە بانگ کردنیان. بەڵام هەرایەکی ئەو هەندە زۆر بوو زەحمەت بوو دەنگم بگاتە گوێچکەی کەسێکیان، چونکە منیش نەمدەویست هاوار بکەم. لەگەڵ ئەمەشدا، نزیکترەکان دەبێ گوێیان لە دەنگم بوو بێ. بەڵام کەس وەڵامی نەدامەوە. لەوەیا کە ئاوها پشتگوێ خرا بووم دڵگران بووم. ئێستا ئیدی تێگەیشتبووم هەندێ لە زیندانییەکان کاتێ بە بەردەم پەنجەرەکەمدا ڕەت دەبن زۆر بە ڕوونی گوێیان لە دەنگم دەبێ و هێما و ئیماژەکانیشم دەبینن بەڵام ڕوویانم بە خێرایی لێ وەردەگێڕن. جارێکیشیان دیقەتی

ئەوەم دا کە، هیچێکیان لە دە پێ کەمتر لە پەنجەرەکەم نزیك ناکەونەوە. دواجار بینـیم مێـرد منداڵێك کە بلووزێکی کەتانی لەبەر دابوو، سەرەنجی کەسانێکی بۆ لای پەنجەرەکـەم ڕاکێشـا. بەڵام بە هەندێك ترسەوە. سێ چوارێك لە هاوڕێکانی بە دزییەوە ئاوڕی لای مـنیان دایەوە. بـە گەرموگۆڕییەکی زیاترەوە بە جووڵەی سـەر و دەستەکانم تێیانگەیانـد جگەرەیـەکم بگەیـەننێ. پێیانەوە دیار بوو شڵەژاو و هەراسان بوونـە و نـازانن چـی بکـەن و، بـە ترسـەوە ئـاوڕی لای پاسەوانەکەیان دایەوە کە، لەو سەری حەوشەوە ڕاوەستا بوو. ئەوجا یەکێکیان دوو پەنجـەی بـە خێرایی خستە سـەر لێوی و شانەکانی هەڵتەکاند و لەوێ هەڵاتن. ماوەیەکی زۆری دەوێ لە نێو جەنجاڵی و شڵۆقییەکی پڕ لە گاڵەگاڵ و هەرا هۆریای حەشیمەتێکی ٣٠٠- ٤٠٠ کەسـیی لـە نێو حەوشەیەکدا، وردە شت و جووڵە و بزاوتەکان وەك خۆی ببینی. هەر بۆیە تا ئەوساتە نیگا و سەرنجم نەکەوتبووە سەر ئەو هێڵە سپیە کاڵەی کە بـە ئاسـتەم دەکـرا ببیـنی و زیـاتر لـە ئاسەواری هێڵکێشییەکی سڕاوەی زەوییەکی تێنس دەچوو کە ماوەیەك بوو بێ، کەس بە لایـدا نەچووبێ و، تەریب لەگەڵ دیواری ژوورەکەی منیـان کێشـا بـوو. هێڵەکـە لـە کۆتـایی ڕیـزە ژوورەکانی هاوڕیز لەگەڵ ژوورەکەی من، واتە لە پێش ژووری ژمارە "٤٤" کە کاڵبارۆی تێـدا بوو، دەستی پێ دەکرد و بە بەردەم پەنجەرەکەی مندا تێدەپەڕی و چەند ژوور ئـەولاتر، بـە لای چەپەوە، تا ئەوەی من بزانم، پێش ژووری ژمارە "٣٦" دەبڕایەوە. لەوێ بەدوا، واتە لە ژووری ژمارە "٣٥" بەرەو ژێر، زیندانییەکان بەو پەڕی ئازادییەوە هەتا لای دیوارەکە دەهـاتن و لـە پەنجەرەوە لەگەڵ زیندانییەکانی ئەم ژوورانەوە قسە و گفتوگۆیان دەکرد. بەڵام لە ژووری ژمـارە "٣٦" تا "٤٤" قەڵەمڕەوێکی یاساغ بە پانایی ١٠ یارد "گەز" لە نێوان دیوار و هێڵە سپیە کاڵبووەکەدا هەبوو. ژوورەکانی ئەمدیو هێڵەکە، کە ژووری منیشیان لە ناودا بوو، بە ئاشـکرا "ناوچەی حەرام" بوون و کەس بۆی نـەبوو تخوونیـان بکـەوێ. بۆیـە ئێسـتا لـەوە دەگەیشـتم زیندانییەکانی حەوشەکە دەترسێن بەرەو لای پەنجـەرەی ژوورەکـەی مـن بـێن. لـەوە دەترسـن ببیندرێن. دیار بوو دەیانزانی بە وردی لە ژێر چاودێری دان. ئـەوەی مـن نەمـدەتوانی ببیـنم ئەوان دەیانبینی. دەیانبینی لە پەنجەرەکانی نهۆمی سەرەوە، کۆمـەڵێ چـاوی تیـژ، تێبڕاوەتـە حەوشەی خوارەوە. بێگومان لەو دیو پـەردەی ئـەم نمایشـە لـە شـادومانی، شـتێکی نـامۆ و ناسروشتی، خۆی حەشار دابوو. ئێستا ئیدی دەمتـوانی لەوە بگەم چی ڕوودەدا. ئەمە ئیدی چی کەرنەڤاڵێکی شووم و ڕەزا قورسـە. ئایا هەمـوو ئەوانەی خەریکی شەقاشەقێن و تۆپێن بـوون و دڵیان بەوە خۆش بوو وازی دەکەن و لە ژێر هەتاوە درەوشـاوەکەی حەوشـەدا پیاسـەیان دەکـرد

تەنیا چاوەڕێی هەڵهاتنی سپێدەیەکی تر بوون یان چاوەڕێ بوون دەنگێکی چەور ناویان جاڕ بدا؟ بۆ منیان فڕێدابووە ژوورێکی یاساغ؟ بۆ لێنەگەڕابوون منیش بچمە حەوشەکەوە لەگەڵ ئەوانی تر و، بۆ زیندانییەکانی ناو حەوشەکە، ئەو هەندە لە سەیرکردن و ئاوڕدانەوەی لای من دەترسان؟ ئایا بە ڕاستی ترس بوو، یان شەرم و سەر لێ شێواویی ئەو مرۆڤە ساغلەمانە بوو کە نیگایان لە ڕوانینی نەخۆشێکی لاعیلاج، کە مۆری مەرگ لە نێوچەوانی دراوە، دەدزنەوە؟ ئێستا ئیتر، ئەوەی لە سەرەتاوە هێدی هێدی بۆم ڕوون دەبۆوە باوەڕم پێ کرد. منیان فڕێ دابووە یەکێك لە ژوورەکانی حوکم بە سەردا دراوەکان.

فراڤینیان هێنا. شۆرباى لۆبیا کە بە ڕۆن لێنرابوو لەگەڵ پارچە نانێکی سپی. شۆرباکەیان تێکردە ئەو پیاڵە تەنەکەیەی قاوەی بەیانیم تێیدا خواردەوە و کاتی تێنوێتیشم ئاوم تێیدا خواردەوە. دیسان ئاخلیتۆ بوو خواردنی بۆ هێنام، بەڵام ئەمجارەیان بەندیوانێك لەگەڵی دا بوو. بەندیوانەکە دەموچاوێکی خڕکەڵە و سووری هەبوو، کەمێکیش زمانی فەرەنسایی دەزانی. گەشابۆوە لەوەیا دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوتووە زانیارییەکانی لە بەرامبەر بیانییەکدا بخاتە ڕوو، کاتێکیش داواکارییەکانم یەکە بە یەکە بۆ ژمارد بە پشوو درێژی گوێی بۆ ڕاگرتم. ویستم ریشم بتاشن. پارچە سابوونێك و شانەیەك و خاولییەکیشم پێ بدەن. کاغەز و پێنووسم ویست تا نامەیەك بۆ کونسوڵی ئینگلتەرا بنووسم. کتێبێك لە کتێبخانەیەکی ناو زیندان و چەند ڕۆژنامەیەکیشم داوا کرد تا بیانخوێنمەوە. داوام کرد ڕێگام پێ بدەن وەکو زیندانییەکانی دیکە بچمە ناو حەوشەوە. داوام کرد پارەکانم کە دەستیان بە سەردا گرتبوو بۆم بگەڕێننەوە تا جگەرە و کەوچکێکی زیادیی پێ بکرم. زۆر بە وردی گوێی بۆ هەموو ئەو داواکارییانەم ڕاگرت. بە بیستنی هەر داواکارییەك سەری بۆ دەلەقاندم بە هێمای ئەوەی هەموو داواکارییەکانم ڕەوا و بەجێن. پێشنیارم بۆی کرد داواکانم لای خۆی یادداشت بکات تا هیچیانی لە بیر نەچێتەوە. وڵامی دایەوە کە قەت شتێك لە بیر ناکات، چونکەی زاکیرەیەکی زۆر بە هێزی هەیە و بۆ دڵنیا بوون، بە ناو لەپی دەستی بە هێواشی کوتای بە نێوچەوانی خوێدا. پاشان گوتی دوای کەمێکی تر دەگەڕێتەوە، بە ڕاستیش گەڕایەوە. ڕێك دوو هەفتە دواتر، کاتێ نۆرە ئیشکگرییەکەی دووبارە ئەوی هێنایەوە ژوورەکەم. هەڵسوکەوتی وەك جاری پێشوو دۆستانە بوو. وەك جاری پێشووش گەرموگوڕییەك لە قسەکردنیدا هەبوو. کاتێ سەر لە نوێ هەموو داواکارییەکانم بۆ ریز کردەوە بە هەمان پشوو درێژیی جاری پێشوو گوێی بۆ ڕادێرام. ئەو داواکارییانەی ڕۆژی سێ جار، بۆ ماوەی دوو هەفتە، بۆ هاوکارە بەندیوانەکانی،

بێ هیچ وڵام وەرگرتنەوەیەك دووپاتم کردبوونەوە. فراڤینیان کەمێك بەر لـە کاتـژمێر یـەك هێنـا بوو. کاتژمێر یەك، زیندانییەکانیان لە حەوشە دەگەڕانـدەوە نێـو ژوورەکانیـان. لـە ئیسـپانیادا، خەوی پاشنیوەڕۆ، لە کاتژمێر یەك تا کاتـژمێر سـێ درێـژە دەکێشـێ، چـی لـە نـاو فەرمانگـە حکومییەکان، یان لە نێو کارگە و کارخانەکان، لە بەرەی شەڕ و لە نێو زیندانیشـدا. بـۆ مـاوەی چارەگە سعاتێك، چوار دیوارییە گەورەکەی حەوشە، چۆڵ و هۆڵ مایـەوە. پاشـان دەرگایـەك لـە دیوارەکەی بەرامبەر ژوورەکەم کرایەوە و دوو زیندانییان بـەرەڵڵا کـردە نێـو حەوشـەکەوە. هـەر دووکیان زۆر بژوێن و پاك و خاوێن جلوبەرگیان لە بەر کردبوو. بێ راوەسـتان دەسـتیان کـرد بـە پیاسە کردنێکی خێرا بۆ لای سەرەوە و بۆ خوارەوە. یەکێکیان هەنگاوەکانی بە پتەوی و مـوکمی دەهاوێشت و نەترسی و بڕوا بە خۆبوونێکی زۆری پێوە دیار بوو. نازنـاوی "لـۆرد بـایرۆن"م پـێ بەخشی. هاوڕێکەی، هێمنتر و لە سەرەخۆتر بوو. هەر دوو گوویـەکانی چـاڵ ببـوون و مـرۆڤ بـە بینینی وای هەست دەکرد نەخۆشی سیلی هەبێت. بۆ ماوەی دوو کاتـژمێری تـەواو، بـێ ئـەوەی رابوەستن، بە درێژایی حەوشە هاتوچۆیان کرد تا زەنگی کاتژمێر سێ لێیدا. ئەوسـا بەنـدیوانێك ئەوانی گەڕاندەوە نێو زیندانەوە. دە خولـەك دواتـر، سـەر لـە نـوێ گرووپـەکـەی پێشـنیوەڕۆیان هێنایەوە دەرێ. هەموو پاشنیوەڕۆکە لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە، سەیری ناو حەوشەم کرد. بـەڵام چیدی هەوڵم نـەدا هێمـا و ئیماژەیـەکیان پـێ بـدەم، یـان پەیوەندییـەك لەگـەڵ خـەڵکانی نـاو حەوشەکەوە بەرقەرار بکەم. بابی ئەوەندە دڵخۆش بووم کە، نەمەوێ کەس ئاوڕی لای پەنجەرەکـەم بداتەوە. دڵخۆش لەوەیا کە وەکو تەماشاچییەکی نەبیندراوو بێدەنگ، بەشدار بووم لە ژیانە پڕ لە گەرموگوڕییەکەی دەرەوە. کەمێك بەر لە کاتژمێر حەوتی ئێوارە، شیویان هێنا. شۆربای نیسـك کە، بە رۆن لێنرابوو لەگەڵ پارچە نانێك. خواردنی زیندانییەکانیان بۆ بردنە حەوشەکەوە. کەمێك بەر لە کاتژمێر هەشت ئەوانیان گەڕاندەوە نێو بیناکەوە. حەوشە چۆڵەکە نوقمی نێو تاریکی بوو. کاتژمێر نۆ، کەرەنایەك دەنگی لێوە هەستا. کاتژمێر دە، کـەرەنای بێـدەنگیی ئیسـپانیایی، بـە ئاوازێکی زۆر رۆمانسی و پڕ لە سۆز ژەندرا. لە ژوورەکەی بان ژووری مـن لـە نهـۆمی سـەرەوە، یەکێك پێڵاوەکانی دادەکەنـد و فڕێیـانی دەدایـە سـەر ئـەرز تـا تـەق و هـۆڕی بێـت بـە سـەر بەردەکانەوە. دەنگەکان کپ بوون و دەتگوت هەموو کون و کەلەبەرەکانیان بە لۆکە ئاخنی. بەڵام گڵۆپی ژوورەکەم بە درێژایی شەو بە هەڵگیرساوی مایەوە.

## ١١

بە درێژایی ئەم شەوی دووهەمـەی "سـیڤیل" پـەیتا پـەیتا لـە خـەو رادەچـڵەکیم و بـیرم دەکـردەوە دەتـوانم ژاوە ژاو و دەنگـە چـەورەکەی زینـدانی مالاگـا ببیسـتم. بـەڵام کپـی و بێدەنگییەکی تەواو زاڵ بوو. هەر چەندە رۆشنایی گڵۆپەکەی بە بنمیچەوە لە ناو چـاومی دەدا بەڵام هەڵبوونی گڵۆپەکە، خۆی نیعمەتێکی گەورە بوو. رۆشـنایی، تارمایـیـەکانی شـەوانە ڕاو دەنێت. هێشتا گێژ و وڕی مۆتەکەکـە بـووم، لـە دڵـی خۆمـدا دەمگـوت ئەمـە زینـدانێکی راستەقینەیە نەك وەکو سەربڕخانەکەی مالاگا، دوای حەوت مانگ شەڕی نێو خۆیی، بێگومان بارودۆخەکە ناسایی ببۆوە. بێشك لێرە شتێك بە ناوی ئیعدام بوونی نییە. راستە ئەوان فڕێـیـان داومەتە ژووری حوکمدراوەکان بەڵام رەنگە لەم کارەیانـدا هـیچ مەبەسـتێکیان نـەبێ. لێـرە، رۆژەکان زۆر ناسایی تێپەڕ دەبـوون. ژیـان جـۆرە رێکخسـتنێکی هـەبوو. کـەرەنا لێـدەدرا و تەنانەت دۆشەکەکانیش لەزگەی بەروارِیان لە سەر درا بوو. بـە راسـت، هاتـەوە بـیرم، لەگـەڵ ئەوەیدا بەندیوانەکە بەڵێنی پێدا بووم کەچی دۆشـەك و بەتانییەکـەیان بـۆ نـەگۆڕیم. پەسـتی کردم. لەوەیا کە وەك جاری جاران دەمتوانی لـە هـیچ و خـۆڕایی پەسـت بم دڵخـۆش بـووم. پاڕامەوە : خوایە گیان، وردە خـەم و خەفەتـەکانی رۆژانـەم لـێ مـەگرەوە. خوایـە، لێگـەڕێ

وەکجاران گلە و گازاندەم لە ژیان هەبێ و بەشە ژیانی خۆم بە نەفرەت بکەم و نامەکانم وەڵام نەدەمەوە و ببمە هۆکاری ئەزێت و ئازاری هاوڕێکانم. دەبێ سوێند بخۆم ئەگەر لەم بەڵایە رزگارت کردم ببم بە مرۆڤیکی باشتر؟ خوایە، هەردووکمان، هەم من و هەم تۆ، باش دەزانین کەس ئەو سوێندە نابەدڵانەی لە بیر نامێنێ، خوای گەورە، کە وابێ داوای خاوە و بەرسمێلانەم لێ مەکە و هەوڵ مەدە بمگۆڕیت بۆ مرۆڤێکی رۆحانی، ئامین.. لێرەدا دەنگی کەرەناکە واگای هێنام. ئەمجارەیان، خێرا و چاپوك هەستام و بێ شانە و سابوون ئەوەندەی بۆم کرا خۆم شۆرد و پاك بوومەوە و ژوورەکەیشم خاوێن کردەوە. بە تەواوی لێبڕا بووم خۆم لەگەڵ بارودۆخە نوێکەمدا بگونجێنم. گۆرانییەکی فلیمێکی ئەڵمانی مێشکی کون کردبووم "ژیانێکی نوێ، خەریکە دەست پێ دەکات" فلیمێکی هیچ و ناخۆش بوو، ساڵێك لەمەوبەر بینیبووم و دوای ئەوە بۆ یەك جاریش نەهاتەوە بیرم. بە درێژایی گۆرانییەکە، شتێکی بێزارکەر وەکو مێشێکی منجڕ لە گوێچکەکانمدا گیزە گیزی کردبوو، منیش سەرەڕای هەموو هەوڵەکانم نەمتوانیبوو مێشەکە لە ناو گوێچکەمدا وەدەرنێم "ژیانێکی نوێ، خەریکە دەست پێدەکات".

کاتژمێر هەشت، زیندانییەکان جارێکیتر هاتنەوە حەوشە، منیش گەڕامەوە شوێنەکەی ئێشکگریم. ئێستا ئیدی خۆم وەکو وردە بۆرژوایەکی پاریسی دەهاتە بەرچاو کە، کراسێکی نیو قۆڵم لە بەر دایە و سەبیلێکم لە دەمدایە و لە پەنجەرەکەوە خۆم چەماندۆتەوە تا سەیری هاتوچۆو جەنجاڵی نێو بازاڕەکەی ژێرەوە بکەم. کەمێك دواتر مێشکی خۆم بە هاوکێشە هەزلوولییەکەوە خەریك کرد. دیوارەکانی ئەم ژوورەی من، سپی سپی بوون و گەردیلەیەك پەڵەیان لە سەر نەبوو، دەتگوت چێ کراون تا شتیان لە سەر بنووسرێ. دیسان لە باتی قەڵەمدار، سوودم لە تاڵە سیمێکی رەقی قەرەوێڵەکەم وەرگرت. بە خەتخەتۆکەیەکی تێکەڵ و پێکەڵ دەستم کردەوە بە یادەوەری نووسین لە سەر لا دیوارەکانەوە، بەڵام زوو کۆمەڵێ هێڵم بە سەر داهێنان. تا ئەو کاتەی رستەکانم لە نێو زەینمدا دووپات دەکردەوە زۆر شتی بە جێ و ئاقڵانە بوون، بەڵام هەر ئەوەندەی کە دەمویست بە سەر لا دیوارەکەدا بیاننووسمەوە، دەتگوت تەلیسم و سیحرم لێ دەکرا. دەگۆڕان بە چەند رستەیەکی کاڵەوەبووی رۆمانە عیشقییەکانی فلس باوی. دیسان فراڤین لۆبیای کوڵاو لە نێو رۆن بوو. بیرم کردەوە لەوانەیە بەشی یەك هەفتە خواردن بە جارێك لێ دەنێن. رێك لە کاتژمێر یەکدا، دیسان بایرۆن و سیلاوییەکە، لە حەوشە پەیدا بوونەوە و، کاتژمێر سێ دیسان لە بەر چاوان بزر بوونەوە. پاڵە پەستۆیەکی زۆرم هێنایە سەر مێشکم تا لەوە تێبگەم ئەم دوو کەسە چ تاوانێکی گەورەیان کردووە لێ ناگەڕێن لەگەڵ

زیندانییەکانی دیکە بێنە حەوشە. گەیشتمە ئەو دەرەنجامەکە، کەی دەبێ جۆرێک حاڵەتی بەرزەخییان هەبێ لە نێوان سنووورداربوونی بەندیی تاکە کەسی من و، ئازادییە ڕێژەییەکەی ئەوانی تر هەیانبوو. پاشنیوەڕۆ ئەو ڕۆژە، تووشی بەڵایەکی بچووک بووم. کاتژمێرەکەم لە کار کەوت. ترسێکی سەیر دایگرتم. بیرم لەوە کردەوە ئەگەر پێپلیکانەی کاتژمێر و خولەکەکانیشم نەمێنێ چنگیان لێوە گیر بکەم، بێشك لە تروسکایی ئومێدی ڕزگار بوون، لە نێو ڕاوەستانی وڕوگێژکەری زەمان دەخنکێم، بەڵام بەو تاڵە سیمە جۆکەرەکەم، ئەو هەندە دەستم لە جەرگ و هەناوی سعاتەکە وەردا، بۆ خۆی کەوتەوە کار. پاشماوەی دوای نیوەڕۆیەکەم بە بیرکاری و شیعر خوێندنەوە و شەڕی تروا بەڕێ کرد.

ئەو جا دیسان شۆربای نێسکێنە و کەرەنای کپبوون. هەمدیسان شەوێکی تری ڕووناك بە ڕۆشنایی ئەلەکترێك هاتەوە. ڕۆژی دواتر، شانزەهەمی شوبات بوو. بە پێی شێوازە باوەکەی ڕاگرتنی حیسابات، هەندێ هێڵم بە سەرلا دیوارەکەدا کێشا بوو تاحسێبم لێ تێك نەچێ. یەکەم شت کە کەرەنای بەیانی وەبیری هێنامەوە، ئەوە بوو کە لەگەڵ ئەمڕۆدا دەبێتە هەفتەیەك لێرە بەندکراوم. لای خۆم بیرم کردەوە ژماردنی ڕۆژەکانی زیندان هاوشێوەی ژماردنی ڕۆژە سەرەتاکانی لە دایکبوونی مناڵانە : سەرەتاکەی تێپەر بوونی هەفتەکانی ئاهەنگ دەگێڕن، دواتر مانگەکان، پاشان ساڵەکان.

ئەمڕۆ نۆرەی مێژووی ئینجیل و، پاشان ئەدەبیاتی فەرەنسا بوو. بەڵام ئەم دوو بابەتە کەمتر منیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا. بە ترسەوە، لەو ڕاستیە گەیشتم ئەوەی فێری ببووم، بەشی هەرە زۆریان چەند خاڵێکی نارۆشنیان تێدا هەبوو، ڕێك وەکو عەبای مامۆستایەکی زانکۆ کە مۆریانە لە هەموو جێی دابێ. توانای کۆکردنەوەی زەینم نەبوو، نەیشمدەتوانی خۆم فڕێ بدەمە نێو دنیای خەون و خەیاڵاتەوە. یاریزانەکانی تۆپێن لە ناو حەوشەکەدا، ڕێساکانی ئۆفسایدیان لە بەر چاو نەدەگرت و پەست و توڕەیان دەکردم. کۆنترۆڵی بیر و هۆشم چیدی لە توانامدا نەبوو. ستێرنی ئاراستەی بیروهۆشم بە هەر لایەکدا دەسووڕاند. هەر بۆ خۆی دەسووڕا. هەندێ کاتی خۆم بە کوشتنی مێشەکانەوە بەڕێ دەکرد. لە ئانو ساتی ئەم خۆ سەرگەرمکردنانەدا دووچاری حاڵەتی "تۆ قەت ناکوژی"ت هاتم کە تۆسقاڵێك حاڵوهەوای شێتایەتیی مەزهەبیی تێدا بوو. بچووکترین هەوڵدان بۆ بیرکردنەوەیەکی ڕێکوپێك، لە ڕووی جەستەییەوە ئازاری دەدام و، وام هەست دەکرد سەرلە بەری کایە پەیوەندییەکانی مێشکم ئاگریان تێ بەربووە. گوشارپێو هەر دادەبەزی و دادەبەزی. ماوەیەکی زۆر بوو، قۆناغی

گۆڕانکاری تێپەڕیبوو، ماوەیەکی زۆر بوو میلی نێوان " گەردەلوول، باو باران" لە بەملاو بەولادا کەوتن بوو، تەنیا ئەو شتەی جێگیر مابۆوە تەمێکی خەستی خنکێنەر و خەمۆکی بوو. دەردبوو دەکەوتە سەرئازار، شەوێکیتری بێ خەویی، کە ناڕوا و نابڕێتەوە و بە بێ خەوییەکەیەوە و بە ئەستەم ڕۆژی دواتر، ڕۆژی هەشتەمین بە خۆی دا دێنێ. ڕۆژی دووبارەبوونەوەی زوڕنا لێدانەکان و لۆبیای ناو ڕۆن، ڕۆژی دووپاتکردنەوەی هەوڵە بێ ئەنجام و جەرگبڕەکان بۆ چوونە نێو دنیای ئەندێشە و بیرکردنەوە، بۆ دۆزینەوەی خود، بۆ بوون بە بوونەوەرێکی هزرمەند، نەك مرۆڤێکی بێکەلکی وا بەزەییت پێیدا بێتەوە.

پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆژی هەشتەم، هەستم کرد ئیدی ناکرێ لەوە زیاتر بەرەو داڕووخان شۆڕ ببمەوە. وام بە بیردا هات، ڕێك وای کە، هەر مرۆڤێکی کەمناوەز بیر دەکاتەوە، بەم زوانە ئیدی شێت دەبم. لێرەدا بوو هاتە زەینم "دانتێ" چوار ساڵی ڕەبەق، بە زنجیر بە پێچکەی ئاسنی کورسییەکەوە بەسترابۆوە، ئەویش لە نێو ژێر زەمینێکی تاریك و ئەنگوستە چاودا. دانیشتبوو، تەنانەت لە توانایدا نەبوو کەمێك پێشە و پاش بڕوات یان تۆزێ پاڵ بکەوێ. چوار ساڵی ڕەبەق، واتە هەزار و پێنجسەد ڕۆژ. کە چی هیچ شێتیش نەبوو. هەوڵمدا ئەم نموونەیەم لە بەر چاودا بێ، هەروەها چارەنووسی زیندانیی و کۆیلە ڕۆمییەکانی کە، لە نێو کەشتیە سەوڵییەکانی سەدەکانی ناوەراستدا زنجیر دەکران، لە نێو زەینمدا زیندوو بکەمەوە و لەم بیرکردنەوە ئاسوودەییبەخشانە کە "شوومی"یەکی کەمتریان هەبوو، هەندێ دڵ و جەرگم قایمتر بکەم. بەڵام ئەمەیش بێتامترین جۆری دڵدانەوەی خۆم بوو. وەك ئەوەی کە بڵێیتە کەسێك کە، قاچێکی خۆی لە دەست داوە، کەسانێك هەن هەر دوو قاچیان لە دەست داوە، ئایا ئەمە دڵدانەوەیە یان چەواشە کردنێتی. لە ئاست و پلەیەکی دیاریکراو لە بێدەسەڵاتیی و بێچارەییدا، ئیدی هەر جۆرە بەراوردکردنێك واتای خۆی لە دەست دەدات. سەرەڕای ئەمەیش کەوتە زەینم، کە زیندانییەکی "هەتا هەتایی" ئاسایی، باشەیەکی هەیە : هیچ نەبێ لەوە دلنیایە لە سێدارە نادرێ، بۆیە خۆی لەگەڵ بارودۆخەکەیدا دەگونجێنێ، حوکمی تا هەتاییش، تا هەتاییە ئیدی، هیچ نەبێ واتای دڵنیا بوون و کۆتایی ترسە. پەندێکی کۆن دەڵێ "مرۆڤ هۆگریی بە هەموو شتێکەوە دەگرێ" و، پەندێکی دیکەی کۆن هەیە دەڵێ "دەستە و ئەژنۆیی لە مردن ناخۆشترە". ئەمانە بیرکردنەودیەکی یەکجووری بوون و وەکو دەستاڕ لە نێو کاسەی سەرمدا هاڕەی دەهات. دەستاڕ، ئەو بەردە ساکار و هەرزانبەهایە. وێڕای ئەمەیش، چیدی پێویستیم بەوە نەبوو ئێرەییم بە "تا هەتاییەکان" دا بێتەوە. سێ ڕۆژ دواتر، یەکەم حوکمدانی ڕەسمی

خۆمم لە بەرپرسە پەیوەندارەکانەوە وەرگرت. بە مەرگ حوکم درا بـووم، بـەڵام ئەگـەری ئـەوە هەبوو ئەم حوکمە بۆ "تاهەتایی" بگۆردرێ. لە نێونەم بێچارەییەمدا، کاتـژمێر چـوار و نیـو مەسیحییەك لە نێو پۆشاکی سەرتاش دەرکەوت. بە درێژایی ئەو چەند رۆژە سـەرم لـە پەرچـە کردارەکانم سورمابوو. بارودۆخی نائاسایی کاردانەوەی نائاسایی لێ دەکەوێتەوە. هەمـوو دامـو دەزگاکانی مێشکم لە سەر بنەمای یاساگەلێکی نوێ، کە بە تەواوی بـە منـەوە نـامۆ بـوون، کاریـان دەکـرد، خـۆم وەکـو شـوفێرێك دەهاتـە بەرچـاو وابزانـێ سـەری لـە ورد و درشـتی ئوتومبێلەکەی دەردەچێ بەڵام کتوپڕ دەبینێ هەر جارێك پێی لە سەر پایدەری بەنزین دادەگرێ ئوتومبێل بەلارێدا دەکەوێ و، هەر جارێك سـتۆپ دەگـرێ ئوتومبێلەکـەی بـە دەوری خۆیـدا دەسووڕێتەوە. بۆ نموونە، سەرو بیچم و رواڵەتی سەرتاشەکە لـە دەروونـدا تووشـی هـەژانێکی وایکردم کە بە راستی بۆ ئەوەی نەکەومە سـەر زەوی پەلاماری بەلوعەکەی ئاوم دا تـا خـۆمی پێوە بگرمەوە. هەستم کرد چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك. سەرتاشەکە، لەو دیو کریستاڵەکانی فرمێسکەکانی چاوانمدا، لە شێوەی هەموو رەنگەکانی پەلکە زێرینە، وەکو شەپۆلێك لە نوور و رۆشنایی، رەنگی دەدایەوە و خۆی دەنواند. رزگارکەرێك بوو دەبوا لە هەر ئافەتێکدا بمپارێزێ. ئەو هاتبوو. هەموو شتێك سەر لە نـوێ بـەرە و باشـییەکەی جـاران دەڕۆیـی و تـا شـەبەردە پتەوەکانی ترس و بێدەسـەڵاتیم وەك دنکە بارانی بەهاران کەوتە مەلـە کـردن لـە فـەزاوە وەك ئەوەی هەر دنکە بارانێکت پڕ کردبـێ لـە غـازێکی سـووك و فرێنـەر. بـە پێـی لـۆژیکێکی شێتانەدا، وردە چەوێك دەتوانێ کێوێك لە بەفرلە شوێنی خۆیـدا بجـوولێنێ یـان لـە جـووڵانی بوەستێنێ. کێوە بەفرینەکەی نائومێدیم توایەوە و شێوازی ئەو گەردیلە کەفە سپیانەی بە خۆوە گرت کە سەرتاشەکە، سەرو چاومی خستە ژێریەوە کەفەوە. لێدەنـەوە لـە تـەپڵی شـادومانی، لێدەنەوە لە تەپڵی شادومانی، وا خەریکن ریشم دەتاشن و، من جارێکی تر لە سەر زەویم. لەو کاتەیدا کە ریشیان دەتاشیم، دۆن ئانتۆنیۆ، ئەو بەندیوانە میهرەبانەی کە، رۆژی پێشتر لە نێو حەوشەدا ئیشکگری دەکرد، لەو لاترم راوەستا بوو چاودێری دەکرد. یەکەم بەندیوان بوو کە، بە واتا راستەقینەکەی لەگەڵ من دەدوا. لەوێوە کە زیندانیی تاکە کەسیی بـووم دوانـدنم و قسـە لەگەڵ کردنم یاساغ بوو، ئێستا بەندیوانەکان تەنیا لە کاتی هێنانی خواردندا دوو قسەیەکی بێ کەلکیان لەگەڵدا دەکردم. ژووری زیندان، لە ئەشکەوتێکی داخراو دەچوو، کە دیـوارێکی سـێ چین زرێپۆشکراوی هەبێ، سێ چینی کپـی، تـەنیایی و تـرس. ئـا، ئـەی دڵارامـە گەورەکـەی هاورێـیەتی سادەی مرۆیی! سەرتاش، سەرچاومی خستە ژێر کەفەوە، "دۆن ئانتۆنیۆ" لە سـەر

قەرەوێڵەکە دانیشت و جگەرەی خۆی کێشا و، دیـوارە سێچـینییە زرێپۆشـەکەی هاوشـێوەی دیوارەکانی ئەریحا دارِما. سەرتاشەکە لێی پرسیم ئایا تیخەکە دەموچاوم دەورِوشێنێ یـان نـا، گوتم، تیخێکی زۆر باشە. دۆن ئانتۆنیۆ گوتی ئایا دەمەوێ جگەرە بکێشم یان نـا، گـوتم زۆرم حەز بە جگەرەکێشانە. سەرتاشـەکە لـە ریشتاشـینم بـۆوە. دۆن ئـانتۆنیۆ جگەرەیـەکی بـۆم پێچـایەوە و دایگیرانـد. ئـۆە سـۆزانا، هـەر چـۆنێکی بـێ، ژیـان هـەر خۆەویسـتە! هـەر جگەرەکێشێکی بە ئـەزموون دەزانـێ کـە کێشـانی یەکـەم جگـەرە لـە دوای چـەند رۆژ بـێ جگەرەیی، کەمێك مرۆڤ گێژ دەکات. وا بزانم هەموو دووکەڵی جگەرەکـەم بـە یـەك هەناسـە هەڵکێشا. قومی درێژ و قووڵم لێدەدا و ژوورەکە، وردە وردە بە دیار سەرمەوە دەسوورِا.

چەند خولەکێك دواتر، سەرتاشەکە خەریکی تاشینی قژم بوو. ئەوەندە هاتبوومەوە سەرخۆم بتوانم دوو قسەی بە جێ لەگەڵ "دۆن ئانتۆنیۆ"دا بکەم. لەوە گەیشتم کە ئەوانەی ناو حەوشـە گەورەکە بە راستی هەموویان زیندانیی سیاسین. هەندێکیان دیلی شـەرِو، هەنـدێکی تریشـیان "کۆماریخوازەکان، سۆشیالیستەکان، کۆمۆنیستەکان و ئەنارشیستەکان"ی سیڤیل و گوندەکانی دەوروبەری بوون. بێجگە لەوانە، هەندێکیشیان "فالانژیست و لیژیۆنێر"ە بیانییەکانی سـوپای "فرانکۆ" بوون کە بە هۆکاری هەڵاتن لە سوپا یان نافەرمانیکردن دەستگیرکرابوون. تەنانـەت دوو " مۆر"یشیان دەنێودا بوو. شەوی پێشتر دەنگی یەکێکیانم بەر گوێ کەوتبوو کـە ئـاوازی خەمناکی عەرەبی دەخوێند. دۆن ئانتۆنیۆ نەیویست تەنانەت یەك وشەیش لـە بـارەی مـاوەی حوکمـدراوەکان یـان دادگـاییکردنی زیندانییـەکان بـدرکێنێ. بـەڵام بـە تەوسـەوە شـانەکانی هەڵتەکاند و منیش هەستم کرد هەرە زۆری زیندانییەکان بە تایبەت گوندییەکان کـە لـە رووی بیرو بۆچوونەکانییانەوە جێی گومان بوون، هەر لە بنەرِەتدا نەبردراونەتە دادگا. هەروەها بەر لە هەفتەیەك چەند زیندانییەکیان لە مالاگاوە هێنا بوو. بەڵام ئیدی لەوێ نەبوون. بە شـەوقێکی ئاشکراوە پرسیارم کرد چییان بەسەر هات. دۆن ئانتۆنیۆ جارێکی تـر شـانەکانی هەڵتەکانـد و گوتی "Semarcharon" "ئەوان رۆیشتوونە" و، چیدی ئامادە نـەبوو قسـەیەك لـەم بارەیـەوە بکات. لێیم پرسی هیچ "ئاساییەك" لە نێو زینداندا هەیە یان نا؟

"دۆن ئانتۆنیۆ" وڵامی دایەوە "چەند کەسێك نا، ئـەوان لـە نێـو "حەوشـە جوانەکـە"دا وەرزش دەکەن. مەبەستی لە "حەوشە جوانەکە" بەندیخانەکەی نێو بیناکەی ئـەولاترمان بـوو. بچووکتر بوو. گوڵ و دار و بار و کورسیشی لێ بوو. پێشتر _ مەبەستی بەردەوامی ئانتۆنیۆ لە وشەی پێشتر، سەردەمی کۆماریخوازان بوو _ پێشتر حەوشـە جوانکیلەکـە، تایبـەت بـوو بـە

زیندانیانی سیاسی و حەوشەی گەورەش یان تێکەڵاو یانیش بۆ "ئاساییەکان" بوو. ئێستا کارەکان پێچەوانە بۆتەوە. مەتەڵی ئەو ڕۆبانە میللییانەی زیندانییە سیاسییەکان بە بەرچیلیانیانەوە دەکرد ئاشکرا بوو. ڕۆبانەکانیان بە کراسی ئەو زیندانییانەوە دەدووری کە ئەرکی تایبەتییان ئەنجام دەدا وەك ئاغلیتۆ، پاککەرەوە، کارمەندی پەرتووکخانە و... پرسیم ئاغلیتۆ لە کام جۆرە گیانلەبەرەکانە. دۆن ئانتۆنیۆ گوتی "ئاسایی"یەکی چارە ڕەشە، بە قایشی چەرم لە خەسووی داوە، ئەوەندەی باشە نەمردووە، تەنیا لایەکی ئیفلیج بووە. دواجار لە ئانتۆنیۆم پرسی لە بارەی داهاتووی من چۆن بیر دەکاتەوە و چۆن دەڕوانێتە چارەنووسی ئایندەم. بەڵام ئەمە سێهەمین پرسیار بوو نەمتوانی وڵامەکەی لە ژێر زمانی دۆن ئانتۆنیۆ دەربهێنم. کاتێ ویستی بڕوا، لیستی ئاسایی داخوازییەکانم لە پارەوە بگرە تا پێنووسی دار، لە کونسوڵەوە بگرە تا سابوون هەموویم بۆی ژمارد. ئەویش وەك بەندیوانەکانی دیکە، بەڵێنی دا هەموویانم بۆ جێبەجێ بکات. ئەنجام، ڕێك هەمان ئەوە بوو کە، لە ئەوانی دیکەم وەرگرتبوو. ئەوەندە ئەم پێکهاتە سرووشتییە بێ ئەندازە باشەم، لەگەڵ سروشتی بێ ئەندازە شایانی پشت پێنەبەستنم لە نێو ئیسپانیاییەکاندا بینیبوو، ئیدی شتەکانم بەلاوە ئاسایی ببوون. بە هەڵخەتێنەرترین زەردەخەنەوە دەیانگوت "manana, manana" "سبەی ، سبەی" یان "ahorg, ahorg" "هەر ئێستا، هەر ئێستا". ئەم دوو دەستە واژەیە بە شێوەی هاو واتا و هاوتەریب سوودی لێ وەردەگیرێ و بە پێی کات و شوێن، یەکێك لەو واتایانە دەگەیەنێ: "وەختێك، لەوانەیە، دەبێ ئومێدوار بیت، خوا گەورەیە، نابێ نائومێد بیت". کاتی ڕۆیشتنیان دۆن ئانتۆنیۆ دە دانە سیغار و، سەرتاشەکەیش نیوە شانەیەکی شکاو و کۆن و چەورو، پارچە سابوونێکیان وێدام. دیاریگەلێکی زۆر بە نرخ بوون. ئاستی ژیانم بە شێوەیەکی بەرچاو خەریك بوو بەرز دەبۆوە. پاشنیوەڕۆی ئەم چوارشەممەیە و بەیانییەکەی پێنج شەممەکەی سبەیش، کەشوهەوا هێشتا باش بوو. خۆم بە قەڵپکردنی وتووێژێك، لەسەر شێوازی مەشاییەکان، لە نێوان "کارل مارکس" و "زیگموند فرۆید" لەمەڕ هۆکارەکانی جەنگی جیهانییەوە سەرقاڵ کرد. هەردووکیان باڵاپۆشی سپییان لەبەر کرد بوو و، بە شێوەی قوتابییەکانی "سوقرات" دەئاخاوتن. باڵاپۆشە فاسۆنییە کولکنە سپییەکەیان، بە شاگەشکەییەوە لە نێوان کۆمەڵێك گەنجی لایەنگر و هەواداریاندا دەشەکاندەوە. یەکەمجار بوو بۆ فراڤین، شۆربای پەتاتەیان دا پێمان، ئەو هەندە بیبەری سووریان تێ کردبوو، ڕۆنەکە وەکو قەدیفەیەکی سوور ڕەونەقی دەدایەوە. بێشك، ئاستی ژیانم بەرز دەبۆوە و بە پێڕەویکردن لە سیستەمی "کۆوێ"، کە

سیستەمێکی دەروونده‌رمانییه کە لە لایەن "ئیمیل کۆویّ" "١٨٧٥- ١٩٢٦" داهێنـدرا و بریتی بوو لە "وا لە خۆگەیاندن کە دەروونت سەلامەتە" لەسەر لا دیوارێکم هەلکۆلّی. رۆژ بە رۆژ و هەرچۆنێك بیّ، بارودۆخەکە باشتر و باشتری لیّ دیّ. بە هەرحالّ، پاشنیوەڕۆی ئـەو رۆژە باران باری و حەوشە چۆلّ مایەوە. جێگەی ئەو هەرا و زەنای رۆژان خالّی بوو. منیش درێژەم بە هەولّێکی بیّ ئومێدانەی پووچم، دژ بە شەپۆلّێکی نوێی بیر و هزری خەیالاّوی و وڕێنەدا. بەلاّم شەو، شەوق و زەوقێکی ترم تیّ زا. ئەمجارەشیان، "دۆن ئـانتۆنیۆ" ئێشـکگر بـوو. کـاتیّ کـە "ئانخلیتۆ"، بـە کەوچـکەکەی، شـۆربا نیسـکێنەی تێـدەکردە پیّالەکەمـەوە، پرسـیاری کـرد زیندانییەکانی بەریتانیا چۆنچۆنین. بە پەلە پڕوۆزێوە گوتم ئەگەر کەمێك لام بوەستیّ و ئەمجارە دەرگام بە ڕوودا دانەخات، دلّخۆش دەبم لە سیر هەتا پیازی بۆ باس بکەم. بۆ هەر وشەیەك کە دەرفەتم بۆ دەرەخسا لەگەلّ بوونەوەرێکی مرۆیی دا ئالّوگۆڕی بکەم زۆر بە هەلّپەوە بـووم. دۆن ئانتۆنیۆ بە هەندێك دوو دلّییەوە پشتی وە دەرگادا داو راوەسـتا. گـوتی ماوەیـەکی زۆر بـیری لەوە کردۆتەوە کە لە نێو زیندانەکانی بەریتانیادا هەموو ژوورەکان گەرماویان تێدا هەیـە یـان نا. ولاّمیم دایەوە و گوتم گەرماو نییە بەلاّم دۆشی ئاوی سارد و گەرم و هـەروەها سـابوون لـە بەردەستدایە، دۆن ئانتۆنیۆ گوتی هەرکاتیّ شەڕ کۆتایی پیّ بیّ، دەچێتە بـەریتانیا بـۆ ئـەوەی بارودۆخی زیندانییەکانی ئەویّ ببینیّ. گوتم دەبیّ بێت و لەویّ لای مـن بمێنێتـەوە تـا تۆلّـە و قەرەبووی ئەم میواندارییەی بۆ بکەمەوە. پێکەنی و رۆیشتە دەریّ. لێی پاڕامـەوە کـەمێکیتر بمێنێتەوە بەلاّم ئەو دیسان دەرگاکـەی بـە ڕوومـدا داخسـت. بـەلاّم ئـەو چـەند وشـە کەمـە، کاریگەریی دەرمانێکی وروژێنەری بۆم هەبوو کە، چەندین کاتـژمێر لـە نێـو حـالّێکی باشـدا هێشتمیەوە. ئەوجا کەڕەنای خەوتن دووبارە لێدرایەوە. کاتی ئەوە بوو، پیاو پێلاّوەکەی داکەنیّ و هەر بە جلەوە لەسەر پێخەفەکەی پالّ کەویّ و گلۆپەکەی دیار سەری بـە رۆشـنی بمێنێتـەوە، چاوشارکیّ لەگەلّ خەوتندا بکات کە ئەمەیش جۆرێکە لە بەڕێکردنی کات. بـووم بـە سـاقەی زانایی خوا کە، دنیای بە جۆرێك ڕێـك خسـتووە هـەر شـەو و رۆژێـك تـەنیا بیسـت و چـوار کاتژمێرە و، نە بیست و پێنج یان سی کاتژمێر.

# ١٢

هەینی، نۆزدەهەمی شوباتیش وەکو هەموو رۆژەکـانیتر، بـە هێڵێکـی دیکـە کـە بەسـەر رۆژژمێرەکەی سەر دیواردا هەڵمکەندبوو دەستی پێکرد. بینیم لەو رۆژەی کە منیان هێناوەتـە سیڤیل هەفتەیەك تێپەڕیبوو- رۆژێکی دیکەی ئاهەنگگێڕان- سێ رۆژی دیکـە دەمتـوانی بـە بۆنەی چواردەهەمین رۆژی دەستگیرکردنم ئاهـەنگ بگێـڕم. هێمـا بچـووکەکانی سـەر دیـوار، مەیلێکی ترسناکیان بۆ زۆربوون دەر دەخست. هێشتا بانگ نەکرا بوومە دادگا و تەنانەت بـە شێوەیەکی رەسمی هۆکاری دەستگیر کردنمیان رانەگەیاندبوو. "بۆلین" کە دەسـتگیری کردبـووم، بێگومان دەمێکە گەڕاوەتەوە بۆ بنکەی فەرماندەیی لە "سـالامانکا"و، "کئیپـو دیلیـانۆ"، کەسێك کە "بۆلین" منی بە بەزەیی باوکانەی ئەو سپاردبوو، لەوە نەدەچـوو، کـە بـە ڕاسـتی بایەخێکی ئەوتۆ بە من بدات. هەموو جۆرە گریمانـەکانم هەڵسـەنگاند کـە لـەو دیـو پـەردەی رووداوەکانەوە تێدەپەڕین. ئەو شیکارییەی لە هەمووان زیاتر لەگەڵ ئەقڵدا یەکانگیرتر بوو ئەوە بوو کە "کئیپۆ" داوای دۆسێکەی کردبووم و دیارە ئەو بەرپرسەی کە دەبوایە کتێب و وتارەکانم هاوپێچی دیمانەکەمـدا لەگـەڵ "کئیپـۆ"- واتـە بەڵگـە راسـتەقینەکەی دژ بـە مـن- ی بـۆ وەربگێڕێ، لەو رۆژانە دا لە رادەبەدەر سەرقاڵ بووە. ئەگەر بە راستی مەسەلەکە ئەوە بێ، ئەم هەل و دەرفەتەی هاتبووە پێشێ شایانی دڵپێخۆشکردن نـەبوو. لـەولاتریش، ئیـدی بێگومـان لەوەی تاکو ئێستا دەبێ نارەزایەتی دەربڕین بۆ من دەستی پێکردبێ. "نیوز کروکیل" نارەزایی

دەردەبڕی، یەکێتییە ڕۆژنامە نووسییەکان نارەزاییان دەردەبڕی و ریسواییەکی چکۆڵەی جوان سەری هەڵدەدا. بەڵام ئایا "فرانکۆ" چ بایەخێکی بەم نارەزایەتی دەربڕینانە دەدا؟ بایی پولێکی قەڵپیش نەخێر. لەم چەند ساڵانەی دواییدا، ببووە جۆرێك لە نەریت کە دیکتاتۆرەکان کاری خۆیان بکەن و دیموکراسییەکان نارەزایەتی دەربڕن، دابەشکردنی رۆڵ، کە پێدەچوو هەموو لایەك لێی رازی بن.

بەڵام کاتژمێر پێنجی پاشنیوەڕۆ، دەسەڵاتە ناتەبەکانی کە چارەنووسی منیان بە دەستەوە بوو، یەکەمین نوێنەریان ناردە لام. سەیر لەوە دابوو کە وەك نێردراوێکی فەرمی، نە سوودیان لە لێکۆڵەرێکی سەربازیی وەرگرتوو و نە لە کەسێکی دیکەی لەم چەشنە، بەڵکو خانمێکی جوانکیلە و رووخۆشیان ناردبوو. جلی "یونیفۆرمی فالانژیستەکان"ی پۆشیبوو کە زۆر جوانیشی لێ دەهات و رێك بوو لەگەڵ جەستەیدا. ناوی "هێلینا" بوو، هاوناوی ئەو خواوەندی جوانییەی کە ئاگری جەنگی "تروا"ی هەڵگیرساند. ئەو خانمە جوانە وەکو پەیامنێری "هێرست پرێسی" ئەمریکیش کاری دەکرد. "هێلینا" لەگەڵ دوو ئەفسەری لاو، کە هاوشێوەی خۆی رێکپۆش و جوان بوون، هاتە ژوورێ. هەروا کە گوتم رێك کاتژمێر پێنج بوو تەقوتۆقی کلیل لە ناو قفڵەکەدا کەوتە بەر گوێم و پاشان دەرگا کرایەوە و هەر سێکیان وە ژوورێ کەوتن. بەو پەڕی رێزەوە سڵاویان کرد و بە سەرگەردانییەوە، چاویان بە دوای شوێنێکدا دەگێڕا لە سەری دابنیشن. کرانەوەی کتوپڕی دەرگای ژوورێکی زیندان، بە دەر لە کاتی ئاسایی کە، بۆ هێنانی خواردن دەکرێتەوە، سەر لە کەسی نێو ژوورەکە دەشێوێنێ. بە بینینی سێ کەسی یونیفۆرم لە بەر، لە یەکەم ساتەکاندا، ئاوها شپرزە و سەرلێشێواوی کردبووم کە، لەگەڵ خۆمەوە هەندێ پرتە پرتی بێ سەروبەرم کردبوو، بۆ داوای لێبۆردن لەوەی کە شوێنێکی باشتر لە قەرەوێڵە ئاسنینەکەم نییە تا خانمە جوانەکە لە سەری دابنیشێ. بەڵام ئەو تەنیا بزەیەك کەوتە سەر لێوانی- بزەیەك کە لە جوانییا سەرنجی راکێشام- و لێی پرسیم ئایا ناوم "کۆستلەر"ە؟ ئینگلیزی دەزانم یان نا؟ وڵامی ئەرێم بۆ هەر دوو پرسیارەکەی دایەوە. دواتر پرسیاری کرد کۆمۆنیستم یان نا؟ دەبوایە وڵامی نەرێ بۆ ئەم پرسیارە بدەمەوە.

_بەڵام "سوور"یت، وانییە؟

گوتم لایەنگری دەوڵەتی ڤالینسیام، بەڵام ئەندامی هیچ حزبێك نیم

خانمە جوانەکە لێی پرسیم ئایا دەمزانی سزای چالاکییەکانم چیە یان نا؟

گوتم: نە.

گوتی: "دەی..سزای مەرگە"

بە شێوەزاری ئەمریکی و گن قسەی دەکرد. نێوان دوو پیتی بێ بۆشایی، زۆر رادەکێشا و وشەی (مەرگ)ی وا لێ دەکرد (ما..رگ) و دواتر لە چاوەڕوانی کاریگەریی قسەکەیدا دەمایەوە.

پرسیم: بۆ مەرگ؟

گوتی: چونکە وا دەزانن سیخوڕیت

گوتم: سیخوڕنیم و، قەتیش نەزانیوە سیخوڕێك ناوی راستەقینەی خۆی لە ژێر نووسینەکانیدا ئیمزا بکات و کتێبێك لەسەر لایەنێکی شەڕکەر بنووسێ و پاشان پەساپۆرتەکەی بخاتە نێو گیرفانی و بچێتە سنووری نێو دەسەڵاتی هەمان لایەن.

خانمە جوانەکە گوتی بەرپرسانی پەیوەندار لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوە دەکەن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا لە لایەن "نیوزکرونیکل" و بەڕێز "هرست" لە نیویۆرك، داوا لە "ژەنەراڵ فرانکۆ" کراوە لە خوێنم خۆش بێ. بە رێکەوتیش، ئەو پەیامنێری "هرست پرێسە" لە ئیسپانیا و "ژەنەرال فرانکۆ" گوتوویەتی کەوا من بە مەرگ حوکم دراوم بەڵام لەوانەیە ئەو، حوکمەکە هەندێ سووکتر بکاتەوە.

گوتم مەبەستی ئەو، بە وردی، لە سووککردنی حوکمەکە چیە؟

بە زەردەخەنە سەرنج راکێشەکەی وڵامی دایەوە "دیارە خۆ، زینندانیکردنی تا هەتایی. بەڵام خۆ هەمیشە ئومێدی لێبوردنێکی گشتی لە ئارادا هەیە".

گەردەلوولێکی خێرا بە نێو مێشکمدا تێپەڕی. بەر لە هەموو شتێك، لە بەرامبەر رزگارکردنی ژیانم دەبوایە مەمنوونی چەند کارێتێکی موعایەدەی چلکن بم و ئێستا خودی جەنابی "راندۆلف هرست" دووهەمین رزگارکەرم بوو_ پێدەچوو فریشتە پاسەوانەکانم قاچێکیان بشەلێ. ئێستا ئیدی واتای دەستەواژە چارەنوسسازەکەی "لە وانەیە حوکمەکە سووك بکاتەوە" چی بوو؟

بەڵام دەرفەتێکی زۆرم نەبوو بۆ بیرکردنەوە. ئەو خانمە جوانەی لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشتبوو، بە زمانێکی خۆمانە و دڵبەرانە لێمی پرسی ئایا پێم خۆشە هەستی خۆم لە بارەی "ژەنەرال فرانکۆ" بۆ رۆژنامەکەی ئەو بدرکێنم یان نا. هەموو ئەوانە بە تەواوی گێژ و کاسیان کردبووم، بەڵام نە ئەوەندەیش گێژ، کە نەتوانم درك بەو پەیوەندییە چارەنوسسازەی نێوان ئەم داوایە و ئەو" سووککردنی حوکمەکە"ی فرانکۆ نەکەم. لە جۆرە وەسوەسانە بوو کە لە نێو پەرتووکی پیرۆز دا باسی لێوە دەکرێ. هەرچەندە ئەهریمەن بە ماسکێکی رووگەش، خۆی لە

شێوەی ژنێکی جوان و ڕۆژنامەنووسدا دەنواند. لەو سات و کاتدا، دوای ئەوەی ئەو هەموو ڕۆژەم لە چاوەڕوانی ئەشکەنجە و مەرگدا تێپەڕاندبوو_ هێزی ئەخلاقیی پێویستم بۆ بەرەنگار بوونەوە تێدا نەبوو. کە وابێ گوتم هەر چەندە "ژەنەرال فرانکۆ" لە نزیکەوە ناناسم، بەڵام وا هەست دەکەم دەبێ پیاوێك بێ دیدگایەکی مرۆڤدۆستانەی هەبێ کە، بە چاو بەستراوییەوە دەتوانم گرەو لەسەر ئەو خەسڵەتەی بکەم. خانمە جوانەکە، کە پێیەوە دیار بوو زۆر دڵخۆش ببوو، قسەکانی منی یادداشت کرد و داوای کرد ئیمزای بکەم. پێنووسەکەم لێ وەرگرت و کتوپڕ بە مێشکمدا هات وا خەریکە حوکمی مەرگی لایەنە ئەخلاقییەکەم ئیمزا دەکەم. ئەو حوکمەی هیچ کەسێك نەیدەتوانی تۆسقاڵێکی لێ سووك بکاتەوە. بۆیە ئەوەی لە زمانی منەوەی نووسیبوو چەند هێڵێکم بە سەر داکێشا و ڕستەیەکی دیکەی لەم چەشنەم بۆ گوت تا بینووسێ

**"من وەکو خۆم لە نزیکەوە ژەنەرال فرانکۆ ناناسم، ئەویش هەر وا لە نزیکەوە من ناناسێ، هەر بۆیە ئەگەر بێت و حوکمە بەسەر دابڕاوەکەم هەندێ سووك بکاتەوە تەنیا دەتوانم وای لێك بدەمەوە کە زیاتر بە هۆی تێبینییە سیاسییەکانەوە بووە.**

**سەرەڕای ئەمەش لە ناچارییەوە سوپاسی دەکەم، ڕێك وەکو هەر کەسێکی تر کە سوپاسی ئەو کەسە دەکات کە ژیانی ڕزگار کردووە. بەڵام من بڕوام بە جیهانبینی سۆشیالیستی دا هاتووی مرۆڤایەتی هەیە و هیچ کاتێکیش لەم بڕوایەمدا پاشگەز نابمەوە"**

ئەم گوتانەم ئیمزا کرد. دەرەقەتی وەسوەسە ئەهریمەنییەکانم هاتبووم و دەستێکم لە پشتی خۆم دا و جارێکی تر کەیفم بە خۆم هات لە هەبوونی زەینێکی ڕۆشن. زۆر پێویستیم بە زەینێکی ئاوها هەبوو، چونکە پرسیارەکەی دواتری "هێلیناخان" ئەوەبوو کە، مەبەستی ڕاستەقینەم لە "جیهانبینی سۆشیالیستی داهاتووی مرۆڤایەتی" چییە؟ وڵامدانەوەیەکی ئاکادیمیانە پێویست بوو بۆ ئەم پرسیارە و چی وای نەمابوو ئاگر بەردەمە پوش و پەرێزی باسەکە و بە دوای دابچێ. بەڵام هەر سێ فالانژیستەکە گوێگرانی باش نەبوون بۆ ئاخاوتنە ئاگرینەکانم. خانمە جوانەکە قسەی پێ بڕیم و هەموو بۆ چوونەکانمی ئاوها کورت کردەوە، "بڕوای وایە سیستەمی سۆشیالیستی دەلیڤەو دەرفەتێکی باشتر بۆ کرێکاران دەڕەخسێنێ" گوتیشی قسەو بابەت هەر چی کورتتر و پوختتر بێ ئەمریکاییەکان باشتر لێی تێ دەگەن. گوتم خێرت بنووسێ، ئامین.

پاشان لێی پرسیم چی بیانوویەکم بۆ ئەو ڕاستییە هەیە کە، لە دوای دەرچوونی "سوور"ەکان لە "مالاگا" دا مامەوە. هەوڵمدا تا ئەوێ کە دەکرێ بە کورتبێژییەکی

ئەمریکاییانە، کێشەی ئاڵۆزی "سرپیتەر"، ئوتۆمبێلەکەی "ئافرێدۆ" و سەر لە بەری ئەو رۆژە حەشرە گەورەیەی نێو "مالاگا" باس بکەم، بەڵام خۆم وام هەست پێکرد ئاخاوتنەکانم زۆر قەناعەتپێکەر نییە. بەڵام ئەو بەرێزتر بوو لەوەی گومانێك دەربخات. منیش پرسیم "سرپیتەر" چی بەسەر هات؟ گوتی ئەویش لە زیندانە. بەڵام ئەمە راست نەبوو، "سرپیتەر" زۆر پێشتر لە بەریتانیا بووە، ئەرد و ئاسمانی بەیەکەوە دووربیبۆوە تا زەمینەی ئازادکردنم بڕەخسێنێ. کە چی ئەمە هەمان ئەو راستییە بوو، کە نەیاندەویست بە منی بڵێن.

کاتی رۆیشتن، هاوپیشە رۆژنامەنووسەکەم لە "هرست پرێس" سەرەڕای قسەکانی پێشتری، گوتی لەگەڵ نەقیب بۆلێن لە فەرمانگەی چاپەمەنی و راگەیاندن لە بنکەی فەرماندەیی "سالامانکا" کار دەکات، مەدرید لە سەر لێواری رووخانەو، هەوڵ دەدا کارێك بکات بۆ زیندانێکی باشتر بمگوازنەوە. گوتم ئەگەر بتوانێ کارێکی وا بکات، ئەوپەڕی مەمنوونی دەبم. چونکە من و "ژەنەرال کنیپۆ" زۆر لەمەوبەر، حەزمان بە بینینی یەکدی نەکردووە. گوتی "زۆ...ۆر سوپاس".

ئەفسەرەکانی ئەمجارەیش بەو پەڕی ئەدەبەوە، سڵاوی سەربازییان کرد و هەرسێکیان لە ژوورەکەم چوونە دەرێ و، منیش شەکەت و ماندوو، پاڵ کەوتمە سەر قەرەوێڵەکەم کە ئێستا بۆنی ئەناسی عەترێکی پاریسی دەدا.

ئەمدەتوانی ناو مێشکم بە تەواوی کۆ بکەمەوە. حوکمی ئیعدام، زیندانیی تا هەتایی، نوێنەری "هرست پرێس" فەرمانگەی راگەیاندن، یونیفۆرمی فالانژیستەکان و عەتری پاریسی، هەمووی بەسەر یەکەوە زۆر بوون بۆ ئەو مێشکە داماوەی من.

# ١٣

سەردانی نوێنەری ڕۆژنامەوانی "هرست پرێس" کە لە لایەن فەرمانگەی ڕاگەیاندنەوە هاتبوو- یان ئەوەی دەبێ بڵێم سەردانی ژنە فالانژیستەکە، کە لە لایەن چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانی "هرست" هاتبوو- منیش لێهاتووییەکەی ئەو پەڕی بەرز دەنرخێنم- لە ڕۆژی نۆزدەهەمی شوبات ڕووی دا. ئەمە تەنیا پەیوەندییەکی من بوو بە درێژایی ماوەیەکی سێ مانگی لەگەڵ ئەو بەرپرسانەی دەستگیر و زیندانییان کردبووم.

ڕۆژی دوای سەردانەکە، هەستم بە ئاسوودەییەکی قووڵ کرد. ڕۆژی دووهەم، ئەو "لەوانەیە" چارەنووسسازەم هێنایەوە یاد، ڕۆژی سێهەم ئیدی ئەو دەستەواژەیە گۆڕدرا بە وەسواسێکی ڕۆحی.

گومان، وەك مۆریانە وایە پەیتا پەیتا بەڵام بە بنەبڕی مێشکی مرۆڤ دەخوات، نەخۆشەکە، بە تەواوی هەست بە قرتاندنی دەمارە دەزوولەییەکانی مێشکی لە لایەن ئەو بونەوەرە منجڕانەوە دەکات. بەڵام لە هەر نەخۆشییەکی درێژخایەن، نەخۆش دواجار دەگاتە قۆناغێك کە تێیدا، هەر چەندە ئازارەکەی کپ نابێ بەڵام خۆی لەگەڵدا دەگونجێنێ و، دەزانێ کاتێ پەلاماری ئازارەکە دەستی پێ کرد دەبێ چی بکات. داماویی مێشکیش بە کرانەوە و گرژبوون دەست پێ دەکات. تەنیا لە نێو ڕۆمانە خراپەکاندایە کە مرۆڤەکان، بە درێژایی بیست و چوار کاتژمێری شەوانە ڕۆژدا لە زویربوونێکی بەردەوامدان. گوزەری ئاسایی ڕۆژانەی ژیان لە نێو

ژوورێکی تاکە کەسیی پیاوێکی حوکمدراو، لە ماوەیەکی درێژخایەندا توانای بینینی میلودرامایەکی نابێ و ڕەنج و ئازارەکانی بۆ نێو چاڵە تاریکەکانی وشیاریی دوور دەخاتەوە. ئازار تەنیا لە نێو ئەو چاڵە تاریکانەوە لە شێوەی دەنگێکی زبر و خنکاو، خۆی وەك سیمفۆنیای ژیانی ڕۆژانە دەگەیەنێتە گوێچکەوە و، هەستێکی نادیار لە بێ ئۆقرەیی دێنێتە کایە.ئەوە بێ ئۆقرەییە، نەك زویریی، کە ئاساییترین ئەشکەنجەی مرۆڤە. تا ئەو کاتەی پەلامارێکی توند هێرش دێنێ. ئەوسا دەرگا کلۆمدراوەکان دەکرێنەوەو لافاوی وێرانکەری نائومێدی، وشیاریی رادەکێشێتە ژێر کونترۆڵ و چەپۆکی خۆی. ناچار دەبی لە بەرامبەر دیواردا بە چۆکدا بکەوی و نەوان، ڕەشایی و تاریکی دەتەقێننە ناو چاوەکانت. مزو قورقوشم تێ دەگرنە چەقی بیرکردنەوە و لانکۆڵەی گەرم و نەرمی ئەندێشەت. کاتێ درێل دەگاتە سەر دەماری ترس، نەخۆش کۆنترۆڵکردنی خۆی لە دەست دەدات. پەلاماری گەورە دەستی پێ کردووە. کە تەحەمولکردن بەدەرە، هیچکەسێك ناتوانێ ماوەیەکی زۆر لە بەرامبەریدا خۆڕاگری بکات. دەبێ دنکە حەبێك بخۆم. هەر کەسێك جۆرە حەبێکی پێویستە تا لەگەڵ چارەردشییەکانی خۆیدا بگاتە ئاگربڕێك. حەزرەتی ئەیوب، کاتێ برینەکانی جەستەی کرمیان تێ کەوت دەستی کرد بە نەفرینکردن و جوێندان بە خوا. منیش حەبەکانی خۆم هەبوو. کۆمەڵەیەك لە هەموو جۆرەکانی، هەر لە هاوکێشەی هەزلوولی و "سەرقاڵیی ڕۆژەکانم" بگرە تا دەگاتە هەر چەشنە بەرهەمێکی کیمیاوی لە دەرمانخانەی دەروونی.

یەکێك لە دەرمانە سیحرییەکانم، گێڕانەوەی یەکێك لە نووسینەکانی "تۆماس هان" بوو کە، قەت کاریگەریی خۆی لە دەست نەدەدا. هەندێجار، بە درێژایی هێرشی ترس، دەستەواژەیەکم سی- چل جار، بۆ ماوەی نزیکەی سعاتێك، بە دوای یەکدا دووپات دەکردەوە، تا ئەوەی دەکەوتمە دۆخێکی نێوان خەو و بێداری، یان نیمچە بێهۆشییەکی سووك و، هێرشی ترسەکە کۆتایی دەهات. دەمزانی ئەمە شێوازی سەمای نزاکردن و، شێوازی تامتامی ئافریقایی و، شێوازی جادووی کۆنی ئاوازەکانە. کە چی، سەرەڕای ئەم زانینەشم، هەر کاریگەریی دەبوو. دەمتوانی کاریگەری هاوچەشنی کاریگەری جێبەجێکردنی ئەم ڕێورەسمە بێهۆشکەرەم لە شێوەی پێچەوانەیش وەربگرم. واتە بە قووڵبوونەوە لە نێو پەرژانێکی رووتی زەینیدا. زنجیرەیەك بۆچوونم بە ئانقەست لە دەوروبەری بابەتێکی دیاریکراو دەست پێ دەکرد، وەك گریمانەکانی "فرۆید" لە بارەی مەرگ و مەرگخوازی. دوای چەند خولەکێك حاڵەتێکی وەك "تا" زاڵ دەبوو. جۆرێك لە غاردانێکی شێتانە. حەزی کوشتن لە سنووری لۆژیك، کە زۆر

جاران، بە خەونبینین لە واگایی کۆتایی پێدەهات. ماوەیەك دواتر هێـور دەبوومـەوە و هێـرش تێپەڕیبوو. هێزی شیفابەخشـی هـەر دوو شـێوە لـە یـەك داهێنـان سەرچـاوەیان وەردەگـرت. خنکاندنی وێنا تاقەت پڕۆکێنەکەی دەستەی گوللەبارانکردن لە نێو پرس و گرفتە گشتییەکانی مەرگ و ژیان دا و، خنکاندنی داماویی شەخسیم لە نێو دامـاویی ژیاننناسـی و زینـدەوەرزانی جیهان دا. هەر ئەوها کە لەرە و شەپۆڵەکانی جیهازێکی بێتەڵ دەگوازرێتەوە نێو زەوی و لەوێ ون دەبێ، منیش پاڵە پەستۆ رۆحییەکەی خۆم بە " تێلی زەوی"یەوە بەستبۆوە. بـە واتایـەکی تر، لەوە گەیشتبووم کە رۆحی مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە پەنا بۆ هەندێ سەرچاوەی یارمەتیدەر ببات کە، لە بارودۆخی ئاساییدا بە بیری دا نایەن و تەنیا لە بارودۆخە نائاسـاییەکان لـە نێـو دەروونی خۆیدا بوونی ئەو سەرچاوانە هەست پێ دەکات، ئەم چەشنە یارمەتییانە بە پێی بـارە تایبەتەکەی خۆیاندا، یان لە شێوەی دەرمانی بیهۆشکەرە تەندروسـتەکان بە هانای مرۆڤەوە دێن یان لە شێوەی دەرمانە وروژێنەرە مەستیبەخشەکان. ئەو هێزەی کـە لـە ژێـر پاڵـە پەسـتۆی حوکمی ئیعدامدا منی لەسەر پێ راگرتبوو ئەنجامی بەرهەموەرگرتنێکی شارەزایانەی ئەو جۆرە یارمەتییە رۆحییانە بوو. بە راستی، دەمزانی لە دوا ساتەکانی ژیاندا، کاتێك دەبوایـە لەبـەر سینگی دیوارەکەوە بوەستم، ئەم داهێنانە زەینییانە بە شێوەی ئۆتۆماتیك کاری خۆیان دەکـرد بێ ئەوەی پێویستی بە هەوڵدانێکی وشیارانە هەبێت لە لای منەوە. لە ساتی ئیعدامکردنەکـە نەدەترسام، بەڵام ترسی من ترس بوو لە ساتەکانی بەر لە ئیعدام. بەڵام پشتگەرمی و ئومێـدم بەو هەستەوە بوو کە لەسەر پێپلیکانەکانی ماڵی "سرپیتەر" کاتێ چاوەڕوانی "بۆلێنم" دەکرد کە دەیویست گوللەم بەرەو رووەدا بتەقێنێ، پێیدا تێپەڕیم. هەمان هەستی خەونئاسای دوولەت بوونی هۆشیاریی، کە سەرەنجام بە لەتێکیان، مرۆڤ بە بێباکییەوە و لە مەودایەکی رێژەییدا لە خۆی رادەمێنێ، وەك ئەوەی لە کەسێکی نەناس و نامۆ بڕوانێ. هۆشیاریی ئاگادارە تا هەرگیز نەگا بە قۆناغی نەبوونێکی تەواو. نهێنی بوون و وێرانبوونی خۆی ئاشکرا ناکات. کەس رێگەی پێ نادرێ بە دووچاوی کراوەوە سەیری نێو تاریکی بکات، چونکە پێشتر تاریکی چاوەکانی لـە توانای بینین دەخات. هەر بۆیە ئەو بارودۆخەی کە پێیدا تێدەپەڕین هێنـدەی وێنـا کردنەکـەی خراپ نییە. سرووشت چاودێری دارو درەختەکانی دەکات زیاتر لە بـاڵای خۆیـان هەڵنەکشێن. تەنانەت درەختی ئازارەکانیش.

رۆژەکـان تێدەپـەڕین. هـەینی، شـەممە، یەکشـەممە، دووشـەممە، سێشـەممە، چوارشـەممە، پێنجشەممە، هەینی. ئەو سەردانیکەرانەی هەواڵی گرنگیان پێ بوو هەینی هاتبوونـە لام. لـەو

رۆژ بە دواوە تا هەینی دواتر، لاپەڕەکانی رۆژژمێری زیندانم سپییە. هیچ رووداوێك نەهاتە پێشێ کە، لە یاد دا بمێنێتەوە. مەبەست لەو رووداوانەی لە یاداندا دەمێننەوە، لە نێو فەزا تاریکەکەی زینداندا، شتگەلێکن وەکو وەرگرتنی شۆربای پەتاتە لە باتی شۆربای لۆبیا بۆ فراڤین، ئالوگۆڕکردنی چەند پەیڤێك بە شێوەی تایبەتی لەگەڵ بەندیوان یان پاککەرەوە، سیغارێك کە بەندیوان دەیداتە زیندانیی، جاڵجاڵۆکەیەکی ناو پەنجەرە، یان جڕ و جانەوەری ناو پێخەف. ئەوانە شتگەلێکن مرۆڤ تووشی تەنگە نەفەسی دەکەن. ئەمانە، میکانیزمی بەرەڵلای بیرکردنەوەکان، هەر جارەو بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك دەکار دەگرن و دەیوروژێنن. ئەوانە جێگرەوەی چوون بۆ سینەما، عاشقایەتی، خوێندنەوەی رۆژنامە و مژوولییەکانی دیکەی رۆژانەی ژیانن. بۆ ئەو کەسانەی ئاسۆی دیدی ژیانیان لە لێوارەکانی رۆخی فنجانێك بەو لاوەتر نییە، باهۆز لە نێو فنجانی "چا"دا، هێندەی باهۆزی نێو دەریاکان راستەقینەیە. بەم شێوەیە، حەوت لاپەڕەی سپی لە رۆژژمێرەکەم، نیشانەی ئەو پەڕی بێ رووداوییە.

هیچ شتێك، تەنانەت بچووکترین شت، نە.. تەنانەت بچووکترین بەش لە بچووکترین شت، کە لە وانە بوو سووکترین هەناسە، هەوا ببزوێنێ تا تەکان و جووڵەیەك بداتە پەرە لە کار کەوتووەکانی ئاسیاوە بابیەکەی ژیان، رووی نەدا. منیش وەکو ورچ، چۆن بە درێژایی خەوە زستانییەکەی، خۆراك لە چەوریی نێو جەستەی وەردەگرێ، منیش لە نێو سەرمدا سوودم لە خۆراکی سی ساڵ خوێندنەوە و فێربوون و ژیان وەردەگرت. بەڵام مێشکم وشك هەڵگەڕا بوو و چەند تنۆك بیرکردنەوەیەکیش کە بە گوشین لێیم وەردەگرت وەکو تلپەی چای سێ جار ئاو لەسەر کراو، کاڵ و بێرەنگ ببوو. میکانیزمێکی سەیر و سەمەرەی هەیە مێشك. تەنیا کاتێك بەرهەمت پێ دەبەخشێ کە پێشتر بازاڕی فرۆشەکەی لە رێی وشە یان قەڵەم، کە پێکهێنەری سەودا کردنەکەن، بۆی دابین کرابێ. ئەگەر داواکاریی بۆ بەرهەمەکانی نەبێ مان دەگرێ. بۆ ماوەیەکی کورت دەکرێ وای پیشان بدەیت کە تاکە مرۆڤ، بۆ خۆی حەشیمەتێکە لە ئادەمیزاد و کڵاوی لەسەر بنێیت، بەڵام زۆر زوو فێڵەکەت ئاشکرا دەکات. منی خودی مرۆڤ بە هیچ شێوەیەك هاودەمێکی باش نییە. لە دوای شەش هەفتە مانەوە لە ژوورێکی تاکە کەسیدا ئەو هەندە لە خۆم بێزار ببووم، وام لێهاتبوو تەنیا بە دەستەواژەی زۆر رەسمی لەگەڵ خۆم دەدوام و بە خۆم دەگوت "قوربان". تەنیا شتێکی سەیر، شتێکی مەتەڵئاسا، شتێکی دڵدەرەوە لەمەر ئەم زەمانە نەوە بوو کە.. تێدەپەڕی. کاتێك دەڵێم نەمزانی چۆن تێپەڕی، تەنیا راستییەکی سادە و ساکار دەدرکێنم هەوڵمدەدا لە کاتی ئەنجامدانی کارێکدا رایگرم. لە بۆسەی دا خەوم

لیّ دەکەوت، نیگام بە سەر میلە باریکەکەی چرکەژمێری سعاتەکەمدا دەچەقاند، لێبڕاو کە بیر لە هیچ شتێك بێجگە لە "زەمان" نەکەمەوە. رایدەگرت. رێك وەك ئەو پیاوە گەمژەیەی نێو حیکایەتەکان کە، وای دەزانی بۆ راوکردنی باڵندەیەك دەبێ خوێ بڕێژێنێتە سەر کلکی. چاوم دەبڕییە میلی چرکەژمێر، خولەکەکانی بێ راوەستان، چارەگە سعاتەکان بێ بڕانەوە، تا ئەوەی کە، بە هۆی هەوڵی چاوتێبڕینم، چاوەکانم ئاویان تێدەزا و خەواڵوویەکی قورسیان تێ دەکەوت. ئەوەی پاشان نەمدەزانی ئەوە بوو کە بۆ چ ماوەیەك تێپەڕینی کاتم چاودێری دەکرد. زەمان لە نێو ئەم دەشتە بێ رووداوەدا، دەڵێی هەر دوو قاچی شەلە، بە زگەخشکێ دەڕۆیی. گوتم ئەوەی سەیر ومایەی دڵدانەوە بوو ئەوە بوو کە، بەم حاڵە دڵتەزێنەشەوە هەر دبوایە تێپەڕێ. بەڵام ئەوەی لەوەیش سەرسوڕهێنەرتر بوو، کە زیاتر لە پەرجوو دەچوو، ئەویش ئەوەی کە، ئەم زەمانە، ئەم سعات و رۆژانە و ئەم هەفتە نەبڕاوانە، زۆر خێراتر لە هەرکات و زەمانێك، کە پێشتر بەسەر من دا تێپەڕیبوو، رادەبووردن. هەر جارێك کە هێمایەکی تازەم لە سەر گەچە سپیەکەی دیواردا دەکێشا و، هەر جارێك کە بە جووڵەیەکی لە سەرسوڕمان، بازنەیەکم بە دەوری ئیماژەکاندا دەکێشا تا بە بۆنەی تێپەڕینی هەفتەکان و، دواتر تێپەڕینی مانگەکان ئاهەنگ بگێڕم، لەم هاودژییە رواڵەتییە بە ئاگا بووم. چییە؟ هەفتەیەکی تریش، مانگێکی دیکەش، چارەگە ساڵێك؟! ئەی هەر دوێنێ نەبوو ئەم دەرگای ژوورە، بۆ جاری یەکەم دنگەی هات و بە رووەمدا داخرا؟ هەر ئاوها کە لە مەودای نێوان قەرەوێڵەکەم و ئاودەستەکەدا هەوراز و نشێو دەبوومەوە- شەش پێ ونیو هەوراز و شەش پێ و نیو نشێو- پاڵەپەستۆم خستبووە سەر مێشکم و هەوڵمدەدا ئەم هاودژییە رواڵەتییەی زەمان بۆ خۆم شی بکەمەوە. کەم کەم بۆم روون بوویەوە، ئەو رۆژانەی بە هۆکاری بێ رووداوی و شەکەتباربوونیانەوە، درێژتر لە رۆژانی دیکە دێنە بەرچاو، رێك بە هۆکاری ئەم بێ رووداو بوونەیان، هەر ئەوەی کە تێپەڕین، وەك تنۆکە ئاوێك دەچنە ژێر زەوی و ون دەبن و دەسڕێنەوە.

لە دوور دیمەنی رابردوودا، نە پانی و درێژییان هەیە و نە قەبارە و نە کێشێکی تایبەت. لە شێوەی کۆمەڵەخاڵێکی ئەندازەیی و بۆشاییەکی نەبڕ و هیچ و پووچ دەنوێنن. هەر چەندێ رۆژە بۆش و ناوبەتاڵ و بێ رووداوەکان زیاتر بن، کێش و قورساییان لە نێو زەین و زاکیرەدا سووکترە. ئەو زەمەنانەی کە ئێستایان زۆر بە هێواشی و لەسەرەخۆیی دەڕوا، لە نێو زاکیرەدا لە هەر زەمەنێکی تر خێراتر تێدەپەڕێ. پێچەوانەکەیشی هەر راستە. کاتێ رووداوەکان بە سەریەکدا کەڵەکە دەبن و زەمان چوار دەست و پێ غار دەدا- ئەو کاتە، تەنیا ئەو کاتە،

پردێکە بۆ هەردوو دیوی زەمان، کە بە هەموو وردەکارەکانییەوە لە نێو زاکیرەدا تۆمار دەبن. برگە گەلێکی زەمەنیش هەن کە، خێراتر تێدەپەڕن بەنێو زاکیرەدا لە هەمووی هێواشترن. تەنیا لە کاتی فرێندایە کە زەمان، لە پشتەوەی خۆیدا، ئاسانترین ئاسەوار بۆ شوێن پێ هەلگرتن بە جێ دێلێ. لە راستیدا بەلارێدا بەرێکی سەیرە ئەم زەمەنە. ئەگەر زەمەن بەو چۆنێتییە رابوێرین، کە ناچار بین هەر کاتێ بکەوینەوە یادکردنی، بە باوێشك هێنانەوەوە سەیری کاتژمێر بکەین و خولەکەکان بژمێرین، دەتوانین دلنیا بین لەوەی کە لە نێو زاکیرەدا مایە پووچ و بێ سوود دەبێ. تەنیا زەمەنێك دەبێتە زەمەنێکی لە بیرنەکراو، کە تۆ لە نێو زەمەنەکەدا بیت و، هەر لە بیرو خەیالێشت دا نەبێ کە زەمەن هەر هەیە. تەنیا ئەو زەمەنە پڕ لە پیت و بەرەکەتە، کە بە هۆی هەست پێکردنییەوە لە رێگەی هۆشیاری، پاك و بێگەرد دەمێنێتەوە. بیرکردنەوە و رۆچوون بۆ قوولایی بابەتی زەمەن یەکێك لە دەرمانە نهێنییەکانی دلخۆشیم بوو. هەندێکیان تەنیا دەرمانێك بوون یارمەتیدەرم بوون بۆ کاتکوژی. لە نێو ئەم هۆشیاری و واگاییەدا، دلدەرەوەیەکی سەیر هەبوو، کە ئەم کاتژمێرە بێ برانەوە و ئازاردەرانە، هەر ئەوەندەی کە لە نێو زەمەنی ئێستادا نامێنن، بە بەرازێك لە میزلدان دەچێ کە بە پالە پەستۆیەك هەواکەی ناوی بەتال دەبێتەوە و دەگۆڕدرێ بە هیچ. مەلەوانییەکی بەردەوام بوو بە پێچەوانەی رەوتەکە و هەر ئەوەندەی کە رەوتەکە، دەکەوتە سەر پشت، دەرد و ئازاریش نەدەما. مرۆڤ هەمیشە لە رووبارەکەدا لە هەمان شوێن دەمایەوە بەلام بە سەر هەموو ئەو شتانەی سەربەرەو ژێر لە مەلەدابوون زال دەبوو و سەردەکەوت. مەسەلەی زەمەن مەسەلەیەکی ژیارییە بۆ زیندانی. نەك هەر بۆ زیندانی، بگرە بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە بارودۆخێکی ناسرووشتی و سنووردارا دەژین: لە حەوانگەکان، لە نێو کەمپ و ئۆردوگاکان، زۆرجاران، زۆر زۆرجاران دەمبینی بێ ویستی خۆم دەکەومە بیری "شۆربای هەمیشەیی" لە نێو کتێبی کوێستانە سیحرییەکەی "تۆماس مان" و، بۆچوونە نایابەکەی لە بارەی ئەو کاتی پشوودانەی کە پالەوانە جحێلەکەی، لە نێو دنیا لاتەریك و داخراوە جادووییەکەی یەکێك لە حەوانگەی نەخۆشە سیلدارەکان بۆ خۆی دروستی کردبوو. ئەویش دیل بوو، نە دیلی شێواویی کۆمەلایەتی، بگرە دیلی شێواویی زیندەوەرزانیی.

...شەممە، یەکشەممە، دوشەممە، سێشەممە، چوارشەممە، پێنج شەممە، هەینی

**...ئاراستەی "با" روو لە باشوورەو بەرەو باکوور وەردەسووڕێ. بەردەوام خول دەخوا و سەر لە نوێ دەگەڕێتەوە خولگەی خۆی. هەموو رووبارەکان دەڕژێنە نێو دەریاکـان کەچـی دەریا هێشتا هەر پڕ نەبووە...**

بە درێژایی ئەو هەشت رۆژە سپییەی نێو رۆژ ژمێرەکەمم تێدەپەڕاند و، هەموو بیرو هۆشـم لای زەمەن بوو، لەو دیو پەنجەرەکەمەوە لە ناو حەوشە، حەوشەی شەق شەقێن و تۆپێن، سی و حەوت پیاو گوللەباران کرابوون. بەلاّم ئەوکات، ئەودەم نەدەزانی.

# ١٤

یەك- دوانێکیان بوون، کاتێ دەهاتنە نێو حەوشەکەوە، نیگـام وەکـو کەسـانی ناشـنا بـە دوایاندا دەگەڕا و سڵاوی لێیان دەکرد. یەکێك باوە گەورە پیرەکە بوو، کە دنیا خۆرەتـاو بوایـە یان باران بباریبا هەر دەهاتـە حەوشـەوە، کتێبێکـی بـە دەسـتەوە بـوو قـەتیش نـەیدەبینی بیخوێنێتەوە.

ئەوی دیکەشـیان مێـرد منـداڵێکی دوانـزە- سـیانزە سـاڵان دەبـوو، چڵکن و چـاپوك. هاوڕێکانی بە "تاقانە" بانگیان دەکرد. "پدرۆ"یـەکیش هـەبوو، شـێت و وێـت بـوو و ڕۆڵـی قەشمەرجاڕی گوندی دەبینی، هەمووان نەیانکێشا بە پشت ملیەوە و، پێیان نەدایە بەر پێـی و تەنانەت تفیشیان تێ دەگرت- لە نێو حەوشـەکەدا، ڕەچاوکردنی دابی تێکـەڵاویی بـاو نـەبوو. پێدەچوو "پدرۆ" بەو هەڵسوکەوتەی دەگەڵیان دەکرد دڵخۆش بـێ. وەك قەشمـەرجاڕەکان چـوار دەست و پێ خۆینەکێشا بە زەویدا و سووك و خێرا تفەکانی لەسەر ڕوخساری پـاك دەکـردەوە- تا ئەوەی کەللەیی و پەست دەبوو، سەری ئەنایە دوای ئەو کەسـانەی ئـەزێتیان دەدا و مسـتی بۆیان ڕادەوەشاند و دەرزەنێك جوێنی پێیان دەدا. یەکەمجار کە ئەو دیمەنەم بینی سەرو دڵم تێك چوو. بەڵام دواتر، منیش وەکو ئەوانی دیکە بۆ کات ڕابواردن تەماشام دەکرد. هـەر لـە دوو- سێ ڕۆژی یەکەمی هاتنم بۆ سیڤیل، بە شـێوەیەکی زۆر سـەیر کەوتبوومـە ژێـر کاریگـەریی یەکێك لە زیندانییەکان- پیاوێکی کەڵەگەت کە، چاوێکی خێڵ بوو و چاکەتێکی ئەجنەبی لـە

بەر دەکرد. بە خاکەڕایی و سووکی، لە نێو ئەو گوندییانە دا کە کراسی کەتانی درێژیان لە بەر دابوو پیاسەی دەکرد و زۆربەی کاتەکان لەگەڵ" ڕێکپۆشەکان"دا تێکەڵ دەبوو. هەوڵمدا پیشەکەی مەزەندە بکەم و بەو دەرەنجامە گەیشتم دەبێ بۆ کسێنەرێکی پروفیشناڵ بێ. ئەمینداری کتێبخانەی زیندان بوو. کاتێ لەوە گەیشتم دوو- سێ ڕۆژ دواتر بوو، کە کاتێ بینیم لە حەوشەدا، کتێبی دەدایە ئەوانی تر. سەرجەمی هەوڵ و تەقەللاکانم لە پێناو چنگ کەوتنی شتێك بۆ خوێندنەوە تا ئەو کات مایە پووچ ببۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە روو قایمی سەگێك، ڕۆژی سێ جار، کاتی خواردن هێنان، لیستی داخوازییەکانم، کە ئێستا، داوا کردنی کتێب لە سەرووی هەموویانەوە بوو، دووپات دەکردەوە. کاردانەوەی بەندیوانەکان لێکدی جیاواز بوو: یەکێك بایەخی نەدەدا، ئەوی دیکەیان بە"manana" یان"ahora"یەکی بێ کەڵك منی لە کۆڵ خۆی دەکردەوە و سێهەمینەکەشیان دەرگای بە قەیسی بە ڕوومدا دادەخست. ئەنجامەکانیش هەمووی هاوشێوە بوو. دواجار، دەستم کرد بە هێما و ئاماژەدان بە کابرای کەڵەگەتی بۆکسێری ناو حەوشەکەوە. بە شێوەیەکی مامناوەندی بەیانیان سێ جار و، دانە ئێوارانیش سێ جار بەدەم پیاسە کردنەوە بە پێش پەنجەرەکەمدا هاتوچۆی دەکرد. چەندین کاتژمێر لە بۆسەو کەمینی ساتی تێپەڕبوونی دا دادەنیشتم بەو ئومێدەی بتوانم سەرنجی بۆ لای خۆم ڕابکێشم. دواجار، لە پاش نۆ یان دە ڕۆژ سەرکەوتم ئەم کارە بکەم. لەو سەرەوە، نیگایەکی تێ بڕیم و سەرێکی بە هێواشی بۆم لەقاند بۆ ئەوەی تێمگەیەنی لە داواکارییەکەم گەیشتووە. بە درێژایی پاشنیوەڕۆ بە شاگەشکەییەکی زۆرەوە چاوەڕێم کرد سەر و بیچمی لە نێو ژورەکەمدا دەرکەوێ. بە بێئۆقرەیی و چلێسییەوە بیرم لەوە دەکردەوە دەبێ کام کتێبم یەکەمجار بۆ بێنێ. هەتا شەوەکەی و، هەموو ڕۆژی دواتریش لە چاوەڕوانیدا مامەوە و بەردەوام بووم لەسەر ئێماژە پێدانی، یان نەیدەبینیم یان خۆی لە گێلی دەدا. بە درێژایی ڕۆژێکی دیکەیش هەر چاو لە ڕێ مامەوە. سەرەنجام، ڕۆژی شەممە، بیست و حەوتەمی شوبات، کاتێ ئیدی بە تەواوی ئومێدبڕ ببووم، ساتی بەختەوەرییەکە هات. کاتی فراڤین، ئەمینداری کەڵەگەت لە ڕێڕەوەکەدا نشێو بۆوە و بە بەردەم دەرگا کراوەکەی ژوورەکەمدا تێپەڕی. بانگیم کرد و، لە خۆشییاندا بەشە شۆرباکەی خۆمم ڕژاندە سەر پێیەکانی "ئاغلە چکۆلە". ئەمینداری کتێبخانە بە دوو دڵییەوە لە نێو ڕێڕەوەکەدا وێستا. بەڵام لە سەر شانس بووم. چونکە بە ڕێکەوت، ئێشکگر یەکێك لە بەندیوانە سپۆرتەکان بوو، بە ئیشارەتپێدانی تێیگەیاند لاری لەوەیا نییە کتێبێکم بە ئەمانەت پێ بدا. ئەمینداری کتێبخانە باوەشێکی پڕ

لە کتێبی لا بوو. ئەوەی سەرەوەی دایە من. وەرگێڕدراوە ئیسپانییەکەی کتێبی ئۆتۆبیوگرافی "ژیاننامە"ی "جان ستیوارت میل" بوو. سیغارێکی نیو پلیشاوەیشیان لە بن بەرگەکەی ناخنیبوو. ڕۆژەکە، ڕۆژی بەختەوەرییەکی ڕاستەقینە بوو. ڕۆژێك بوو دەبوایە بە ڕێوڕەسمێکی ئاهەنگئامێز بکرێت بە جەژن. بە هێوری چێشتی لۆبیاکەمم خوارد، زۆر بە حەوسەڵە کاسەکەمم شوشت و دامنایەوە سەر تاقچەی پەنجەرەکەوە تا وشك بێتەوە. پاشان لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشتم، سیغارەپلیشاوەکەم داگیرساند و دەستم کرد بە خوێندنەوە. بە گەرموگوڕییەکی زۆرەوە دەمخوێندەوە- زۆریش بە هێواشی. بە لای کەم لە یەك لەسەر چواری وشە و دەستەواژەکانی نێو کتێبەکە تێ نەدەگەیشتم، لە بەر ئەوەی هیچ فەرهەنگێکی گۆڕینی زمانم لە لا نەبوو ناچار بووم بۆ مانای هەموو ڕستەکان خۆم لێکدانەوەیان بۆ بکەم. هەر ئەم کارەش خۆشیی و چێژی خوێندنەوەکەی زیاد دەکرد. فێر بووم دووجار بە سەر ڕستەکاندا بچمەوە، بە هەستپەرتەوازەییەکی زۆرەوە، هەر ڕستەو هەر ئاوەڵناوێك بخوێنمەوە. هەستی کەسێکم هەبوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە نێو پێخەفدا کەوتبێ و کاتێك دەیەوێ هەستێتەوە و بە ڕێگا دا بڕوا زۆر بە وردی سەرنجی دەکەوێتە سەر ڕۆڵی ماسولکەکانی. وابزانم ڕۆمییەکانیش، لەو سەردەمدا کە کتێبیان بە دەست و، لەسەر لوولە کاغەزی پێستی مامزدا دەنووسی، بەم شێوەیەی وەك من دەیانخوێندەوە. بە چلێسی، ڕستە بە ڕستەو، هەر ڕۆژێکیش تەنیا چەند ئینجێك لە لوولە کاغەزەکە، بۆ ئەوەی هەموووی بە جارێك تەواو نەبێ و هەندێکی بۆ ڕۆژی دواتر بمێنێتەوە. کاتێك نووسەرەکان ناچار بوون لەسەر لوولە پێست بنووسن، دەیانزانی خەڵکی بەو پەڕی لێورد بوونەوەوە شتەکانیان دەخوێندەوە و بڕوایان بە خوێنەرەکان هەبوو. لەم ڕۆژگارەدا لەوانەیە خوێنەران بڕوایان بە نووسەرەکان هەبێ بەڵام نووسەرەکان بڕوایان بە خوێنەرەکان نییە. بە ڕێکەوت لە بەختە باشەکەی من بوو کە، ئۆتۆبیوگرافیەکەی "جان ستیوارت میل" کتێبەکەی هەرە سەرەوەی کۆمەڵە کتێبەکەی بەر باوەشی ئەمیندارەکە بوو. هەمیشە بڕوام بەوە هەبووە کە، لە دامودەزگای ئیرادە و ویستی خوادا بازنەیەکی تایبەتی هەبووە کە، تەنیا کاری ئەوە بێ چاودێری بکات تا وەکو کتێبی لە بار و گونجاو، لە کات و ساتێکی لەبار و گونجاودا بگاتە دەستی خوێنەر. هەر کتێبێك لە بەرهەمەکانی "هیمنیگوای" یان "جویس" یان "هاکسلی" لەو کاتەو ساتە هەستیارەدا، لەوەیا کاریگەرییەکی تێکدەرانەی هەبوویێ، بەڵام ئێستا لە بەرامبەر یەکێك لە ئەستوون و کۆڵە زەبەلاحەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕاوەستاوم. ئەو پیاوەی نموونەیەکی زەق و بەرجەستەیە لە سادەگەرایی داهێنەرو،

بێ گازاندەترین کەس بۆ ئاسوودەخوازیی کەسیی خۆی بوو، کە رەنجکێشانەکەی نە وەکو ئامانجێك بۆ خودی خۆی، بەڵکو وەك پێویستییەك بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی رۆحی سەیر دەکرد. ئەم روخسارە پیرەی سەدەی نۆزدەهەم، لە راستیدا کۆڵەگەی دەستڕۆیشتوویی بوو. بۆت هەبوو بە دەوری هەڵسووڕێی و تەوافی بکەیت و، ناو لەپی دەستەکانت بە سەر ئەو بەردە دابێنی کە، زیان و ئازارێکی لە با و باران پێ ناگا و، روو لە ئاسمان بکەیت، لەوێ کە بەرچاوگەی هونەرەکانی بیناسازیی ناقۆڵا ئەستەم دەبێ- بارودۆخێکی لە سەرەتاوە کە، زیاتر لەهەر شتێك لەگەڵ ئەقڵ یەکانگیرە. دووهەمین کتێب کە وێیاندام بیخوێنمەوە کتێبی "سەفەر بە دەوری گەڕەکەکەمدا" "یدومیستێر" بوو. هەروا کە لاپەڕەکانیم هەڵدەدایەوە، یەکەمین رستە، کە کەوتە بەر چاوم، وتووێژی نووسەر بوو لەگەڵ خۆیدا کە، لە نێو ژوورەکەیدا زیندانی کرابوو، هەروا کە چاوی بە سەر کتێبخانەکەیدا دەخشاند دەیگوت:

**"لێیان قەدەغە کردووم بڕۆمە نێو شار و ئازادانە پیاسەیەك بکەم، بەڵام هەر هەموو دنیایان خستۆتە بەردەستم، فەزای بێ کۆتایی و زەمەنی بێ کۆتایی، هەر دووکیان لەبەر دەستمدان..."**

کتێبخانەی زیندان نزیکەی هەزار و شەشسەد دانە کتێبی لێ بوو، زۆربەی هەرە زۆریان لە کتێبە هەرە چاکەکان بوون. لە سەردەمی کۆماریی کۆ کرابوونەوە و، پشکێنەرە نوێکان تا ئێستا نەکەوتۆتە بیریان پاکسازییان بکەن. تەنانەت نامیلکە شۆڕشگێڕییەکانی ساڵەکانی ١٩٣٠- ١٩٣١ "ژیاننامەی کابالرۆ" ئاسانیاو، شتگەلی لەم بابەتانەیشیان لە نێو دابوو. ئەمە نموونەیەك بوو لە کۆی بارودۆخی نێو زیندان. هەموو شتەکان بە پێی رەوتە کۆنە هێواشەکە درێژەی هەبوو- رەوتێکی زۆر کۆماریخوازانە، زۆر مرۆڤدۆستانە، زۆر ئیسپانیایی و، بێ سەروبەر. لەسەدا، نەوەد و پێنج لە بەندیوان و فەرمانبەرانی پلەکانی خواروو، هەمان کارمەندەکانی سەردەمی کۆن بوون. بە رەوشێکی مرۆڤانەی کۆماریی پەروەردە کرابوون. پێنەدەچوو هاودڵییان لەگەڵ رژێمی نوێ لە ئاستێکی بەرزدابێ. هەرچەندە هەندێکیان بتەوێ یان نا، ناچاربوون خۆیان بە رواڵەت وەکو فالانژیستەکان بنوێنن. بێجگە لە سیانیان نەبێ، بەندیوانەکانی تر هەموویان کەسانێکی میهرەبان و مرۆڤدۆست بوون، تەنانەت چەندێکیان هەر زۆر سپۆرت بوون- تا ئەو شوێنەی یاسا و رێساکان رێگەیان بدابایە. تەنانەت تاکوتەرا جارێکیش، لە بەرامبەر رێساکانیشدا چاویان دەنووقاند. ئەم زیندانە پان و بەرینە، بە جۆرێك، خۆی لە نێو ئاشووب و باری شڵەژاوی جەنگدا، وەك هەرێمێکی خەو لێکەوتووی جوان دەنواند.

دواتر بیستم کە، هەندێجار رێك کەوتووە بیست و چوار سعات بەر لەوەی ئیعدام بکرێ، زیندانییان ناردووە بۆ ئەنجامدانی پشکنینی پزیشکی بۆی و بە هۆی گومانی هەبوونی ریخۆڵەکوێرە، بۆ پارێزیی لە خواردن، شیریان پێ دەدا. پێویستییە هەنووکەییەکان، توانای زاڵبونی بەسەر نەریتە باوە کیسەڵئاساندا نەبوو، نەریت، بێ گوێدانە مەرگ، درێژەی بە بوونی خۆی دەدا. زیندانێك بوو نەوپەڕی رێزیان تێدا لە مرۆڤ دەگرت و زۆریش ئاسوودە بوو- کەیف و پیاسەی بە کۆمەڵ لە پاڵ گۆڕە دانەپۆشراوەکان جێبەجێ دەکرا. هەموو ئەوانە لە بارەی بەندیوانەکان و فەرمانبەرانی پلە خواروو، راست بوو، کە لە پەیوەندییەکی نزیکدا بوون لەگەڵ زیندانییەکاندا بێ ئەوەی تۆسقاڵێك رۆڵیان لە چارەنووسی ئەواندا هەبێ. هەرچەند، لە قاڵدرمەی پۆست و پلەکاندا هەورازتر دەبوویەوە فەزاکە مردووتر و ساردتری لێ دەهات. لە روانگەی ژەنەراڵێکی ئیسپانیایی، خوارتر لە عەریف مرۆڤ نییە. بە دیدی ئێمەشەوە مرۆڤ نەبوون لە عەریفەوە دەست پێ دەکات. لە زیندان، عەریف هاوتاستی "Jefe de servicio" واتە سەربەندیوانە. بۆ یەکەم ئاشنایەتیم لەگەڵ سەربەندیوانێك، خۆم بە قەرزاری کەموکوڕییەك لە سیفونی ئاودەستەکەم دەزانم. چەندە رۆمانتیك!

ئەم بەسەر هاتە رۆژی بیست و هەشتەم، دوای ئەوەی یەکەم کتێبیان پێدام بۆ خوێندنەوە، رووی دا. بەیانییەکەی تانکیی سیفونەکە دەستی بە دڵۆپەکردن کرد. هێندە چوبوومە نێو دەریای "جان ستیوارت میل" کە دەرفەتێکم نەبوو بایەخ بە خراپبوونی سیفون بدەم. کاتێ شۆربای نیوەڕۆیان هێنا ژوورەکەم بە تەواوی تەڕ ببوو. بە بەندیوانەکەم گوت و ئەویش بەڵێنی دا: ahora,ahora کە fontanero "بۆڕیچییەکە" بنێرێ. لەم بەینەدا دەبوایە پەڕۆیەك بە ئەرزەکەدا بکێشم و وشکی بکەمەوە. کارەکەم ئەنجام دا و دیسان چوومەوە زگ "جان ستیوارت میل". دیارە بۆڕیچی نەهات. دەمەو ئێوارە چەند میللیمێك ئاو لەسەر ئەرزی ژوورەکەمدا کۆبۆوە و تانکییەکەی سیفونەکەش دڵۆپەی زیاتری دەکرد. کاتێ شۆربای ئێواردیان هێنا، ئیدی پێویستی نەدەکرد سەرنجی بەندیوانەکە بۆ لای وەزعەکە رابکێشم چونکە بە خۆی دەیتوانی ئاستی خراپی وەزعەکە ببینێ. بە نەرمییەوە گوتی: "هەرێستا، هەرێستا بۆڕیچییەکە دەنێرم". بەڵام دەبوایە لەو بەینەدا، هەتا بۆڕیچی دێ، بە پەڕۆیەك ناو ماڵی ژوورەکە وشك بکەمەوە تا هیچ نەبێ ئاوەکە نەڕژێتە ناو ڕێڕەوەکە. بە دەم جوێن و بۆڵە بۆڵەوە کارەکەم دەکرد، بەڵام ئێستا ئیدی ئاوەکە لە تانکییەکەوە بە چۆڕە ئەرژاو، تا کەڕەتای دووهەم لێیدا، بەرزایی ئاوی ناو ژوورەکەم دەگەیشتە گوێزنگی پێ. بە هۆی نەهاتنی بۆڕیچییەوە،

بەوپەڕی پەستی و توڕەییەوە دەرگاکەم دەکوتی- هەمان ئەو کارەی کە لە دوای لێدانی زوڕنـای دووهەم، واتە کەڕەنای کپبوون، یاساغە.

دوای ئەوەی ماوەیەك بێ راوەستان دەرگاکەم کوتا، دەرگا زۆر بو توندی کرایەوە و Jefè de servicio بە هەڵچوونێکی زۆرەوە وە ژووریٚ کەوت و لەدوای ئەویشدا، "ئانخلیتۆ" کە هـەموو گیانی دەلەرزی. Jefe کورتە باڵا و خەپۆکە بوو. یونیفۆرمە فالانژییە لۆچدارەکەی خەریك بـوو لە بەریدا هەڵڕژێ. وەك میزڵدانێك چۆن ئەوەندی فووتێکرا بێ نزیکە تەقین بێ. شوێن برینێـك بە روخسارییەوە بوو لەسەری لووتییەوە دەستی پێ دەکرد تـا بنـاگوێی راسـتەی دەکشـا کـە، گوێچکەکەیشی نیوەی لێ مابۆوە. لە قەڵافەتیدا شتێکی وای نەبوو سەرنجی مـرۆڤ رابکێشـێ. ئەو هەندە نەڕاندی دیوارەکانیشی کەوتنە لەرزەوە. بە توڕەییەوە شیڕاندی بەسەرمدا: "لێـرە چ گووێکت دەخوارد؟" گوتم خەتاکە لە ئەستۆی تانکی سیفونەکە نە لە ئەسـتۆی من.

دیسان نەڕاندی: "تەنیا کاتێ قسە بکە کە شتێکت لێ دەپرسن. هەر کاتێکیش مـن دێـم، دەبێ لەو بن دیوارە هەردوو قاچت جووت کەیت و بە بێدەنگی بوەستی"

بە نێو ئاوەکەدا رۆیشتم و چووم لەو بنـدیوارەوە وەك ئـەو گـوتی راوەسـتام.Jefeی نـاگر، قونکە جگەرەکەی فڕێ دایە سەر ئەرزی ژوورەکەم. قونکە جگەرەکە بە هێواشی سووڕێکی داو و لەگەڵ رەوتی ئاوەکە، لە دەرگاکەوە چووە دەرێ.

Jefe وەك گایەکی سەرشێت نەڕاندی: "بە پەرۆ وشکی بکەوە".

گوتم پێشتر سێ جار وشکم کردۆتەوە "تەنیا دوو جاربوو". بەڵام هیچ سـوودی نەبووە.

Jefe گوتی ئەگەر ئەو فەرمان بدا "نەك سێ جار، دەبێ شەش جار، دە جـار، بیسـت جـار وشکی بکەمەوە، بەیانی تا شەو وشکی بکەمەوە". باتۆمە پلاسـتیکییەکەی دەسـتی لـە ژێـر لووتم دانا و هەندێ سـووڕاندی و بـەڵێنی دا سـبەینێ ژەمێـك "هاتنـە ژوورەوەم" میوانـداری بکات. مەبەستی لە لێدانی کاتی پێشوازیکردن بوو لە هەر زیندانییەك کـە، تـازە دێتـە نێـو زیندانەوە. پاشانیش تفێکی فڕێدایە ناو ئاوە کەڵەکەبووەکەی ژوورەکەم و بە شەقاوناني گـەورە چووە دەرێ و دەرگای لە دوای خۆیدا بە یەکدادا. سەرلە نوێ سەرقاڵی وشککردنەوەی ناو ماڵی ژوورەکەم بوومەوە. بەر لەوەی کارەکە تەواو بکەم، دەرگا کرایەوە و "دۆن رامۆن" یـەکێك لـە باشترین بەندیوانەکان و لە دوای ئەویشدا بۆڕیچی، وە ژووریٚ کەوتن. ئەنگوستی لەسەر لێـوی دانا و دەمی بە زەردەخەنەیەك کرایەوە. تێگەیشتم، بۆڕیچییەکەی بە قاچاغی، لە پاش زوڕنای کپبوون و پێچەوانەی فەرمانەکانی Jefe و رێساکانی زینـدان هێنـاوە. ئـەم رووداوە بچـووکە،

یەکەم دەلیڤەی ناشنایی منی لەگەڵ چینی دەسەڵاتداری زیندان رەخساند. سوپاس بۆ کۆتاییە خۆشەکە، بە هەرحاڵ، وانەیەکی باشی پێم دا. لەوە گەیشتم ئەگەر ئەو شەڕ و هەرایەم نەنایەوە هەرگیزFontanero نەدەهات. بیرم لەوە کردەوە کاتێك لیستی داواکارییەکانم- لە کونسوڵەوە بگرە تا سیغار- کاتێك دەکەوێتە بەر سەرنجیان و دەست بەجێ جێبەجێ کردنی دەکرێ کە هەراوزەنایەك بنێمەوە. رۆژێکی تریشم دان بە خۆدا گرت و، لیستی داواکارییەکانم بە منجرییەوە، لەگەڵ، هێنانی هەر ژەمێکی خواردندا دووپات کردەوە- کاتێکیش بینیم دیسان بە manana و ahora لە کۆڵ خۆیان کردمەوە، رۆژی سێشەمە، دووهەمی ئادار، دەستم دایە یەکەمین مانگرتنمەوە. ئەنجام، بەدەر لە هەموو چاوەڕوانییەکان، کتوپڕ بوو. کاتێك کە سبەینێ، سەرو بیچمی "دۆن رامۆن" لەگەڵ "ئاغلیتۆ" خۆیان و کوپەی قاوە وە دیارکەوتن، رامگەیاند کە هیچ وەرناگرم. "دۆن رامۆن" گوتی دڵنێشم هەیە؟ گوتم دەمەوێ لەگەڵ سەرۆکی زیندان بدوێم و هەتا ئەو نەیەتە ئێرە دەم لە هیچ خواردنێك نادەم. "دۆن رامۆن" هەر حەپەسا و "ئاغلیتۆ" بە تەوسێکەوە زەردەخەنەیەکی هاتێ. بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکەن لێم رەت بوون و رۆیشتن.

فراڤینیشم وەرنەگرت. نۆرەی بەندیوانێکی تر بوو. هیچی نەگوت، تەنیا دەرگای بەیەك دادا و رۆیی. کە وابێ کێشەکە، کەوتۆتە سەرزاران. ئەمە، وەك هێمایەکی باش دەهاتە بەرچاو. کاتژمێر شەشی ئێوارە، کتوپڕ، دەرگا کرایەوە و شاندێکی رەسمی لێم وە ژووری کەوتن. لە پێش هەموویانەوە بەڕێوەبەری زیندان، لە دوای ئەو سەربەندیوان، پاشان "ئاغلیتۆ" و لە پشتیانەوە یەکێك لە "رێکپۆشەکان".

بەڕێوەبەری زیندان پیاوێکی لاواز و پەرپووت بوو بەڵام نامیهرەبان نەدەهاتە بەرچاو. پاشان زانیم لە کۆنەکانە. نەیانوێرا بوو پاکسازیی بکەن، لەبەر ئەو شارەزایی و زانیارییەی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی زینداندا هەیبوو، نەدەکرا بە ئاسانی دەستی لێ هەڵگرن. بەڵام ئەفسەرێکی فالانژیستیان بە ریشییەوە بەستبوو و قەڵەمڕۆی دەسەڵاتیان تەنیا بۆ بابەتە تەکنیکییەکان سنووردار کردبوو. بەڕێوەبەری زیندان ماوەیەك تێمڕاما و پاشان پرسی کێشەم چیە و، بە ئاماژەیەکیش رێکپۆشەکەی تێ گەیاند رۆڵی وەرگێر لە ئەستۆ بگرێ.

گوتم بایی ئەوەندە زمانی ئیسپانیایی دەزانم بتوانم مەبەستم بگەیەنم. بەڵام گوتی پێی باشترە وەرگێڕێکی هەبێ تا بتوانێ بە روونی لە هەموو ناخاوتنەکانم بگات. کابرای پەرپووت، بڕوا و دڵنیایی دەردەخست. زۆر بە کورتی باروودۆخی خۆم تێ گەیاند و دواجار لیستی

داواکارییەکانیشم راگەیاند. گوتی ناچارە پێڕەوی لە بڕیارەکان بکات. من "سەردانیکردم لێ قەدەغە کرابوو" و نەدەکرا نامە بنووسم و پەیوەندی بە کونسوڵەوە بکەم. هەروەها گوتی هیچ پەیوەندییەکی بە چارەنووسی داهاتووی منەوە نییە. بەڵام کۆشش دەکات پارە دەستبەسەر داگیراوەکانم بۆ بگەڕێنێتەوە و، هەوڵی ئەوەش دەدات کارێک بکات کە، هەموو ئاسانکارییەکی تەکنیکی، تا ئەوێ کە لە دەسەڵاتی ئەو دا هەیە، بخاتە بەر دەستم. لە بەرامبەردا دەبێ منیش بەڵێن بدەم کە خواردن بخۆم. بەڵێنم دا و شاندەکە چوونە دەرێ. بەڵام لە نێو دەرگاکەدا یەخەی رێکپۆشەکەم گرت و دانەیەک کاغەزی تایبەت بە کرینی پسپسوولەیەکی یەك پستاییم لێ وەرگرت بۆ کڕینی سیغار. بە بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێ بووم بزانم بەڕێوەبەری زیندان بەڵێنی خۆی بە جێ دەگەیەنێ یان ئەویش لە جەماعەتی "manana" یەکانە. بەڵام رێك سبەینەکەی رۆژی دواتر، "ئاغلیتۆ" لەگەڵ "دۆن رامۆن" و یەك باوەش لە ئەفسانەییترین دیاری و گەنجینەکان وە ژووری کەوتن. هەموویان دانایە سەر قەرەوێڵەکەم و هەر دووکیان، کە سۆز و میهرەبانی لەسەر و روویان دەباری، لەولاتر راوەستان، وەك ئەوەی بیانەوێ دیارییەکانی درەختی کریسمەس دابەش بکەن. بە تەواوی گێژ ببووم و هەرشتێکم بە وردی دەپشکنی. کۆی شتەکان بریتی بوو لە:

پاشماوەی قەڵەمدارێك

پێنج پەڕە کاغەزی سپی

پارچە سابوونێك

خاولییەکی دەستشۆیی

کراسێك

"دۆن رامۆن" پێی گوتم کاغەز و قەڵەمەکە بۆ نامەنووسین نییە، بۆ بابەت نووسینە، چونکە بەڕێوەبەری زیندان وا دەزانێ ئەگەر رێگەت پێ بدرێ دووبارە شت بنووسی "ناو دڵم سووك دەبێ". پاشان چاوێکی لێ داگرتم و گوتی، لەوانەیە هەر ساتێك بێن و ئەوشتانە بخوێننەوە کە دەیاننووسم، کە واتە باشتر وایە "شتی باش" بنووسم. بەڵێنم دا تەنیا شتی باش بنووسم. جارێکی تریش هەمان ئەو شادی و کەیفخۆشییە هەناسەبڕ و لە رادەبەدەرەم تووشم بوو کە، کاتی هاتنی سەرتاشەکە و پاشان کاتی وەرگرتنی یەکەم کتێب بۆ خوێندنەوە تووشم ببوو. بیرم کردەوە یەکەمجارکام لەو شتە جوانانە تاقی بکەمەوە، قەڵەم یان سابوون، سابوون بردییەوە. لەسەر تا پێم خستە ژێر کەفی سابوونەوە و خۆم پاك و بژوێن کردەوە، کراسە

نوێکەشم لە بەرکرد و کراسە کۆنەکەم شۆرد و لەسەر تاقچەی پەنجەرەکەم هەڵخست تا وشك بێتەوە. ئەو جا نۆرەی قەڵەم هات.

یادداشتەکانم دەگەڕێتەوە بۆ دوای ئەم بەرواره. چونکە دەبوایە ئەوەم لە بیر بێ کە "تەنیا شتی باش بنووسم" لە شێوەی کورتە برووسکە: "مامە- بێرتی- ناستەم- نەخۆش- ئاگادارن- ئانتی" دەمنووسین. ئەگەر شەوێك دە کەس ئیعدام بکرابایە دەمنووسی "دە واگا هاتم. خەونی ناخۆش".

ئەو یادداشتانەی لەدوا رۆژەکانی مالاگادا نووسیبوونم و لە کاتی دەستگیرکردنمدا بردبوویان، هەروەها یادداشتەکانی پەیوەندیدار بە سێ هەفتەی سەرەتای دەسگیر کردنم بە گەڕانەوە و یارمەتی وەرگرتن لە زاکیرەم دووبارە نووسیمنەوە. لە دەرەنجامی بەختباشییەکدا، توانیم کارێك بکەم کە لە کاتی ئازاد بوونمدا ئەم یادداشتانەم بە قاچاغ بنێرمە دەرەوەی زیندان. یادداشتەکانی دواتر، زۆربەیان، بابەتگەلی تازەن. تەنیا دارشتنە شاعیریانەکانم هەڵگێڕاوەتەوە سەر دارشتنەوەیەکی ئاسایی و ناوەرۆکی هەندێ جێگەم بە هێزتر کردووە.

# ١٥

## چوارشەممە - سێی ئادار

ئەم بەیانییە، قەڵەمدار، کاغەز، سابوون، خاولی و کراسم وەرگرت. ئەگەر تەنیا فڵچەیەکی دانشۆرینیشم هەبوایە دەکرا بگوترێ خەریکە جارێکی تر بۆنی بەشەرم لێ دێ. کاتی هێنانی خواردنی بەیانی، ئەو پسوولەیەی کە بایی یەك پستایی بوو و لە پیاوە رێکپۆشەکەم وەرگرتبوو، دامە "ئاخلیتۆگ تا هەشت پاکەت جگەرەی "Hebras" و چوار دانە شقارتەم لە حانوتەکەوە بۆ بکڕێ. گوتی حانووتی زیندان تا کاتژمێر یازدە ناکرێتەوە. بەیانییەکەم بە نووسینەوەی هەندێ رستە و پەرەگراف لە کتێبەکەی "میل" تێپەڕاند و بۆ دەست گرتن بە کاغەزی سپی، پیتەکانم زۆر بە وردی دەنووسی. نیوەڕۆش جگەرەکە نەگەیشت. ئێشککگرەکە "ئاخلیتۆ" نەبوو. ون ببوو، پستاکەش لەگەڵی. هەموو پاشنیوەڕۆکە کتێبم خوێندەوە. لەگەڵ هاتنی شۆربای ئێوارە جگەرەش گەیشت. "ئاخلیتۆ" دەڵێ چیدی جگەرەی "Hebras"ی ئەرزان لە حانووتەکە نەماوە، پاکەتی "Especials"ی بیست جگەرەییم بە هەشتا سانتیمۆس و، یەك شقارتەم بە پێنج سانتیمۆس کڕیوە. چاوی لێ نەبوو پانزە سانتیمۆسەکەی مابۆوە بۆمی بگەڕێنێتەوە و گوتی یەك "Prapina" "بەخشیش"ی بچووك بۆ هەر شت کڕینێك گل دەداتەوە.

گوتم تا پاره دەست بەسەردا گیراوەکەم بۆ نەگەڕێتەوە بەخشیش لە گۆڕێدا نییە. وڵامی دایەوە: "ئەوەندە چاوەڕێ بە تا گیانت دەردەچێ" بەڵام دواجار پانزە سانتیمۆسەکەی وێدامەوە.

## * پێنج شەممە/ چواری ئادار

ئەم بەیانییە خوێندنەوەی کتێبەکەی "جان ستیوارت میل"م کۆتایی پێ هێنا.

هەوڵمدا لە پەنجەرەکەمەوە پەیامێك بە ئیماژە بدەمە ئەمینداری کتێبخانە،کە دەمەوێ کتێبەکەم بۆ بگۆڕێ بەڵام سوودی نەبوو. دەبوایە دەست بە جگەرەکانمەوە بگرم بۆیە بە ئەژمار دەمکێشا. دوێنێ تەنیا چوار دانەم کێشا، شەویش دوو دانە، چواردە دانەش ماوە — دەمەوێ وا بکەم پاکەت بەشی سێ رۆژم بکات، بەڵکو تا ئەو کات پارەکەم بۆ بگەڕێننەوە.

## * شەو

بە درێژایی دوای نیوەڕۆکە، هەر خەریکی ئیماژەدان بووم بە کتێبدارەکە، سوودی نەبوو. کاتژمێر حەوت بردیانم بۆ ئۆفیسی زیندان. سکرتێرەکە، ئەو برووسکەیەی نیشانم دا کە لە "سالامانکاوە" بۆ بەڕێوبەری زیندان نێردرا بوو.:

"بەڕێوبەری زیندانی ویلایەتی سیڤیل. پارە وشمەکی تایبەتی زیندانیی کۆستلێر لای "سەرهەنگ فاستێرە". سەرۆکی ناوەندی لەشکری دووهەمی سڤیل. بولێن

کە واتە بوڵێن گەڕاوەتەوە "سالامانکا". مایەی دڵناسوودەییە. سکرتێرەکە پێیراگەیاندم کە بەڕێوبەری زیندان پەیامێکی بۆ "سەرهەنگ فاستێر" ناردووە و داوای لێ کردووە پارە وشمەکەکانم بۆ بنێرێتە زیندان.

هەر بژی بەڕێوبەری زیندان.

لە گەڕانەوەمدا لە ئۆفیس، بە بەردەم ژووری ژمارە٤٤ دا تێپەڕیم، کارتەکە هێشتا ناوی "کالبارۆی" لە سەر بوو. بەڵام ژوورەکانی ٤٢ و ٤٣ ئیدی کارتیان پێوە نییە. نازانم زیندانییەکانی ناو دوو ژوورەکە چییان بەسەر هاتووە.

بە درێژایی رۆژەکە، خەریکی ئیماژەدان بووم بۆ کتێبدارەکە. سوودی نەبوو. پارە وشمەکەکانم هێشتا نەگەیشتوون. فراڤین شۆربای ماسی بوو بە پەلکە خەسی کوڵاو.

حەوت دانە جگەرەم ماوە.

### * شەممە، شەشی ئادار

بەیانییەکەی هەولّمدا ئیماژە بدەمە کتێبدارەکە. سوودی نەبوو بە جارێ پەست بووم و هەر حەوت دانە جگەرەکەم بە دووای یەکدا کێشا. پارە و شەکەکانم نەگەیشتن. کاتی نیوەڕۆ پانزە سانتیمۆسەکەیشم دایە "ئاغلیتۆ". کاتژمێر پێنج، یەك دانە سیگاری بەرگ "چروت" بە دە سانتیمۆس و یەك شقارتەی پێ کڕی. سێ قومم لێدا و کوژاندمەوە. پێنج قومیشم لەدوای خواردنی ئێوارە کێشا. هێشتا نیوەی مابوو. سبەی یەکشەممەیە، کە واتە پارە ناگات.

### یەکشەممە، حەوتی ئادار

بەیانییەکەی ڕێوڕەسم و سرووتی ئایینی لە ڕاڕەوەکەی دەرەوەی ژووری من بەڕێوە چوو. لە کلاّو ڕۆژنەکەوە، تەماشای زیندانییەکانم دەکرد کە، چوارچوار بە تەنیشت یەکترییەوە تێپەڕ دەبوون. بە درێژایی ڕێوڕەسمەکە، دەموچاوی سێ چوارێکیان بە بەرچاومەوە بوو. هەموویان گوندیی بوون. وا پێدەچوو زۆر حەزیان لە ڕێوڕەسمەکە نییە. پاشان ئامۆژکاریکردن، بە واتایەکی تر، زیاتر خوێندنەوەی هەواڵەکانی بەرەکانی شەڕ بوو نەك ئامۆژگاری ئایینی.

نزیکەی لە نیوەیەکی قسەکانی گەیشتم. قەشەی بەشەکە، هەموو "سوور"ەکانی خستەبەر هەڕەشەی نەفرینی تاهەتایی. گوتی "هێشتا دەرگای تۆبە کرایەوەیە". کاریگەریی قسەکانیم بەسەر دەموچاوی ئەو زیندانییانەوە بینی کە، دەکەوتنە بە دیدمەوە. گوێگرانی ئامۆژگاری، جگەرەیان پێشکەش بە یەکدی دەکرد، پەنجەیان لە کونی لووتیانەوە وەر دەدا، بە بێ دەنگی تفیان فڕێ دەدایە سەرزەوی. کاتی گەڕانەوەی، قەشەکە بۆ جاری دووهەم کەوتەوە ناو زوومی چاوم. کورتە بالاّ و ڕەشتالّەیەکی خڕین بوو، لە ڕەگەزی ئەو قازی عەسکەرانە دەچوو کە لە جەنگە گەورەکاندا بەرپرسی ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی ئایینی لەشکر بوون.

پاشنیوەڕۆ، ئەمینداری کتێبخانە، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو وە ژوورەکەم کەوت و کتێبی "سەفەر بە دەوری گەڕەکەکەم"ی "دوومستر"ی بۆ هێنام. لە شاگەشکەییدا پاشماوەی جگەرەکەمم کێشا. قونکە جگەرەکەم هەلّگرت تا پاشان تووتنەکەی بجووم. جووین، بە باشی جێی جگەرەکێشان دەگرێتەوە.

### * دووشەممە/ هەشتی ئادار

ئەوەندەم حەز بە جگەرە بوو قونکە جگەرەکەم هەر بە جارێك خوارد.

سێ کەسی نوێی سەیر و سەمەرەم لە نێو حەوشەکەدا بە دی کرد. لە شێوەی مرۆڤە بەرێزەکان جلیان لەبەر کردبوو- وەك بڵێی پارێزەر، پزیشك یان شتێکی لەو بابەتە بن- بەڵام هەر سێکیان ریشێکی رەش و درێژیان هەبوو. رەنگ و رووی کاڵەوە بوویان لە روخساری مردووان دەچوو، سپی و پەڕیو وەك سپیاتی لێفە.

هەرکە گەیشتنە ناو حەوشەوە، زۆربەی زیندانییەکانی ئەوێیان لە باوەش گرت، هەر سێکیان دەگریان. وای بۆ چووم دەبێ ماوەیەکی زۆر لە ژووری تاکەکەسی بووبێتن و ئەمرۆ یەکەمجارە رێگەیان پێدراوە بێنە حەوشەوە. بیرم کردەوە لەوانەیە سەروبیچمی منیش وەك ئەوان سەیر و سەمەرەی لێ هاتبێ- سبەی دەبێتە مانگێك لە نێو تاکەکەسیدام. نیوەڕۆ لە بەندیوانەکەم پرسی ئایا بۆم هەیە نامەیەك بۆ بەڕێوەبەری زیندان بنووسم و داوای لێ بکەم پەیامێکی دیکەی خێرا بنێرێ تا پارە و شمەکەکانم زووتر بۆ بنێرن. بەندیوان گوتی دوێنێ بەڕێوەبەری زیندانیان بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکی زۆر گرنگ گواستۆتەوە نەخۆشخانە. ئامۆژگاری کردم هیچ شتێك بۆ جێگرەکەی نەنووسم باشترە. ئومێدم بە وەرگرتنەوەی پارە و شمەکەکان نەما. باشتر. ئومێد واتە چاوەڕوانی. چاوەڕوانیش مرۆڤ تووشی تووڕەیی و هەڵچوون دەکات.

## * چوارشەممە/ دەی ئادار

دوێنێ مانگێکم تێپەڕاند لە نێو زینداندا. سەرەڕای تێفکرین و وردبوونەوەی بەردەوامم و کێشانی هەموو جۆر و چەشنە نەخشەیەك، بە هیچ شێوەیەك لە توانامدا نییە وێنای داهاتووی خۆم بکەم. بەڵام سەر لەبەری نەخشەکان، جۆرێك، خەیاڵاوی و ناراستەقینەن. هەموو تێفکرینەکان زیاتر شێوەی زیندە خەون بە خۆوە دەگرن. هەرکاتێ دەرگای ژوورەکە دەکرێتەوە و، هەوای پاك لە نێو رێڕەوەکەوە دێتە ژوورێ، سەرمگێژ دەبێ و، دەبێ پاڵ بدەمە مێزەکەوە بۆ ئەوەی نەکەوم. کاتێك بەندیوانێك وشەیەك دەمدوێنێ لە شاگەشکەییا دەنگم گڕ دەبێ. هەموو کتێبەکەی "دوومستێر"م هەر شەوەکەی خوێندەوە و لە بەیانییەوە دیسان بە بێهوودەیی کارم بۆوە ئیماژەدان بە کتێبدارەکە. وەك پێدەچێ کتێبدارەکە بە ئانقەست رووم لێ وەردەگێرێ. رەنگە لە تەمەڵی بێ و تاقەتی کتێبهێنانی نەبێ. بێگومان دەبێ ئەو هەندە نەقڵی پێدا بشکێتەوە بزانێ کتێب بۆ زیندانییەك لە ژوورێکی تاکەکەسیدا واتای چی دەگەیەنێ. وا دەزانم زیندانییە سیاسییەکان هۆگرییەکی زیاتریان بۆ یەکدی هەبێ. لە دەرێ، لە ناوحەوشە، دەستیان داوەتە دروستکردنی ئاودەستێك. بە کەرپووچ لە نێوەراستی حەوشەکەدا

درووستی دەکەن. دڵم هانکە هانکێتی بۆ جگەرەیەك. وام بیر دەکردەوە ئەگەر جگەرەیەکم هەبوایە دەکرا هەموو سەختییەکانی دیکە تەحەمول بکرێت. کاتی خواردنی ئێوارە هەوڵمدا دانەیەك لە "ئاغلیتۆ" وەربگرم. دەڵێ نییەتی، لە کاتێکا بە بەردەوام گیرفانی پڕ لە جگەرەیە. بەڵام ئەو بە "ئارتۆریتۆ" بانگم دەکا و لەهەر رێکەوت و دەرفەتێکدا بە سۆز و میهرەبانییەوە دەستێك لە پشتم دەدا.

## * پێنج شەممە/ یازدەی ئادار

کاتێك زیندانییەکان بەرەو حەوشە دەبەن و کاتێکیش دەیانگەڕێننەوە بۆ نێو ژوورەکانیان، چوارچوار بە نێو رێڕەوەکەدا و بە بەردەم ژوورەکەمدا تێدەپەڕن. هێواش هەنگاو دەنێن و قاچەکانیان بەدوای خۆیاندا رادەکێشن. زۆربەیان سۆلی لباد و سەندەلی کندریان لە پێ دا بوو. لە بەردەم کڵاو رۆژنەکەی ژوورەکەم رادەوەستم و بە چاوەکانم سەیری رێڕۆیشتنی ئەو دەموچاوانە دەکەم کە یەك لە دوای یەك دەکەونە نێو چوارچێوەی نیگام هەموویان خوویان بەوەوە گرتووە، کە دەگەنە راست هەر ژوورێك، کارتی ناوەکانی سەر دەرگاکان بە دەنگی بەرز دەخوێننەوە. زۆرجاران بیستوومە، ناوی من بە دەنگێکی کپ و پانزە- بیست جار بەدوای یەکدا حونجە دەکەن:

"ئار- تو- ر- کوست- لێر". جاریەجار یەکێکیان، پاشماوەکەش دەخوێنێتەوە:

"سەر- دانی- کر- دنی- قە- دە- غەیە. o-jo - o.jo" واتە: "دەبێ لە ژێر چاودێری بێ". هەندێجار کە چوومەتە نێو دەریای خوێندنەوە، یان خەیاڵاتەوە، فسکە فسکی کتوپڕ، وەك ئەوە وایە دەڵێی کۆڕسێك لە رۆحەکان لە ئاوازێك دەخوێنن. ئەمڕۆ نیوەڕۆ، کاتێ بۆ خەوی پاشنیوەڕۆ دەگەڕانەوە، یەکێکیان هەر بۆ گاڵتە، پارچە کاغەزێکی فڕێ دایە ناو ژوورەکەمەوە...

## "لەندەن، پاییزی ١٩٣٧"

**پارچە کاغەزێکی قاوەیی رەنگ بوو کە، گرمۆڵەیان کردبوو. کاتێ کردمەوە نووسرا بوو:**

**"هاوڕێ، دەزانین لێرەی و لایەنگری کۆماری ئیسپانیای. بە ئیعدام حوکم دراوی، بەڵام گوللەبارانت ناکەن. زۆر لە پاشای بەریتانیا دەترسن. تەنیا ئێمە دەکوژن- ئێمەی بێکەس و داماو "Los pobresy humildes"**

**"دوێنی دیسان هەڤدە کەسیان لە نێو گۆڕستانەکەدا گوللەباران کرد. سەروەختێ ئێمە سەد کەس لە نێو ژوورەکەدا بووین، ئێستا تەنیا حەفتا و سێ کەسمان ماوین. هاوڕێ خۆشەویستە**

**بیانییەکە، ئێمە هەر سێکمان حوکمی مەرگمان بەسەردا دراوە و یان ئەمشەو یان سبەی گوللەبارانمان دەکەن. بەلاّم ڕەنگە تۆ زیندوو بمێنی. ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ئازاد بووی، دەبێ هەموو شتێك لە بارەی ئەوانەی ئێمەیان کوشتووە بە هەموو دنیا بڵێی. ئێمە دەکوژن لەبەر ئەوەی ئازادیمان دەوێ نە هیتلەر. سوپای سەرکەوتووی ولاّتی ئێمە "تۆلە دۆیان" ئازاد کردووە. ئۆیەدۆ، ڤیتۆریا و باداخۆسیشیان گرتووە. بە زوویی دەگەنە ئێرە و سەرکەوتووانە بە نێو شەقامەکاندا دەمانگێڕن. دیسان نامەت بۆ دەنێرین. بە هێز بە. خۆشمان دەوێیت.**

**"سێ چریکی کۆماریخواز"**

بەلاّم هیچ نامەیەکی تر نەگەیشت. پاشان زانیم دووانیان هەر ئەوشەوە ئیعدام کرابوون و سێهەمینیشیان، دوای ئەوەی حوکمەکەیان هەندێ سووک کردبوو، سی ساڵ بەندکردن و کاری سەختیان بۆ بڕیبۆوە- بە حیسابی ئیسپانیا دەکاتە زیندانیی تاهەتایی. دەبوایە دەقی نامەکە ئەزبەر بکەم. بێ زێدەگۆیی بۆتە بەشێك لە جەستەم، چونکە نێو کاتژمێر دوای وەرگرتنی نامەکە، ژوورەکەم لە لایەن دەستەیەك لە پاسەوانەکانی زیندان پشکێندرا. دەرفەتم نەما بیدڕێنم. بە ناچاری قووتم دا.

*** هەینی/ دوانزەی ئادار**

بەیانییەکەی کتێبدارەکە، کتێبی "مەرگ لە نێو هەورەکان"ی "ئاگاتا کریستی" بۆ هێنام. ژنە ڕیباخۆرێك لە نێو فڕۆکەدا، بە دەرزییەکی ژەهراوی، خەلّکی ناوچەکە دەکوژێ... لە نێوحەوشەدا، بێکەس و داماوەکان هێشتا خەریکی تۆپێن و شەق و شەقێنن. ئەستەمە بلّێی یەکێکیان لێ کەم بۆتەوە یان بە دیاریکراویی بلّێی کێیان لێ کەم بۆتەوە. کاغەزەکانم خەریکە تەواو دەبێ. ئەوەندەیش ورد دەنووسم ئاو لە چاوەکانم دێ.

**شەممە/ سیانزەی ئادار**

دوێنێ شەو دیسان یەکێك لە "مور"ەکان هەلّیدا بووە گۆرانی چڕین. گۆرانییەکە هەر تەنیا دوو وشە بوو بەردەوام دووبارەی دەکردەوە. Yala – ee – lay yala –ee –lay، ئای شەو! ئەم گۆرانییەم چەندین جار لە ولاّتی سوریا و عێراق بیستووە، کاتێ حوشترەوانەکان، شەوانە

بەدوای حوشترەکانیاندا رێ دەکەن، هەرهەمان ئەم دوو وشەیە، بە ئاوازێکی زۆر خەمبار دەچڕن. پاشان پشیلەیەکی رەش و بچووك هاتە سەردانیم. لە حەوشەوە خۆی هەڵاوێشتە سەر لێواری پەنجەرەکەمەوە. زۆرم پێ خۆش بوو بهێنایەتە ژووریّ بەڵام تۆڕە سیمییەکە لە نێوانماندا بوو، تەنانەت نەمتوانی دەستێك بەسەر و گوێی دابێنم. بە هەناسە ساردی گەڕایەوە و خۆی هەڵدایە سەر پەنجەرەی تەنیشتمەوە. ژووری ژمارە (٤٢). دیار بوو لە سەرما بە شوێن پەناو پەسیوێکی گەرمدا دەگەڕا. رێگای بە هیچ شوێنێك دا نەبرد و وەك کۆرپەیەك، تا بەیانی نووزەی دەهات. دیارە ئێستا وای لێکداوەتەوە کە خەڵکی ئەم ماڵە چەند نامیهرەبان و بێ بەزەیین کە ئاوها تۆڕی سیمییان لە پەنجەرەکانیان داوە نەوەکا بێچووە پشیلەیەك بچێتە ژوورەوە. بە درێژایی ئەمڕۆ، بێچووە پشیلە رەشەکە لە نێو حەوشەکەدا مایەوە و یەکێکی دیکەشی لەگەڵدا بوو، دانەیەکی سپی : هەمووان لەگەڵیاندا میهرەبان بوون- میهرەبانتر لەوەی لەگەڵ "پێدرۆی" داماو و گاڵتەجارە دێهاتییەکەمان بوون. ئەمڕۆ دیسان پەست و تورەیان کردەوە. هەموو پاشنیوەڕۆکە باران باری و حەوشەکە چۆڵ مایەوە. ئێستا شەوە و هێشتا دەبارێ. قۆرتەکانی نێو حەوشە هەمووی پڕ بوونە لە ئاوی باران، هەندێ لە قۆرتەکان هێندەی حەوزێك گەورەن.

ئەمڕۆ، چوار هەفتەم لێرە بەسەر برد.

## * یەکشەممە/ چوارەی ئادار

دیسان خەوم لێ ناکەوێ. نزیکەی کاتژمێر یەك هەستامەوە و کەوتمە تەماشاکردنی حەوشە. بارانەکە راوەستا بوو، شەوقی ئەستێرەکان کەوتبووە نێو قۆرتە پڕ ئاوەکانەوە. کپی و بێ دەنگییەکە ئەو هەندە خەست بوو گوێم لە قارە قاڕی بۆقەکان دەبوو- لە شوێنێك، رەنگە لە دەرەوەی زیندا. بیستنی ئەو دەنگانە خستمیە ئەو خەیاڵەوە وەك ئەوەی لە کوێستانان بم. بەیانییەکەی دیسان سرووتە ئایینییەکەیان دووپات کردەوە بەڵام ئەمجارەیان بێ ئامۆژگاریکردن. رەنگەی هەواڵەکانی بەرەکانی شەڕ دڵخواز نەبووبێتن و هێزە غەیبییەکانیش بە هاواریانەوە نەهاتبن. نازانم لە دنیای دەرەوەی ژوورەکەی منداو ئەم زیندانە، چی روودەدا و چی دەگوزەرێ. هەندێجار بیرم دەکردەوە لەوانەیە تا ئێستا شەڕی جیهانیی دەستی پێ کردبێ. گۆڕدوییەکانم ئەوەندەیان کونی تێ بووە کەڵکی لە پێ کردنیان نەماوە. نیوەڕۆ، بەندیوانێکی نوێ هات. نێرە سەگێکی قەڵەو و تورە. بە شێوەیەکی سەیر شێوەی لە "چارلز لاتۆن" کە لە فیلمی "شۆرش

لە باونتی"دا ڕۆڵی کاپیتان بلای دەبینی، دەچوو. بە درێژایی ڕۆژەکە، هەوڵی سەرنجڕاکێشانی کتێبدارەکەم دا، بێ سوود بوو. ئەمڕۆ، زۆر کتوپڕ، گواستمیانەوە بۆ ژووری ژمارە "٤٠"ی تەنیشتمەوە. هۆکارەکەیان پێ نەگوتم. زۆر لە ژوورەکەی پێشترم دەچێ تەنیا شوێنی سەیرکردنی حەوشەکە هەندێك جیاوازی هەیە. لە ژووره نوێکەمدا، هەست بە غەریبی و بێ ئۆقرەیی دەکەم. جێی ئەو هێڵ و خەتخەتۆکانەی بەسەر لا دیوارەکانمدا کێشا بوو زۆر خاڵییە.

## * دووشەممە/ پانزەی ئادار

بەیانییەکەی، کتێبدار، کتێبی "بەسەرهاتەکانی دێڤید بالفۆر"ی بۆ هێنام کە بەرهەمێکی "ستیڤێنسن"ە. پێنج دانە کاغەزی سپیشی لەگەڵدا هێنا بوو بۆم. هەوڵم دا پستایەکی بە قەرز لێ وەربگرم بەڵام گوتی خۆیشی فلسێك لە گیرفانیدا نییە. جگەرەیەکی وێدام- یەکەم جگەرە لە دوای چەندین ڕۆژ. قومە سەرەتاکانی چێژێکی خۆشی هەبوو کە چی کەمێك دواتر سەرو دڵی تێکدام. نیوەڕۆ، لە بیریان چوو خواردنم بۆ بێنن. چونکە گواسترابوومەوە ژووری نوێ. ئەوەندە دەرگاکەم کوتا دەستەکانم ئازاریان تێکەوت. دواجار، کاتژمێر چوار کاسە لۆبیایەکیان بۆم هێنا. هەڵبەت نە لە ناو کوپە، هەر وا لەناو کاسە. گومانی ئەوەم لا دروست بوو پاشماوەی بەردەستی ئەوانی دیکەیان بۆم هێنا بێ، بەڵام هەرچۆنێ بوو خواردم. ئێستا ئیدی نێرە سەگ بە بەردەوامی ئێشکگرە. مرۆڤ بە بینینی قەڵس دەبێ و دڵی دەگوشرێ. پێشتر بەندیوانەکان، لە کاتی هێنانی ژەمە خواردنەکاندا جار بە جارێ دوو قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکردین. بۆ نموونە دەیانگوت : "ئارتۆریتۆ! شۆرِی کەوە بن سمێڵت، گۆشتی پێ دەگری" یان گاڵتەی لەم بابەتە. کاریگەری ئەم دوو قسە خۆشە هەتا چەند کاتژمێرێك لە دڵمدا دەمایەوە و سەرحاڵی دەکردم. ئاستی زەوق و دڵخۆشیی شەوێك ، یان پاشنیوەڕۆیەك پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە شێوەی ئاخاوتنی "ئاخلیتۆ"یان هەر بەندیوانێکی دیکەوە هەبوو لە کاتی هێنانی ژەمە خواردندا، ڕێك وەکو پێوەری بوومەلەرزە لە بەرامبەر شەپۆلە دۆستانە یان نادۆستانەکاندا کاردانەوە دەردەخەم. نێرەسەگ کاریگەرییەکی ترسناکی پڕ لە خەمۆکی و دڵتەنگی هەیە.

## * شەو

سەرەڕای هەموو ئەو ڕێزە زۆرەی بۆ خۆم هەیە، ناتوانم بە چاوی بوونەوەرانی هەورازتر لە خۆم سەیری بەندیوانەکان نەکەم. زانین و بیرکردنەوە لەوەی لە نێو حەسارێکدایت وەکو ژەهرێك وایە هێدی هێدی کاری خۆی دەکات و کەسایەتی مرۆڤ بە تەواوی دەگۆڕێ. ئەمە لە

گۆڕانکارییەکی دەروونی زۆر گرنگترە، گرێی خۆ بە کەم بینینیش نییە- بگرە حاڵەتێکی ئەو هەندە سرووشتییە ناکرێ مرۆڤ خۆی لێ نەبان بکات. کاتێك رۆمانەکەم لەمەڕ گلادیاتۆرەکاندا دەنووسی هەمیشە دووچاری ئەو سەرسوڕمانە سەیرە دەبووم کە کۆیلە رۆمییەکان ژمارەیان دوو سێ هێندەی پیاوە ئازادەکان دەبوو، بۆ ئاغا و خاوەنەکانیان رانەدەکێشایە خوارێ. تازە وا خەریکە ئەو راستییەم بۆ روون دەبێتەوە کە، لە نێو زیهنییەتی کۆیلیەکدا چی هەیە. بۆم هەیە رای خۆم بەم شێوەیە دەربڕم هەر کەسێك لە بارەی دەروونناسی خەڵك و کۆمەڵگەوە قسە بکات پێویستەساڵێك لە نێو زینداندا بگوزەرێنێ. قەت ئەم بۆچوونەم بە راست نەزانیبوو کە دیکتاتۆرێك، یان تاکەکەسێك، یانیش کەمایەتییەك، تەنیا بە هێزی شمشێر بتوانێ زاڵبوون و دەسترۆیشتوویی خۆی بپارێزێ. بەڵام ئەوەشم نەزانیبوو کە هێزەکانی خووە بۆماوەییە شاراوەکان تا چ رادەیەك راستەقینە و زیندوون و لە توانایاندایە زۆرینە لە ناوەوەدا پەك بخەن. نەمدەزانی چەند خێرا مرۆڤەکان بەچاوی بوونەوەرە زیندەوەرزانییەکان دەڕواننە چینێکی هەڵبژێر و پشك و پێدراوەکانیان، ئەوهەندە بە شتێکی ئاسایی و رەوا دەزانی وەك ئەوەی داراییەکانیان پشکی سرووشتی بن بۆ ئەوان. کلیل لە لای "دۆن رامۆن"ەو منیش لە نێو قەفەز دام. "دۆن رامۆن"یش وەك من، ئەم حاڵەت و بارودۆخە زۆر بە سروشتی و ئاسایی دەزانێ و هەر بیریشی بۆ ئەوە ناچێ کە شتێکی پێچەوانەی شتە باوەکان لە ئارادا بێ. ئەگەریش دنە دەرێکی شێت بهاتباو ئامۆژگاری ئەوەمان پێ بفرۆشێ گوایە هەموو مرۆڤەکان یەکسانن هەر دووکمان بە گاڵتەجارییەوە بە قسەکانی ئەو پێدەکەنین. "دۆن رامۆن" لە نیوەی دڵییەوە و منیش راستە هەندێك بە نا بەدڵێ، بەڵام بە هەرحاڵ پێدەکەنیم.

## سێ شەممە/ شانزەی ئادار

هەفتەیەکی تریش تێپەڕی، پێنج هەفتە بەسەر دەستگیرکردنەکەمدا و نزیکەی چوار هەفتەیش بەسەر سەردانیکردنە فەرمییەکەی خانمە جوانەکەی "هرست پرێس" تێپەڕیوو. ئەگەر "فرانکۆ" حوکمەکەمی هەندێك سووك بکردبایەوە تا ئێستا هەواڵێکیان پێ دەدام. دیاریش نییە ئەگەر سوککردنی حوکمەکەیشم رەت بکرێتەوە هەواڵم پێ دەدەن یان نا. ئایا لە حاڵەتی ئاوهادا مرۆڤ تا دواساتەکانی جێبەجێکردنی حوکمە لێبڕاوەکە ئاگادار ناکرێتەوە؟ پاشانیش، تا ئێستا لە بارەی رای دادگای عەسکەریی "مالاگا" شتێکم پێ نەگوتراوە بە حاستەم حاڵەتی هاوشێوەم بە بیر دێتەوە. بۆ نموونە "هۆپێتمان لیندبێرگ"ی بکوژەکەی

منداڵان، بیست و چوار کاتژمێر بەر لەوەی بەرەو کورسی کارەبایی بیبەن لە ڕەتکردنەوەی تەمیز کردنی حوکمەکەی ئاگادار کرایەوە، نازانم کامیان باشترە. وا بزانم ئاوها باشترە کە تا دواسات هیچ شتێ نەبیستم. هەڵسوکەوتی دڕندە لەوە دایە، لە سووککردنەوەی حوکمەکە ئاگادارت نەکەنەوە و بە مانگ و ساڵ، مرۆڤ لە چاوەڕوانی دا بهێڵنەوە. بە درێژایی ڕۆژانی هەفتەی ڕابردوو، ئەم زنجیرە لێکدانەوەو بۆچوون و سەراوبنکردن و بێنەو بەردەیە بە نێو مێشکمدا گوزەریان کردبوو. سەرم تەنیا لەوە سوڕ ماوە چۆن ورەم لەوەی کە هەیە، خراپتر و وێرانتر نەبووە. ئەگەر ڕۆژێک لێرە بێمە دەرێ، هەمووان دەستەکانیان هەڵدەبڕن و دەڵێن بێگومان زۆر بە سام و ترس بووە. منیش بەردەوام هەستێکی ئەهریمەنییانەم دەبوو وەك بڵێی شتەکان ئاوها کە ئەوان بیری لێ دەکەنەوە ئەو هەندەیش ناخۆش و خراپ نەبووە. مایەی گاڵتەجاڕییە کە توانای خۆڕاگریی مرۆڤ چەندە لێك رادەکێشرێ. لە ڕۆژانی سەرەتادا فاڵم بە دوگمەکانی کراسم دەگرتەوە : لێخۆشبوون- ئیعدام- لێخۆشبوون- ئیعدام...

پاشان وازم هێنا، هەرجارێك فاڵەکە خراپ بهاتبایە زراوڕژین دەبووم. خۆشییەکە لێرەدایە کە مرۆڤ قەت ناتوانێ ئەو باوەڕە لە ناو خۆیدا دروست بکات کە، هەموو ئەوانە ڕاستەقینەیە و گەمەیەکی ئاڵۆز نییە. بە ڕاست، کێ باوەڕ بە مەرگی خۆی دەکات؟ قەت ناتوانم ئەو قسەیەی "سرپیتەر" لە مێشکی خۆم وەدەرنێم کە "مرۆڤ بەر لە کوشتنی خۆی بە دەرزی، پێویستە سرنجەکە، باش تەعقیم بکات ئەگینا دوچاری وەرەمی پیس دەبێت". وابزانم دەبێ هاوکێشەیەکی بیرکارییانە هەبێ : بێ باوەڕیی سەبارەت بە مەرگ، هاوتەریب لەگەڵ نزیك کەوتنەوەی مەرگ گەشە دەکات. لەو باوەڕەدا نیم لە سەرەتای دروستبوونی دنیا و تا بە ئەمڕۆ هیچ کەسێك بە ئاگاییەوە مردبێ. کاتێك "سوقرات" لە نێو بازنەی قوتابیەکانیدا، دەستی بۆ جامە ژەهرەکە درێژ کرد، بەلای کەم دەبێ ئەوەی بەلاوە یەکلایی بوو بێتەوە کە ئەو وا خەریکە نمایشێك پێشکەش دەکات، ئەو دەبێ لە ڕوانگەی خۆیشیەوە کارەکەی بە هەڵسوکەوتێکی قەڵپ و ناڕاست هاتبێتە بەرچاو و لە بنی دڵییەوە، ڕەنگە سەری لە پێڕەوکارەکانی سوڕ مابێ کە هێندە کارەکەیان بە جیدی هەڵگرتووە. هەڵبەت لەرووی تیۆرییەوە ئەو دەیزانی بە خواردنی ژەهرەکە کۆتایی بە ژیانی دێ بەڵام بێگومان هەستی بەوە کردووە کە، سەر لەبەری ڕووداوەکە، لەگەڵ ئەوەی قوتابییە تامەزرۆ و جدییەکانی وێنای دەکەن زۆر جیاوازە و، دەرەتانێکی زیرەکانە لە پشتەوەی ئەم گەمەیەدا هەیە کە تەنیا ئەو دەیبینێ. هەڵبەت هەموو کەسێك دەزانێ ڕۆژێك هەر دەمرێ بەڵام زانینەکە شتێکە و باوەڕکردنەکەیشی شتێکی ترە. ئەگەر وا

نەبوایە، ئاوها کەوا ئەم شتانە دەنووسم، وا بیر بکەمەوە هەموو ئەم شتانە تیۆرین و دوور و نزیك هیچ پەیوەندییەکیان بە منەوە نییە؟ لە راستیدا بەلای کەم رۆژی جارێك تێلەکانی هۆشیاریم وێك دەکەون و شۆرتێك دەکەن و بۆ چەند خولەکێکی بە دوای یەکدا، راستەقینەکە لە نێو تیشکێکی رۆشنایی درەوشاوە، لە بەرامبەر چاوەکانمدا دەبینم وەك ئەوەی تەقینەوەیەکی دەروونی، رۆشنی کردبێ. دواتر ئیدی نە بیرکردنەوەیەك هەیە و نە حەبێك لە بەردەست، ئەوەی ماوەتەوە تەنیا ترسێکی بێ بەزەییە. بەڵام ئەویش تێدەپەڕێ. هەموو شتێك تێدەپەڕێ، تەنانەت ئەو ساتەیش کە مرۆڤ لە بەرامبەر جۆقەی ئیعدام رادەوەستێ و گوللە و قورقوشم، وەك دزێل، رێگای بە نێو دەم و لووت و چاوەکانیدا دەکاتەوە و پاشان هەموو شتێك لە دوای مرۆڤدا جێ دەمێنێ. کە وایە ئەگەر هەموو شتێك تێدەپەڕێ ئەی بۆ خۆم تووشی دڵهەڵشیوان بکەم. تا ئێستا پێشم بە خۆم گرتبوو، ئەم جۆرە شتانەم نەدەنووسی. چیدیش نابێ بیاننوسم، چونکە دڵم بە یەکا دەدات. ئاخ ئەگەر رێگایەك هەبوایە ئەو پشیلە چکۆڵەیەم بهێنابایە ناو ژوورەکەم.

## چوارشەممە/ هەڤدەی ئادار

لە ماوەی دوو رۆژدا هەموو کاغەزەکانم تەواو بوو. لەمەو بەدوا ئەو شتانەی پەیوەندییان بە یادداشتەکانی رۆژانەمەوە نییە "بیرکاری و ئەم جۆرە قسە قۆڕانە" لەسەر کاشییەکانی سەر دەستشۆییەکە دەنووسم پاشان دەکرێ بیانسڕمەوە. پاشنیوەڕۆ شتێکی سەیر رووی دا. بردمیانە گەرماو. گەرماوەکەی زیندان زۆر ماقووڵانەیە. بێجگە لە دۆش و ڤانێۆ، حەوزێکیشی بۆ مەلەوانیکردن هەیە. بەڵام ئێستا هیچ شتێك وەکو خۆی نییە. حەوزەکە بەتاڵ و پیسە و شێرەی ڤانێۆکەیش تێك چووە. تەنیا دوو لە دۆشەکانی ئاوی سارد ئیش دەکات. بەڵام چ لەزەتێکی هەبوو. ئەمە سەر لە نوێ پاکبوونەوەیە. بەختم باش بوو لە نێو حەوزەکەدا شتێکم دۆزییەوە : پاشماوەی سابوونێکی دەستشوتن. "کابالرۆ" هێشتا لەوێیە. ژوورەکانی ژمارە ٤١ و ٤٣ بەتاڵن، بەڵام ناوێکی نوێی ئیسپانی بە سەر ژووری ژمارە ٤٢ وەیە.

## * پێنج شەممە/ هەژدەی ئادار

سێ میوانی تازە لە نێو حەوشەکەدا بوون. ردێنیان تاشیون و دەموچاویان کەمێك هەتاوبردەڵە بووە. دڵخۆش بووم کە سەروبیچمی جحێلە قژ زەردە باڵابەرزەکەم جارێکی تر بینییەوە. چەند رۆژێ بوو دیار نەمابوو، ترسام نەوەکا...

"ستیڤێنسن"م تەواو کرد، چێژێکی بەکجار زۆرم لێ وەرگـرت. زۆرخۆشـە کـە بەرهـەمی نووسەرە ئینگلیزەکان ئاوها بە جوانی وەردەگێڕدرێنە سەر زمانی ئیسپانی. ئێستا سـەر لە نوێ کاری ئیماژەدان بە bibliotecario "کتێبدارەکە" دەست پێ دەکاتەوە.

## هەینی/ نۆزدەی ئادار

بەیانی زوو داوام کرد جارێکی دیکە ردێنم بتراشن، بەڵام گوتیان ئەمڕۆ Fiestaیە. واتە پشـووە. دەبێ هەینیی بەر لە جەژنی پاك بێ. جەژنی پاك دێت و ڕەنگە من، هەر لە بیریشی دانەیم...
ئەمڕۆ دیسان ڕێورەسمی ئایینی ئەنجام دەدرا و، بۆ نیوەڕۆیش شۆربا ماسـییەکی باشیان پـێ داین. ئێستا هەموو ڕۆژانی هەینی شۆربای ماسیمان دەدەنێ و هەندێجار تیکـە گۆشـتێك لـە ناو لۆبیا یان پەتاتەکان دا هەیە. نیـوەڕۆ کتێبدارەکـە وە ژووری کـەوت و کتـوپڕ بـە زمـانی فەرانسەیی دوا، ئەویش بە شێوەزاری پاریسی. حەپەسام، چونکە تا ئەو کاتی هیچ زاراوەیەکی بیانیم لە نێو ئاخاوتنە ئیسپانییەکەیدا بەدی نەکردبوو. بـۆ سـبەی بـەڵێنی کتێبێکـی تـازەی دامێ و ئامۆژگاری کـردم : "زۆر خەفـەت مـەخۆ"، خۆزگـە لـە بـاتی ئامۆژگاریکردنەکـەی پستایەکی بە قەرز وێدا بام. پاشان بەندیوانێکی نوێ هاتە ژوورەکەم، نەمزانی چـی دەویسـت، خەندەیەکی شیرینی کرد و ڕۆیی. کەمێك دواترJefe servicio یەکی نوێ هات. یونیفـورمێکی فالانژیستی لەبەر دا بوو. زۆر وشك و ڕەسمی. پرسیارم لێ کرد لەمەڕ پارەکانم ناتوانێ هیچم بۆ بکات. بەڵێنی دا سبەی قسەیەکی لێوە بکات.

## * شەممە/ بیستی ئادار

لەسەر ڕاسپاردەی کتێبدار "ئاخێل" کتێبێکـی بـۆم هێنـا "گێلاسـەکانی گۆڕسـتان" لـە بەرهەمەکانی "گابریل میرۆ" بوو. زیل، قسەی حەلەق و بەلەق، عاشقانە. لە پەنجەرەوە سەیری دوو فڕۆکەی ڕاوم کرد کە وەکو دوو دۆلفینی گەنج لە نێو شینایی ئاسماندا هەڵبـەز و دابـەزیان دەکرد. دیمەنێکی تەواوی نمایشکردنی ئازادیی. تەنانەت ناتوانم بیریش لەوە بکەمەوە ئەگەر لە دوای دە ساڵی دیکە لێرە بچمە دەرێ و لەم ماوەیەدا هیچ هەواڵێك و ڕۆژنامەیـەکم نەکەوێتـە بەر دەست چ جۆرە دنیایەك دەبینم. چاوێکی خێرام بەو گۆڕانکارییانە داخشاند کە لـە ۱۹۲۷ تا ۱۹۳۷ ڕوویان داوە. جیاوازییەکان شایانی باس نین. پاشـنیوەڕۆ، لـە کونەکـەوە، دوو ژنـی ڕەشپۆشم بینی کە، بە نێو ڕێڕەوەکەدا دەڕۆیشتن، بەڵکو هەڵگری پـەیامێکی خـۆش بـوو بـن. یەکێکیان بەژنێکی وەك کۆتەڵە ڕێکتراشەکەی "ڤێلاسکۆس"ی هـەبوو. بینینیـان هەسـتێکی

خۆش و هێورکەرەوەی دەبەخشی. بە راستی سەیرە مرۆڤ لێرە چەندە دابڕاوە لە نیوەکەی تری ئادامیزاد. درەنگە شەو بیستم چەند کەسێکی تازەیان هێناوە. یەکێکیان دەگریا، بەڵام نەموێرا لە کونەکەوە سەیریان بکەم.

## * یەکشەممە/ بیست و یەکی ئادار

باران، باران، بە درێژایی رۆژ دەباری. حەوشە بۆتە زەلکاو. بەر لە دەستپێکردنی رێ و رەسمی ئایینی کەسێك وتاری دا، بەڵام هیچی لێ تێ نەگەیشتم. هەر کتێبم خوێندەوە و لە نێو دالّغە و خەیاڵاندا نوقم ببووم. هەست دەکەم رۆژ بە رۆژ زیاتر نوقمی نێو دەریای خەیاڵ و بیرکردنەوەدا دەبم — هەوراز و نشێو دەبم، هەوراز و نشێو دەبم و سێ چوار کاتژمێر بەدوای یەکدا دەچمە نێو حاڵەتێك وەکو نیوەگێژم لێ دێت. پاشنیوەڕۆ دیسان کاتژمێرەکەم پەکی کەوت. زەندەقم چوو لە ترسا. بەڵام ئەو هەندە دەستم تێوەردا تا دووبارە کەوتەوە کار.

## دووشەممە/ بیست و دووی ئادار

شەو، قەرەوێڵەکەم شکاو دابەزی- کەوتمە سەر عەرد و خەونم بینی گوللەبارانیان کردوومە. شایەتی بۆ ئەم دیاردە سەیرو سەمەرەیەیە کە لە بەشێك لە چرکەکەیدا، لە نێوان شکانی قەرەوێڵەکە و واگاهاتن دا، ماوەیەکی بەسە بۆ ئەوەی لە راستییەکی هەنووکەیی، چیرۆکێکی تەواو لە نێو زەیندا دابرێژرێت. دەنگی شکانی قەرەوێڵەکە، تەنیا کاتێك دەچێتە نێو ئاگاییەوە کە چیرۆکەکە دارێژرابێت- تا ئەو کاتە، دەنگی شکان دەبێ لەبەر دەرگای واگاییدا لە چاوەڕوانیدا بمێنێتەوە. ئەم خەونبینینە بە ئیعدامەوە- حاڵەتێکی ریزپەڕ بوو- ئێستا ئیدی زۆربەی جارەکان خەونی خۆش دەبینم. پێشتری قەت خەونەکانم ئەو هەندە جوان نەبوونە. زۆربەی جارەکان لە خەونەکانمدا پێدەکەنم و لە دەنگی پێکەنینی خۆمەوە وە ئاگا دێم. ئاژەڵانی جوان، دیمەنگەلی یۆنانی، هەروەها کچی جوان جوان بەڵام بێ سێکسکردن. بە ئاشکرا و روونی، زەینییەتی قەیرە کچانم تێدا گەشە دەکات. کاتێ کتێبێك دەخوێنمەوە ئەگەر کەسایەتی ژنی نێو کتێبەکە، پاك بمێنێتەوە و بنەماکانی پاك مانەوە رەچاو بکرێت، چێژم پێ دەبەخشێ (لە رابردوودا پێچەوانەکەی راست بوو).

... کەوتمە بیری (ئا. ن)ی هاوڕێم. کاتێ کە دەروونپشکنینیان بۆ دەکرد. وەکو ئەسپێکی بریندارم دەهاتە بەرچاو کە، خۆی لە گۆڕەپانی گا بازیدا دەهێنایە دەرێ و جەرگ و هەناوی خوێشی بە دوای خۆیدا رادەکێشا. دیمەنێکی بە راستی قێزەون. چیدی خەو نەهاتەوە چاوم.

درەوونزانەکانم لەگەڵ پاککەرەوەکان بەراورد دەکرد. بۆنی تیژی کار و پیشەکەیان، تەنانەت لـە ژیانی تایبەتیشیاندا لە کۆڵیان نەدەبۆوە. لە نێو چاوەکانیاندا، هەمیشە حاڵـەتێکی دەرخـەری پاککردنەوەی رۆح دەبیندرا. وەك نارازیبوونێك سـەرنجم داوەتە خۆم کە، لەم تەنیاییەمدا رۆژ لە دوای رۆژ ناجسنترم لێ دێ. هەستیار و ناجسن. نیودرۆ سێ جگەرەم لە "ئانخێل" سەند. هەوڵ دەدەم رۆژی یەك دانەی لێ بکێشم. دیسان فرۆکەکان. فرۆکەکانی جۆری "هانیکل و کاپرۆن"ی و هەر یەکەو هێمایەکی خاچێکی سپی بەسەر کلکیانەوە. حەوت دانە بوون. ئێـوارە سـەرتاش هات و مەکینەیەکی بە دێنم داهێنا. گوتم بۆ بە تیخ نایتاشی. گوتی تیخ مەسرەفی زۆرە.

## * سێ شەممە/ بیست و سێ ئادار

دوو جگەرەم ماوە بەڵام شقارتەم نییە. ئـەم بەیانییـە "ئانخێـل"یش شـقارتەی وێ نـەبوو. بەڵێنی دا نیوەرۆ بیهێنێ. تەنیا یەك پەڕ کاغەزم ماوە.

## * چوارشەممە/ بیست و چواری ئادار

کاتژمێر دوانزە، دوا جگەرەکەم کێشا. دیسان حەزی فالگرتنەوە وەك مۆریانە کەوتۆتە بـن پێستمەوە. ئاوها کە هەورازو نشێو دەبمەوە دیقەت دەدەم تا پێیەکانم لە ناوەڕاسـتی بـەردەکان دابنێم. ئەگەر دوای پێنج جار هەورازو نشێوکردن، پێم نەکەوتە سـەر هێڵی جەمسەری بەردەکان ئەوا لێم خۆش دەبن. پێشتریش تووشی ئەم جۆرە وەسواسانە دەبووم بەڵام هەمیشـە دەمکـووتم دەکردن، کە چی ئـەمرۆ بـۆ یەکـەمین جـار چـوومە ژێـر بـارەوە. ئـەمرۆ شـەش هەفتـە لـە دەسگیرکردنم تێدەپەڕێ.

## * پێنج شەممە/ بیست و پێنجی ئادار

بۆ جاری دووهەم کتێبی "دوومستێر"م وەرگرت و بۆ چوارەمین جار خوێندمەوە. رستەیەکی زۆرجوان: "فریشتەی دابەشکەری ئەندێشە".

نیوەرۆ، بەندیوانەکە، بە راگەیاندنی ئەو هەواڵە، کە زیاتر لە خەیاڵ دەچوو تا راستی، کـە گوایە ئەم پاشنیوەرۆیە پارەکانم دەگات، لە خۆشییا حەپاساندمی. دوو جگەرەی وەك پێشەکی وێدام. تا شەو داهات بەو پەڕی بێ ئۆقرەییەوە لە نێو ئاگری چاوەڕوانیدا هەلکرووزام و هەر بە خۆمم دەگوت دیارە هەڵە بووە — بە حسێبی ئەو باوەڕە خورافاتییە شاراوەیەی کە ئەگەر وا بیر

بکەمەوە هەواڵەکە هەڵە بووە، بێشک راست دەردەچێ. دواجار شۆربای ئێوارەیان هێنا. پرسیارم لە بەندیوانەکە کرد، پێکەنی و گوتی من بە زیندانییەکی تری ئینگلیزی تێگەیشتبوون و لێیان هەڵە ببوو، چونکە ئەو زیندانییە ئینگلیزە پارەکەی گەیشت و دایان پێی. دیارە ئینگلیزەکەی دیکە کابرا رێکپۆشەکەیە، هەرئەوەی کە لەگەڵ بەرێوەبەری زیندان هاتنە لام و ئەو وەرگێر بوو. بازرگانێکە لە کێوی تاریق "ئیسپانیاییەکی بەریتانی" کە بە تاوانی قاچاغچێتیکردن بە دراو لێرەیە. گوتم ئەی لە نێو زیندانییە سیاسییەکاندا چی دەکات؟ بەندیوانەکە گوتی قاچاغچێتیکردن بە دراو لە سەردەمی جەنگدا بە تاوانی سیاسی دەژمێردرێت.

## * هەینی/ بیست و شەشی ئادار

رۆژەکە خۆڵەمێشی و، بارودۆخ گرژو ئاڵۆز و ئازاری گەدەو، خەیاڵات و مالیخولیا. نیوەرۆ بە رێکەوت گوێم لێ بوو لە ناو حەوشەکەدا بە زمانی ئەڵمانی قسەیان دەکرد. هیچ باوەڕم نەکرد. گەنجێکی ملئەستوور و گۆنا پەمەیی و قژ بۆر، جلە شینەکانی کاری فیتەرانی لەبەردا بوو، لەسەر هێڵە سپیە یاساغەکە، لە گۆشەی بەرامبەر پەنجەرەکەم راوەستا بوو و بە هەندێك ترسەوە لەگەڵ کەسێکی ناو ژووری "٣٧" قسەی دەکرد. دوایی دەستی کرد بە هەوراز و نشێوکردن و هەرجارێك کە بە بەردەم پەنجەرەکەمدا تێدەپەڕی چەند رستەیەکی بە زمانی ئەڵمانی دەگوت. دەیگوت دەیەوێ نامەیەك بۆ کونسوڵی وڵاتەکەیان بنێرێ بەڵام کاغەزی پێ نادەن. دەیگوت لەگەڵ شەش کەسی دیکە لە ژوورێکدایە کە هەموویان ئیسپانیایی چارەڕەشن. دەیگوت لێرە هەموو "سوور"ن و پیاو دەبێ ئاگای لە خۆی بێ.

وڵامدانەوەکانی کەسەکەی نێو ژووری "٣٧"م نەدەبیست. تەنیا ئەوەندە تێگەیشتم زیندانییەکی ناو ژووری "٣٧" ناوی "کارلۆسە" بە ئەڵمانی قسە دەکات و هاوڕێی کۆنی جاحێڵە قژ بۆرەکەیە. نازانم چی لە ئارادایە. گۆرەوییەکانم فڕێ داوە، چیتر بە کەڵکی لە پێ کردن نەدەهاتن. کراس و شەرواڵەکەم پزر پزر بوونە و دڕاون و جلی سەرەوەم کە، رۆڵی بیجامەش دەبینن، وەك جلکی شانۆگەرییەکەی "ئۆپێرای دەرۆزەکەر"ی لێ هاتووە.

### * شەممە/ بیست و حەوتی ئادار

نیوەڕۆ پێشنیارێکم دایە بەندیوانەکە و گوتم کاتژمێرەکەمی دەدەمێ لە بەرامبەر دا سەد دانە جگەرەم بداتێ. قبوڵی نەکرد. کاتژمێرێك دواتر، یەکەمین نامەم لەگەڵ سەد پێستا لە "د"ێوە بۆهات. لە شاگەشکەییا وەك نیمچە شێتێکم لێ هاتبوو. بە بەرچاوی بەندیوان و سکرتێرەکەی زیندان، "ئاغلیتۆ"م کە نامەکەی هێنا بوو، لە باوەش گرت. زەردەخەنەیەکی خەمبار هەموو پانایی دەموچاوە پڕ چرچ و لۆچەکەی وەك دەموچاوی پیرێژنانەی "ئاغلیتۆ"ی داپۆشی و لە پڕێکا دڵسۆزی و میهرەبانی لێ دەڕژا. دەستی دایە، دە دانە سیغاری بەو حسێبە وێدام کە دواتر بە زیادەوە بۆی قەرەبوو بکەمەوە، پاشان هەموویان لە ژوورەکەم چوونە دەرێ. بەرواری هەشتی ئادار بەسەر نامەکەوەیە- کە واتە بیست ڕۆژی پێ چووە تا گەیشتۆتە لای من. نامەکە هەمووی بریتییە لە پێنج، شەش ڕستەی دڵخۆشکەر و سادە و ساکاری بە ئانقەست تا لە فیلتەری سانسۆر دەرباز بێ. بە شێوەیەکی زۆر نهێنی و ڕازناك گەیشتبووە دەستی کونسوڵی ئینگلیز لە "مالاگا" ئەویش ناردوویەتی بۆ بەرپرسە سەربازییەکان و ئەمانیش ناردوویانە بۆ بەڕێوەبەرایەتی زیندان. لێرە دەردەکەوێ هاوسەرم، سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی تا ئێستا نەیتوانیوە بزانێ من لە کوێم. لە دوا ڕستەی نامەکەیدا دەڵێ هەرچۆنێك بێ دەبێ چەند وشەیەکی بە دەستخەتی خۆمی بۆ بنووسم و لە ڕێی کونسوڵگەرییەوە بۆی بنێرم. ئەو ڕاستیەم لەم ڕستەیدا هەڵێنجا کە ئەو هێشتا بە لێبڕاوی نازانێ من زیندووم یان نا. دەرگاکەم کوتا و پرسیارم کرد ئایا دەتوانم وەڵامی نامەکە بدەمەوە یان نا. دیار بوو بەندیوان پێشتر لەم بارەیەوە فەرمانی وەرگرتبوو چونکە بێ هیچ بیرکردنەوەیەك گوتی : نا.

گوتم دەمەوێ تەنیا یەك وشە بنووسم: زیندووم. گوتی نابێ. پاشان "ئاغلیتۆ" هات تا پوڵە سەد پێستاییەکەم بۆ بگۆڕێ بە پسوولەی کڕین. بەمە ڕاییکردنێکەوە پرسیاری کرد ئایا دەتوانێ لە فرۆشگا خواردەمەنیم بۆ بکڕێ یان نا. بە خۆنواندنێکی ماقووڵانەوە پانزە پستام دا پێی و گوتم شتم بۆ بکڕێ و دوو پستای کاشیش بۆ خۆی هەڵگرێ.

گۆڕانکارییەکی سیحراوی لە پەیوەندییەکانماندا دروست بووە. تا ئێستا خۆم بە تەواوی لە ژێر ڕکێفی "ئاغلیتۆ" و پەیوەست بە ئەدگار و هەڵسوکەوتەکانی ئەو هەست پێ دەکرد. کە چی ئێستا ئەو چارەڕەشێکی داماوە و منیش بۆ خۆم سینیورێکم. دەبێ دان بەوە دابنێم ئەم دڵخۆشییانەی هەرزان بە دەستەوە دێ چێژی زۆرم پێ دەبەخشێ. لەگەڵ شۆربای ئێوارەم،

سەبەتەیەك پڕ لە ئەفسانەییترین گەنجینەی بۆم هێنا. جگەرە، شقارتە، فلچە و مەعجوونی ددان، قوتووبەندی ماسی بە رۆن، ماسی نێو قوتووی بە بەهاراتی تەماتەوە، خەس، خەل، رۆن و خوێ لە نێو دەفرێکی تایبەت، کالباس و بیبەری سوور، هەنجیری وشك، پەنیر، کێکی ئەندەلۆسی، شوکولات، قوتووە ماسی و چواردانە هێلکەی کولاو. سەر قەرەوێلەکەم ببووە فرۆشگای خواردەمەنی فرۆشی. بەشە شۆربا نیسکێنەکەم یەکسەرە رژاندە نێو دەستشۆییەکەوە و ئەم خواردنە ماقوولییانەم بە هەموو شێوەیەك کە حەزم لێ بوو قووت دا- شوکولات و ماسی، کالباس و شیرینی. ئەمە یەکەمجارە، لەماوەی شەش هەفتەی رابردوودا هەست بە تێریی دەکەم- تێر، کەیفساز و شەکەت. ئەگەر بکرابا تەنیا یەك وشەم بۆ "د" بنووسیبایە.

## * یەکشەممە/ بیست و هەشتی ئادار

بە هاوکاری "ئاغلیتۆ" گۆرەوی و کاغەزی سپی و سەبەتەیەك بۆ هەلگرتنی خواردنەکان و، هەروەها خواردەمەنی تریشم کڕی. زۆربەی کاتەکانی ئەمڕۆم بە خواردن و جگەرەکێشان بوورالند. کتێبدارەکە، سێ بەرگی بچووکی لە پرۆژە تەنزئامێزەکانی "ئاڤێرچینکۆ"ی بۆم هێنا. پاشنیوەڕۆ گەنجە ئەلمانییە قژ بۆرەکە دیسان لەگەلّ ژمارە "٣٧" قسەی کرد. گوتی بۆ نامەنووسین بۆ کونسولّ کاغەزی چنگ کەوتووە و بەلّێنی دا پستایەك بە قەرز بداتە "کارلۆس"ی نادیار. من نەیدەبینی. شەو زوڕناژەن، ئاوازێکی نوێی کپبوونی ژەنی. ئاوازێکی هێشتا دلّگیرتر.

## * دووشەممە/ بیست و نۆی ئادار

هەموو چێژی خواردن و خواردنەوەم لێ بۆتە ژەهری مار. هەر تیکەیەك دەخۆم دەکەومە یادی سەرچاوەی ناردنی پارە و نامەکە. ئەم فشارەی دلّتەنگ بوونە بۆ مالّ و عەیال، بە مەودای کورت و بە توندییەك کە پێشتر هەرگیز تاقیم نەکردۆتەوە، روو دەدات. ئادەمیزاد چەندە مەخلووقێکی بێ سەروبەرە، تا ئەو کاتەی برسییێتی هەموو هەست و بیرکردنەوەی تەنیا لای خواردنە و هیچی تر، هەر ئەوەیش کە زگی تێر بوو "هەستە شەریفترەکانی" سەرهەلّدەدەن و ژیانی لێ سەراوین دەکەن. سێ رۆژ پێش ئێستا، تیکە پەنیرێك بە لای منەوە رازاوەترین سفرەی خوایی بوو لەسەر ئەرز. کە چی ئێستا هەر ئەوەندەی چاوم بە تیکە پەنیر و قوتووی ماسی دەکەوێ، دەکەومە یادی مالّ و منالّ و ئۆقرەم لێ هەلّدەگیرێ. خوای میهرەبان، یەك

دانە بۆلبەرینی زیادەی لە نێو سەری ئێمەدا دانـاوە. دوای نیـوەڕۆ "ئـانخلیتۆ" بەسـەردانێکی تایبەتی هاتە لام و بەو پەڕی چلێسییەوە، بەشێك لە هۆکارەکانی بێچارەییمی لە کۆڵ کردمەوە و ماسـییە قوتووبەنـدەکان و پـەنیر و شـوکولاتەکانی هەڵلۆشـی. دوابـەدوای ئـەو Jefe de servicioی نوێ هات تا هەواڵی ئەودم بداتێ کە هێشتا "سەرهەنگ فاستێر" وڵامی داواکەی، لەبارەی پارە دەست بەسەر داگیراوەکە وشمەکەکانم نەداوەتەوە. ئێستا ئیدی شتێکی گرنگ نییە بۆم. پرسیاری ئەودم لێ کرد پێی وایە کەی لە بارەی منەوە بڕیاری کۆتایی وەردەگیرێ. گـوتی نازانێ، حسێبی "کەسێکی زۆر گرنگ"یان بۆ دەکردم، هەموو ڕۆژ خۆ هەواڵنێرێکی "سـوور" بە تەڵەیانەوە نابێ. شووتیی چاکیان دەخـستە بـن هەنگڵمـەوە، بـەڵام نـازانم "کەسـێکی زۆر گرنگ" بوون، باشە یان خراپ.

## * سێ شەممە/ سی ئادار

وابزانم Jefe تەنیا لەبەر ئەوەی کەوتبووە بەر گوێی بڕێك پارەم بەدەسـت گەیشـتووە هاتـە لام. بە راستی جێی سەرسوڕمانە لە ماوەی شەوێکدا نرخم چەندە چـۆتە سـەرێ و، چـەندیش، لەوەتەی پارەکەم وەرگرتووە بڕوا بە خۆبوونم زیاتر بووە. شەست پستام ماوە. دەبێ دەست بەوە بکەم بە بەرنامەو لەسەر خۆ پارە خەرج بکەم. خـەونم بـینی- بـۆ دووەمـین جـار لـە مـاوەی زیندانیبوونمدا- کە ئازاد کراوم. بەڵام بێ مانا و ئومێدبڕانە بوو. جـارێکی تـریش کتێبەکـەی "میل"م بە دەستەوە گرت و هەندێ رستە و پەرەگرافی بژاردەم لێ نووسییەوە.

## * چوارشەممە/ سی و یەکی ئادار

نیوەڕۆ، بەندیوان لێی پرسیم حەزم بە خواردنەوەی شەراب هەیە یان نـا، خـۆ دیـارە حـەزم لێیە. "٤٥" سانتیمۆسـی وەرگرت و دۆلکەیەکی گەورەی پڕ لە شەرابی بۆم هێنا. زانـیم هـەر زیندانییەك مافی هەیە بۆ فراڤین و ئێوارەی شەراب بکڕێ، بەڵام نە زیاتر لەو دولکەیە، بەشـی نیوەڕۆ بۆ ئێوارە هەڵدەگرم تا هەر دووکیان بەیەکەوە بخۆمەوە. شـەرابە سـپییەکی زۆر خـراپ نییە، بەڵام لەوە کەمترە کە کار لە مرۆڤ بکات. بەڵام بە هـەرحاڵ، خـودی هـەبوونی شـەراب نیعمەتێکە.

## * پێنج شەممە/ یەکی نیسان

کتێبەکانی "ئۆریلیای نێرڤال و "پیۆ دۆل"ی بیونین و "ئۆلالا"ی ستیڤێنسن"م بەیەك جار و بەسەر یەکەوە وەرگرت. نێستا ئیدی خواردنی زۆرباش و، شەراب و جگەرە و جلی پاکی ژێرەوە و کۆمەڵە کتێبێکی باشم هەیە، نیگەرانیم لە هەمبەر ئامادەکردنی هەواڵ نییە، شەڕە دەنووك لەگەڵ چاپخانە و دارێژەرو هاوکارەکانم ناکەم. ئەگەر ئاقلانە و لۆژیکی لێکی بدەینەوە، ترسەکەی لێ دەرچێ، هەموو شتێك بە دڵی منە. وا تێبگەم ئەگەر ئەم قۆناغی چارەنووس نادیارییەم ببڕێتەوە و، بڕیاریان بدابایە مۆڵەتی چوونە حەوشەم وەکو ئەوانیتر پێ بدرێ، زۆر بە ئاسوودەیی دەمتوانی لێرە بەسەر ببەم. کاتێك کتێبێك دەخوێنمەوە، بۆ ماوەی چەندین کاتژمێر لە هەموو خەمەکانم دا دەبڕێم و بە تەواوەتی رازیم و، لە راستیدا وەك سەرخۆش وام. پاشان دەکەومە یادی نامەکەو ئەو دڵسۆزییانەی تێیدا بۆ منیان دەربڕیوە و هەست دەکەم ئەرك و پەیمانێکم هەیە کە دەبێ ناشاد بم. لەگەڵ خۆمدا بیر لەوە دەکەمەوە دەبێ ژنەکەم چۆن وێنای حاڵ و وەزعی من بکات بۆیە خەمباربوونی من رەنگدانەوەی خەمباربوونی ئەوە، وەك دەنگدانەوەی دەنگدانەوەیەك. جارێکیتر و جارێکی دیکەش لەوەیا کە ئەو هەندە دڵخۆش و سەرخۆشم لە پڕێکا تووشی ئازاری ویژدان دەبم. نەریتە باوەکە وایە کە مرۆڤ لە نێو زینداندا دەبێ رەنج و ئازار بکێشێ. دەبێ مردووەکان، لەبەر ئەوەی زیندووەکان بیریان دەکەن، زۆر ئەزێتی و نارەحەتی بکێشن.

## * هەینی/ دووی نیسان

کاتێك لە دەرەنجامی باروودۆخێکی نائاساییدا، مرۆڤ ئەم خووە نائاساییەی لە نێودا سەرهەڵدەدا کە، وا بە وردی و دیقەتێکی زۆرەوە بخوێنێتەوە، چی دوڕ و گەوهەرێکی پڕ بەها و بە نرخ لە نێو هەندێ کتێبی تا رادەیەك نەناسراودا هەیە دەدۆزێتەوە.

"ژێرار دی نێرڤال" نیوەی تەمەنی خۆی لە شێتخانەیەکدا بووراند. کتێبێکی نووسی، من بەشێکیم لە نێوان دوو فشاری دەروونی و بەشەکەی تریشیم لە کاتی فشارە دەروونییەکەی تردا خوێندەوە. لاپەڕە بەدوای لاپەڕە پڕێتی لە خەیاڵاتی پووچ و پێکەنیناوی. بابەتی سەرەکی چیرۆکەکەیش، هاتوچۆی بەردەوامی خۆیەتی لە نێوان ئەقڵ و شێتی دا. جارێکیان وا دێتە بەرچاو کە، شێتییەکەی بێ هیچ گومانێك روو لە باشبوونە و خەریکە ئەقڵی بۆ نێو مێشکی

دەگەڕێتەوە. ئەنجام ئەوە دەبێ شەقێکی تێهەڵدەدەن و لە نەخۆشخانەوە دەری دەنێن و ناچار دەبێ لە باتی ئەوەی خەیاڵاتە خۆشەکانی لە نێو شێتخانەیەکی گەرم و نەرمدا درێژە پێ بدات، بێ ماڵ و حاڵ، لە شەوە زستانییە ساردەکاندا بە گیرفانی بەتاڵ و بێ پاڵتۆ، بەرەڵڵاو سەرگەردانی نێو شەقامەکانی پاریس دەبێ. لە حەژمەتی شەکەتی خۆیدا، بە نیوەگیانی، لەگەڵ خۆی دەدوێ:

"ئەگەر ئەو شتەت بەدەست هێنایەوە کە خەڵکی پێی دەڵێن ئەقڵ، وا پێدەچێ لە دەستدانی، ئەوەندە نەبێتە جێی داخ و خەفەت"

لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا ئەویان مل لە نێو پەت و بە هەڵواسراوی دۆزییەوە. پێمخۆشە ئەوە بزانم ئەو بۆیە ملی خۆی کردە نێو پەت و خۆی خنکاند چونکە بە ڕێکەوت لەکاتی توندکردنی گرێی پەتەکە، بە دەوری ملی خۆی دا، ئەقڵ لەسەری نەمابوو، یان لەبەر ئەوەی بە ڕێکەوت لەو دەمیدا ئەقڵ گەڕابۆوە نێو سەری.

دنیای دەرەوەی ئێرە هەتا دێت و زیاتر بەلامەوە وەك شتێکی ناراستەقینە دێتە بەرچاو. هەندێجار تەنانەت فکر و خەیاڵم بۆ ئەوە دەچێ کە پێشتر دڵخۆش بوومە. مرۆڤ نە تەنیا لەبارەی داهاتووی خۆی، بگرە لەبارەی ڕابردوویش داڵغە و خەیاڵات پێکەوە دەنێ.

## * شەممە/ سێی نیسان

دەرزی و دەزووم وەرگرت. هەموو ئەمڕۆم تەرخان کرد بۆ پینەو پەڕۆکردنی کراس و شەرواڵ و گۆرەوییە نوێکانم. نیوەڕۆ "ئانخلیتۆ" خەسی تازەی بۆم هێنا کە لە نێو پارچە ڕۆژنامەیەکی کۆندا پێچرابۆوە. تێیدا بینیم پاشای بەلژیکا لە بەرلین بووە و ئیتالیا پەیماننامەیەکی لەگەڵ یۆگسلافیا مۆر کردووە. بەڵام هیچی لەبارەی جەنگی ئیسپانیا تێدا نەبوو. لەوەیا کە بینیم ئەم هەواڵانە کاریگەرییەکی چەند کەمیان بە سەرمەوە بە جێ هێشت و سەرنجەکانم هەمبەر بەو ڕووداوانەی لە دەرەوە ڕوو دەدەن چەندە کاڵ بۆتەنەوە، سەرم سوڕما و ترس دایگرتم. هێشتا مانگی دووەمیشم تەواو نەکردووە.

ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێك سەرنجمی بۆ لای خۆی ڕاکێشا ئەوەیە کە دوو پیاسەکەرەکەی ماوەی خەوی پاشنیوەڕۆی ئەوانی تر- بایرۆن و سیلدارەکە- هاوڕێیەکی نوێیان بۆ زیاد بووە. لۆقدرێژ و حۆل و پیسێکە ردێنی نەتاشیوە و چاویلکەیشی لە چاوە. چاکەتێکی چەرم و کورتی لە بەردایە کە پێیەوە دیارە لە بەریدا زۆر بچووکە. سەر لەبەری ڕواڵەتی بە شێوەیەکی

پێکەنیناوی و، بەو بێ قەڵافەتییەیەوە مرۆڤ زگی پێ دەسووتا. ناتوانم تەخمینی ئەوە بکەم چ ئیش و کارێك دەکات.

## * یەکشەممە/ چواری نیسان

ڕۆژێکی یەکجار ناخۆش. تەنیا ئەو چەند کاتژمێرەی دەمنووسی و خەوتبووم هەندێ ئاسوودە بووم. دڵم ئەوەندە ئازارم دەدا جاری وایە هەست دەکەم وا خەریکە دەخنکێم. بە درێژایی ڕۆژ لە نێو جۆرێك لە بێهۆشی و سستی لە نێو پێخەفدام.
بیرکردن لە هەستان دەمترسێنێ. لە "مالاگا" بەملاوە قەت ئەوها کڵۆڵ و بێچارە نەبوومە.

## * دووشەممە/ پێنجی نیسان

لە کاتی شەودا تووشی گورمتەیەکی لە ناکاوی دڵ بووم. ڕێك وەك ئەو ژان و گورمتەیەی کە لە ساڵی ١٩٣٢ تووشم هات. زۆر لەوە دەترسم یەکێکی تری بەدواوە بێ.

## ١٦

ئەو برگەیەی پەیوەندار بە گورمتەی دڵ، لە خۆمەوە دەرم هێنا. بیرێکی ئاڵۆز بوو بۆ خۆ بە نەخۆش دەرخستن، کە رۆژی یەکشەممە، کاتێ گێچی ئامێری پێوانی پاڵەپەستۆکە بۆ نزمترین خاڵەکەدا دابەزیبوو، بیرم لەوە کردبۆوە. پلانەکە ئاوها بوو کە بەرپرسان ناچار بکەم بمگوازنەوە بۆ نەخۆشخانەی زیندان. وام بیر دەکردەوە کە لە نەخۆشخانە زۆر ئاسانتر دەتوانم رێگایەك بۆ پەیوەندیکردن بە کونسوڵی بەریتانیا بدۆزمەوە. بەڵام ئەوەیشم دەزانی زۆر ئاستەمە بکرێ فێڵ لە پزیشکی زیندان بکەیت. بۆیە بە راستی دەبوایە نەخۆش بکەوم. بۆ ئەم مەبەستە بریارمدا مان لە خواردن بگرم. بەڵام بە شاراوەیی نەك بە ئاشکرا. واتە هەموو ژەمەخواردنەکانم بە ئاسایی وەربگرم و لە باتی ئەوەی بیانخۆم بیانرژێنمە ناو ئاودەستەکەوە تا ئەو هەندە لاواز و بێ هێز ببم ناچار بن پزیشکێك بهێننە دیار سەرم. ئەوسا دەمتوانی بە پزیشك بڵێم گرفتی دڵم هەیە. ئەمە ئاڵۆزترین جۆری نەخۆشییە و زەحمەتە دەربکەوێ ئایا بە راستی نەخۆشییە یان بە ئانقەست خۆ نەخۆشخستنە. دەشمزانی دوای دە- پانزە رۆژ خۆ برسیکردن دڵ سست و بێ هێز دەبێت و لێدانی دڵیش نارێك دەبێت. لەوێوە کە دەبوایە هەمیشە ئاگاداری ئەوە بم نەوەکا یادداشتەکانم ببەن و بیخوێننەوە دەبوا نووسینەکانم لەگەڵ جۆری خۆ نەخۆشخستنەکەم یەك

بگرێتەوە بۆیە لە بری "بە رۆژوو بوون یان خۆبرسیکردن" نووسیم "گورمتەی دڵ" لەم رووەوە یادداشتەکانم ریتمێکی رۆمانتیکی و سۆزدارییان بە خۆوە گرت و چی وای نەمابوو دڵی کارمەندە ئیسپانیاییەکەی بواری سانسۆر لە حەژمەتاندا لە لێدان بوەستێ.

بیرۆکەیەکی منداڵانە بوو بەڵام رێگە چارەی ترم نەبوو. ئەو بەشانەی کە بە پیتی ورد و تۆخ چاپکراوە یان لە نووسینە رەفز و کۆددارەکانەوە وەرگیراون یان لە پاشکۆکانی دواترە.

لە رۆژی دووشەممە، پێنجی نیسان، رۆژوو گرتنەکە، یان مانگرتنەکەم لە خواردن دەست پێکرد.

## * دووشەممە/ پێنجی نیسان (شەو)

وەرگێردراوە ئیسپانیاییەکەی کتێبی "سەفەری ئیحساساتی"ی ستێرنم وەرگرت.

"- ئەگەر شتێك لەمەیاندا بەرهەم نەیەت- لە یەکێکی تر دێتە بەرهەم- گرنگ نییە، تاقیکردنەوە و ئەزموونێکە لەسەر سرووشتی ئادەمیزاد- پاداشتی زەحمەتکێشانەکانم وەردەگرمەوە- هەر ئەمە بەسە- چێژی ئەزموونکردن، هەست و هزرە مەعنەوییەکانی واگا هێناوەتەوە و، بیرو هزرە مادییەکانی خەواندووە"

**بەڵام هزرە مادییەکان نەدەخەوێندران، برسێتی بە بێداریی دەهێشتنەوە. لە شوێنێکدا خوێندبوومەوە کە لە دوای سێ- چوار رۆژ نەخواردن، حەزی خواردن لە نێو مرۆڤدا نامێنێ. ئەم بۆچوونە دڵنەوایی دەدامەوە.**

## * سێ شەممە/ شەشی نیسان

رۆژی دووەمی گورمتەی دڵ. دوای نیوەرۆ سەرتاشەکە هاتە ژوورەکەمەوە و بەندیوانەکەش بە درێژایی ئەو ماوەیەی سەرتاش خەریکی ئیشی خۆی بوو، وەك جارانی پێشوو، لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشتبوو و پڕ بێژیی دەکرد. لە دوو توێی ئەو وڵامانەی بۆ ئەو پرسیارانەی بە ترس و پارێزەوە دەمکردن گەیشتم کە مەدرید هێشتا نەرووخاوە. بە بۆچوونی بەندیوانەکە جەنگ بەم زووانە کۆتایی پێ نایێ. من و سەرتاش و بەندیوانەکە هاوڕاین لەوەی جەنگ لە بنەڕەتدا شتێکی بێ مەعنایە.

**ئانەکە هەروا بە ساغی ئاچێتە کونی ئاودەستەکەوە، دەبێ ورد و پارچە پارچەی بکەم و سیفونەکەش دوو سێ جار راکێشم تا هەموو بچێتە خوارێ. ئاوها کە خەریکی پارچەکردنی**

**نانەکەم، بۆنی کێلگەی گەنم دەکەم کە لە ژێر تیشکی هەتاودا ڤیتامین وەردەگرێ و دەپشکوێ. شۆرباکە باشترە، خێرا دەڕژێتە ناو ئاودەستەکە و گرفتی نییە.**

## * چوارشەممە/ حەوتی نیسان

کتێبەکەی "هەشتا رۆژ بەدەوری دنیادا"ی ژۆل ڤێرن- م وەرگرت. بیرم کردەوە خوێندنەوەی نابێ بێتام بێ بەڵام هیچ سەرگەرمی نەکردم. سووچەکەی یان لە ئەستۆی ڤێرنە یان لە ئەستۆی دڵمە کە بەردەوام نیگەرانم دەکات. دەبێ هەمموو فکر و بیرکردنەوەم لای دڵم بێ و هیچ نـاتوانم بۆ دە خولەکی بەدوای یەکیش کاتی خوێندنەوە یان نووسیندا لێی غافڵ و بێ ناگابم.

**رۆژ- خەوبینین بە خۆراك دەستی پێکرد. بە هەمان ئەو چێژە ورووژێنەرەی، کـە قوتابییـە منداڵەکانی قوتابخانەکان خەون بە ئەستێرەکانی سینەماوە دەبینن، منیش خـەونی شـفتە و پەتاتە و پەنیر دەبینم. بیر لەوە دەکەمەوە ئەگەر بهاتبا و خواردنیش وەکو تاشقایەتی، ئـەو هەندە بە یاساغە کۆمەڵایەتییەکانەوە سنووردارییی و ئابلۆقەی بخرابایە سەر، دەروونناسەکان دەبوایە واز لە هەموو ئیش و کارەکانیان بهێنن و تەنیا خەریکی گرێ دەروونییەکانی برسێتیی سەرکوتکراو و، تێکچوونە دەروونییەکانی تینوێتی بن. ئەگەر کەسێك خـەونی بـە ئـامێری مۆسیقایی ڤیۆلۆنەوە بدیتبایە واتاکەی ئەوە بوو کە حەزە شاراوەکانی ئارەزووی خواردنی ڕانە مەرێك دەکات.**

## * پێنج شەممە/ هەشتی نیسان

نهێنییەکم دۆزیوەتەوە.

پاشـنیوەڕۆی ئـەمڕۆ، ئەڵمانییـە قـژ بۆرەکـە، وتووێـژێکی دیکـەی لەگـەڵ "کـارلۆس"ە نادیارەکەدا هەبوو. گوتی "کارلۆس" دەبێ نامەیەك بۆ کونسولی وڵاتەکـەی خـۆی بنووسـێ و نامەکە لەسـەر گۆشـەی لای راسـتەی پەنجەرەکە دا بنێ و ئەوسـا ئـەویش، واتـە ئەڵمانییەکـە، نامەکە هەڵدەگرێ و بۆ کونسولەکەی دەنێرێ. نەمدەزانی "کارلۆس" بـە چـی فـرت و فێڵێـك دەیویـست ئەم کارە بکات. دواتر لە کاتی خەوی پاشنیوەڕۆ، کابرای باڵابەرزی چاویلکە لە چاوم بینی کە، بێ هیچ سڵەمینەوەیەك لە دەوروبەری پەنجەرەکەوە هاتوچۆیەتی و زۆر بەنەزانی لـەو ناوە خۆی مەلاس داوە. کەواتە، "کارلۆس"ی نادیار هەمان کابرا پیاسـەکەرەکەی ماوەی دوای نانخواردنی نیوەڕۆیە.

دواتر، له کاتی عەسردا، ئەڵمانییەکە چووە ئەویّ و نامەکەی لەسەر پەنجەرەکە هەڵگرت. ئەمە هەموو سەرقاڵیی ئەمڕۆکەم بوو. ئازاری دڵم ئەوەندە بێتاقەتم دەکات تەنانەت لە کتێب خوێندنەوەش کەوتووم. ئەم "فینیس فراگ"ەیش بە نەفرەت بێ بەو هەموو بێباکی و خەمساردییەیەوە مرۆڤ پەست دەکات.

وامدەزانی حەزی خواردن لەدوای چوار رۆژ نەخواردن، لە دڵی مرۆڤدا نامێنێ. وا نییە هیچ، بگرە پێچەوانەکەی راستە.

## * هەینی/ نۆی نیسان

ئەمڕۆ دوو مانگ بەسەر ئەو رۆژەدا تێدەپەڕێ کە، سەروبیچمی "بۆلین" بە دەمانچەکەی دەستییەوە خۆی کرد بە ماڵی "سرپیتەر"

دواجار لە دەستی "فینیس فاگ" نەجاتم بوو و "شەڕ و ئاشتی" ی تۆلستۆیم وەرگرت. پیاسەکەرێکی نوێی ماوەی خەوتنی دوای نیوەڕۆ، لە حەوشەکە دەرکەوتووە. گوندییەکی ئەندەلۆسیی وردیلە بە ریشێکی رەش و زبر و دوو چاوی شینی کەمێك ئەبلەق و میهرەبان. هاوهەنگاوی "بایرۆن" و "سیلدارەکە" بوو. "کارلۆس" بە تەنیایی دەوراندۆری حەوشەکە پیاسەی دەکرد. دڵم باشتر نەبووە. ئەمڕۆ رۆژی شەشەمەیە. لەوساوە کە نەخۆش کەوتووم تێپەڕینی کات بە شێوەیەکی ترسناك هێواش بۆتەوە. دوو- سێ هێندەی پێشتر هێواشتر بۆتەوە. کات سەرەڕای ئەوەی دەشەلێ لە رۆیشتندا، کێشێکی قورسی لە قورقوشمیشی بە دوای خۆیدا رادەکێشێ. زیاتر لەبەر ئەوەیە کە بخوێنمەوە و بنووسم و هەستەکانم کۆ بکەمەوە سەر یەك- بە کورتییەکەی بە جۆرێك تێپەڕینی کات لە بیر بکەم. ئەمجۆرە بیرکردنەوەیەم لە بارەی کات، هێدی هێدی دەبێتە مۆریانە لە نێو مێشکمدا. ئەوسا کە هێشتا، تازە هێندرا بوومە ئەم زیندانە، هەوڵی ئەوەم دەدا لە بۆسەی میلەکانی کاتژمێرەکەمدا بحەوم تا گوزەری کات و زەمەن بە وردی هەست پێ بکەم. ئێستا دەزانم کە یاسایەکی نەگۆڕ زاڵە بەسەر هەمووشتێکدا. زیادبوونی ئاگایی لە زەمەن و کات، تێپەڕینی هێواشتر دەکات، تەواو ئاگابوون لە زەمەن و کات، هەر بە جارێ رایدەگرێ. تەنیا کە کاتی مەرگدایە زەمەنی ئێستا دەبێتە راستەقینە. زەمەن وەك بەستەڵەك دەمەیێ. کەسێك کە بتوانێ "زەمەنی پەتی" تاقی بکاتەوە، هیچبوون تاقی دەکاتەوە.

**دەبوایە زۆر ئاگادار بم بە فێڵەکەم تا لە بارەی خواردنەکانەوە هیچ نەزانن. نەك هەر بەشە خواردنی خۆم فڕێ دەدا، بگرە ناچار بووم خواردن لە حانووتەکەش بکڕم و وردە وردە لە نێویان ببەم. دواجار، تەواو بوونی پارەکەم، بیانوویەکی باش بوو بۆ رزگار بوونم لە دەست شتکڕین و فڕێدانیان.**

## * شەممە/ دەی نیسان

ئەم قسە پیریژنانەیەی کە دەڵێت ناتوانن کتێبە جەنگییەکان بخوێننەوە چونکە لە رادەبەدەر قەڵس و دڵتەنگیان دەکات، بەلای منەوە هەمیشە مایەی پێکەنین و شتێکی بێمانا بووە. کە چی ئێستا هەندێ لە بەشەکانی "جەنگ و ئاشتی" بە رادەیەك تووشی دڵەکوتێم دەکات ناچار دەبم واز لە خوێندنەوە بهێنم. کاتێ ئەو بەشەم خوێندەوە کە باس لە گوللەبارانکردنی زیندانییەکان لە دوای گرتنی مۆسکۆ بە دەستی ناپلیۆن دەکات ناچاری کردم بڕشێمەوە. بەڵام ئەوەی رشامەوە تەنیا زەرداوێکی سەوز رەنگ بوو. **بەردەوام لێدانی دڵم ئەندازە دەگرت و بە بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێی ئەو کاتەم دەکرد نارێکی بکەوێتە لێدانەکەوە. شتگەلێکی ئاوها لە ئارادا نییە. ئازار و گورمتەی بەدوای یەکی دڵ و گێژبوون و کەمتینیی جەستەیی- لەدوای شەش رۆژ هیچ نەخواردن، شتێکی تری بێجگە لەمانە نەبوو. حەزی خواردن لێم جیانەدەبۆوە، بگرە هەر زیاتریشی لێ دەهات. لە بیرمە شتگەلێکم خوێندبۆوە کە وا چۆن مرۆڤی برسی هێواش هێواش رووبەڕووی هەستێکی خۆش و سووکبوونێکی لە رادەبەدەر دەبێتەوە. هەموو ئەوانە قسەی حەلەق و بەڵەق بوون.**

## * یەکشەممە/ یازدەی نیسان

لەبەر ئەوەی چیدی توانای خوێندنەوەی "تۆلستۆی" خوێنمژم نییە، دەستم داوەتە چێکردنی خشتەی وشە یەکتربڕەکان. زۆر زیاتر سەرگەرمم دەکات، بەڵام خودی چێکردنەکەی لە هەڵهێنان و پرکردنەوەی خانەکانی زەحمەتترە. یەکێك لە وشەکان "Eumene" دەرهاتووە. بێشك واتایەك دەبەخشێ، بەڵام چی؟... هێشتا مێشکم بە دەست وشەی Eumene یەوە خەریك بوو، بەڕێوەبەری زیندان ناردی بەدوامدا. گوتی هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی دەدات "هەر چی زووتر بڕیارێکم لە بارەوە بدرێ". گوتی کەمتین و هەڵبزرکاو دیارم، ئایا نەخۆشم؟ وڵامم دایەوە و گوتم پێشینەی نەخۆشی دڵم هەیە بەڵام شتێکی وانییە، باشتر دەبم. گوتی هەوڵ دەدا رێگەم

پێ بدرێ بمبەنە پیاسە و هەواخۆری. گوتم بە رای من ئەمە باشترین چارەسەرە. بەڕێوبەری زیندانیش رەنگ و روو هەڵبزرکاو و سست و بێ هێز دیار بوو، پرسیارم لێ کرد نەشتەرگەرییەکەی چۆن بووە، گوتی هێشتا زۆر لاوازە و باشترین کارێك بتوانێ بیکا ئەوەیە کە ئیزنێکی پزیشکی وەربگرێ و، ماوەی پشوودانەکەی دوای نەشتەرگەری لە نێو ژوورێکی تاکەکەسیدا بمێنێتەوە. هەموویان لە پرمەی پێکەنینیان دا. کاتێ گەڕامەوە نێو ژوورەکەم هەستم بە دڵخۆشییەکی زۆر دەکرد. پاشان رێورەسمی ئایینی دەستی پێکرد، کە بە گووتنەوەی کۆرس درێژەی پێ دەدرا. گۆرانی گوتنەکەیان خۆشییەکی زۆری پێ دەبەخشیم- بێجگە لە "یالا- نی- لا" کە هیچ پەیوەندییەکی بە مۆزیکەوە نییە، بگرە شیوەن و رۆڕۆیەکی ئاوازدارە، یەکەمین دەنگی مۆسیقا بوو کە لەم ماوەیەدا گوێبیستی دەبووم.

**سەرەرای تێپەڕبوونی هەفتەیەك بەسەر نەخواردنمدا، دڵم بەو پەڕی بێعارییەوە، هەشتا تا هەشتا و هەشتی لێ دەدا.**

## * دووشەممە/ دوانزەی نیسان

رۆژی رووداني یەکێك لە رووداوە گەورە و هەژێنەرەکانی دنیا...

سەرەتا ردێنیان تاشیم. بە درێژایی کردارەکە، بەندیوانێکی نوێ سەرپەرشتی کارەکانی دەکرد- گەنجێك یونیفۆرمی فالانژیستەکانی لەبەردا بوو، چاویلکەیەکی ژێر پیاڵەیشی لە چاودا بوو، دوێنێ ئەوم بینیبوو دەتگوت قەلەموونێکی نێرەیە، بەرچیلە و ژێر چەناگەی پڕاو شۆڕ کردبۆوە و لە نێو حەوشەدا دەسووڕایەوە و خۆی بەسەر یەك- دوو دێهاتییەکەدا گیف دەکردەوە. کاتێ تاشینی ردێنم تەواو بوو، لە ژوورەکەمدا مایەوە و درێژەمان بە ئاخاوتنەکانمان دا. پاشان "دۆن رامۆن" و ئەمینداری کتێبخانەش هاتنە ژووری و وەکو کۆمەڵە هاوڕێیەکمان لێ هات کە لە چایخانەیەکی ئاساییدا دانیشتبن. گەنجەکەی چاویلکەی ژێر پیاڵەیی لە چاودا بوو، جاربەجارێ، خۆی دەنواند و لوولەی دەمانچەکەی بە ژێر لووتم دا دەخشاند و دەیگوت دواجار، درەنگ یان زوو، هەر ئیعدام دەکرێم. "دۆن رامۆن" کە لە پشتەوەی ئەودا لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشتبوو، بە هێما و ئیماژە تێیدەگەیاندم قسەکانی گەنجەکە بە دڵ نەگرم. تەنانەت گەنجەکە، خۆنواندنەکانی گەیشتە ئەوەی کە بە پەنجەیەکی، وەك لاساییکردنەوەی تەقەکردن بە دەمانچە، گوللەیەکی تەقاندە نێو چاوانمەوە. گوتم "ئەگەر تۆ لە شوێنی من بوایتایە و من بەندیوان بوومایە، ئەوسا دەتزانی ئەم گاڵتە کردنانەت چەندە بێتامە". بە

سەرسوڕمانێکەوە گوتی "وایە" و، لەو بەدوا هەندێ هەڵسوکەوتەکانی خۆی باشتر کرد. جوێنی بە "سوور"ەکان دەداو، دەیگوت ئەوان زیندانییەکانیان ئەشکەنجە دەدەن، چاوەکانیان دەردێنن و... گوتم سەر لەبەری ئەو قسانە درۆیە، منیش وامدەزانی لایەنی بەرامبەرم ئاوهایە. مرۆڤ هەمیشە خراپترین تۆمەتەکان بۆ دوژمنەکانی هەڵدەبەستێ. گوتی وایە، ئەمەیش راستە. پاشان بە تەوسێکەوە درێژەی دایێ: "لێرە، لە نێو زینداندا، تا ئەو کاتەی ئیعدام دەکرێن، وکو مرۆڤی ماقووڵ هەڵسوکەوتتان لەگەڵدا دەکرێ، بەڵام لە منی وەرگرە ئەگەر یەکێکتان لە بەرەکانی شەڕ، بکەونە دەست "سور"ەکانەوە، ئیدی ئەوان لەم گاڵتانە نازانن بکەن".

لێم پرسی، ئایا وەکو کاسولیکێك، لەگەڵ ئەشکەنجەدانی مرۆڤەکان دایە؟

بە زەردەخەنەیەکی شەرمنانەوە گوتی "دەی.. نا". ماوەیەك ئاوها درێژەمان بە ئاخاوتنەکانمان دا. لە نێوبڕەکانی قسەکانماندا، لە بارەی ئینگلتەرا، داروین و، ئەوەی کە ئاخیرەکەی مرۆڤ دەچێتە سەر مانگ یان نا، باس و خواستمان کرد. ئەم سەردانەیان نزیکەی دوو کاتژمێری کێشا. نەمزانی مەبەست لێی چی بوو. ئەوجا کتێبدارە پڕ لە رازەکە، حیکایەتی خۆی بۆ گێڕامەوە. هیچ _ئاوها کە من مەزندەم کردبوو_ مشتەکوڵەبازێکی پیشەیی نەبووە، بگرە خاوەنی ئاژانسێکی ریکلام بووە لە پاریس. ماوەیەکی کەم بەر لە دەستپێکردنی شەڕی نێوخۆیی، ئیفلاسی کردووە و هەڵاتۆتە ئیسپانیا. خاوەن قەرزەکانی شوێن پێیان هەڵگرتبوو، فەرەنسا داوای لە ئیسپانیا کردبوو دەستگیری بکات و رادەستی ئەوانی بکاتەوە. هەفتەیەك بەر لە شۆڕشەکە، لە "سیڤیل" دەستگیر کرابوو. کتێبدارەکە- لەمەو دوا بە "هێنری" ناوی دەبەین- حوکم و بڕیاری رادەستکردنەوەی خۆی تەمیز کردبۆوە. پاشان، شەڕی نێوخۆیی هەڵگیرسابوو، هەروایش کە زۆر بە راشکاوی و دەنگی بەرز دەیگوت بارودۆخی نێو زیندان "دووچاری ئاڵوگۆڕ" هاتبوو، ئێستا گەورەترین ئارەزووی "هێنری" ئەوە بوو رادەستی بەرپرسانی وڵاتەکەی خۆی بکرێتەوە. بە تایبەت کە، خاوەنی قەرزەکانی، کەوتبوونە ژێر کاریگەری بەسەرهاتە خەمناکەکەی و رایانگەیاندبوو کە ئامادەن لەگەڵی بگەنە رێککەوتنێك. کونسوڵی فەرەنسا لە "سیڤیل" هەموو کۆششی خۆی کردبوو مەڕە ونبووەکە، بگەڕێنێتەوە وڵاتەکەی خۆی، کە چی ئێستا بەرپرسانی شۆڕش رێگەی گەڕانەوەیان پێ نەدەدا. بە لای ئەوانەوە فەرەنسایی "سوور"ەو جێگەی "سوور"یش لە ناو حەوشەی زیندانداییە. پێکەنین لێرەدایە کە هێنری بە گوتەی خۆی، ئەندامی "خاچی ئاگر"ی رێکخراوی فاشیستیی

"سەرهەنگ رۆکە" "هێنری" بەسەر هاتەکەی بە پاکییەکی بریندارکەر دەگێڕایەوە و ئێمە، من، دۆن رامۆن، گەنجە چاویلکە لە چاوەکە و هێنری هەر پێدەکەنین. هەر دوو بەندیوانەکە، بێشك سیر تا پیازی بەسەرهاتەکەیان دەزانی، چونکە بە بەردەوام، بۆ هەر رستەیەکی سەریان دەلەقاند، وەك ئەوەی گوێ بۆ نوکتەیەکی کۆن و سواو رادێرن. کاتێك گێڕانەوەی بەسەر هاتەکەی تەواو کرد، فالانژیستەکە، رایگەیاند کە وا هێنریش درەنگ یان زوو، ئیعدام دەکرێ. پاشان دانیشتنە چایخانەییەکەمان پەرتەی لێ کرد. کاتێ میوانەکانم تا بەردەرگا بەرێ دەکرد "دۆن رامۆن" بە ئەنگوستی، ئیماژەیەکی پێ دام و رێگەی دا، تەماشایەکی لای دەرەوەی دەرگای ژوورەکەم بکەم. پلاکاردێکی نوێیان لەسەر دەرگای ژوورەکەم دابوو. ناوی لەسەر بوو، بەڵام "زگورت" و "مافی سەردانیکردنی نییە"ی لەسەر هەڵگیرا بوو، کە واتە ئەمە بوو کلیلی مەتەڵەکە. لە ژێر سایەی لوتف و میهرەبانی بەڕیوەبەری زیندان، زیندانیی تاکەکەسیم کۆتایی پێ هاتبوو. دەورویەری کاتژمێر حەوت فالانژیستەکە گەڕایەوە و بە فەرمی پێی راگەیاندم لە سبەی بە دواوە رێگام پێ دەدرێ، کە لە ماوەی خەوی دوای نیوەڕۆی زیندانییەکانی تر، لە کاتژمێر یەك تا سێ، بچمە ناو حەوشە و پیاسە بکەم. پرسیارم کرد ئایا ئێستا دەتوانم نامەیەك بۆ کونسوڵی وڵاتەکەم بنووسم. گوتی "بەڵێ" بەڵام نامەکان دەبێ بە قەڵەمپاندان و مەرەکەب بنووسرێن و منیش هەتا سبەی ناتوانم قەڵەم و مەرەکەب بکڕم چونکە حانووتی زیندان داخراوە.

دۆزیمەوە، دۆزیمەوە!!

**ئێستا ئیدی دەمتوانی مانگرتنە شاراوەکەم کۆتایی پێ بهێنم و خواردن بخۆم چونکە ئامانجی خۆم، بێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی بە هەوڵ و کۆششەکانمەوە هەبێ، پێکابوو. بەڵام بۆ موکومکاریی بڕیارمدا تا ئەو کاتەی بە دڵنیاییەوە نامەکە بۆ کونسوڵ رەوانە دەکرێ، دان بە خۆمدا بگرم.**

## * دووشەممە/ شەو

ساتێك بەر لە ئێستا - کاتژمێردە - Jefe یەك کە پێشتر هیچ نەمبینیبوو، پیاوێکی داکەوتووی قژماش و برنجی، گوتی بڕیارێك لە بەرپرسانی سەربازیی گەیشتۆتە نووسینگەی زیندان، کە لە سبەینێ بەدواوە، رێگەم پێ بدرێ لەگەڵ زیندانییەکانیتر بچمە حەوشە. واتە بە درێژایی رۆژ. دەها باشتر!

## * سێشەممە، سیانزەی نیسان

کاتژمێر شەش لەخەو هەستام و بەو پەڕی بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێی ئەوساتە بووم کە، دواجار لەم کونە بمبەنە دەرەوە. وەك ڕۆژانی ئاسایی، کاتژمێر هەشت هەموو زیندانییەکان لە حەوشە بە دیارکەوتن- کە چی دەرگای ژووری منیان نەکردەوە. کەوتمە کوتانی دەرگا- بێ سوود بوو. دواجار، کاتی خواردنی بەیانی، بەندیوانەکە بۆی روون کردمەوە ئێشکگری ئەمڕۆ Jefe ییەکی دیکەیە- لە تۆڵەی ئەو ڕۆژەی سیفونی ئاودەستەکەم دڵۆپەی کردبوو- گوتوویەتی لە بارەی منەوە هیچ بڕیارێکی بۆ ناردنە حەوشە پێ نەگەیشتووە. قەڵەم و مەرەکەبم ویست- خۆیان لەمەیشیاندا دزییەوە "چونکە Jefe بڕیاری پێ نەبووە"، داوام کرد لەگەڵ Jefe قسە بکەم. وڵامی نارد کە زۆر سەرقاڵە. لە حەژمەتی توڕەییمدا خەریك بوو شێت دەبووم.

**... بیەم کردەوە باش بوو مانگرتنەکەم نەشکاند بوو. ئەمڕۆش ڕۆژی نۆیەمە. لێدانی دڵیشم- دواجار- لە نێوان شەست و سەد و پێنج لە هەڵکشان و داکشاندایە و ئەوپەڕی، دوو- سێ- ڕۆژی تری پێویستە ناچار بن بمگوازنەوە نەخۆشخانە.**

## * سێشەممە/ سەرەتای شەو

کاتژمێر دوانزە، لە ناکاوێکدا "ناخلیتۆ" پەیامێکی لە لایەن Jefe ییەوە هێنا و گوتی، بەرپرسانی سەربازیی لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە جەختیان کردۆتەوە کە، بێ هیچ ئەملاو ئەولایەك لە ماوەی نێوان کاتژمێر یەك تا سێ بمبەنە دەرێ، ناو حەوشە...

هیچ بڕیارێکیش سەبارەت بەوەی قەڵەم و مەرەکەبم پێ بدرێ، بەو نەگەیشتووە. خولێکی دیکەی چاوەڕوانی هەتا کاتژمێر یەك دەستی پێ کردەوە. دواجار، فیکە لێ دەدرێ، زیندانییەکانی نێو حەوشە، چوار چوار لە پاڵ یەکدا ڕیز دەبن. بۆ ئەوەی بگەڕێندرێنەوە نێو ژوورەکانیان. حەوشە چۆڵە. دەبێ ئەو پەڕی لە دوای دە خولەك، "بایرۆن" و "سیلدارەکە" و "کارلۆس" و کابرا تازەکە دەرکەون و پاشان، سەرەنجام دەرگای ژوورەکەم لێ دەکرێتەوە...

کاتژمێر چارەگێك لەیەك تێدەپەڕێ، دەبێتە یەك و نیو، چارەگێکی دەمێنێ بۆ دوو، هیچ دەنگێك نییە- ئەوانی دیکەش دیار نین بێنە حەوشەوە- چیدی لەوە زیاتر ناتوانم پێش بە خۆم بگرم

و به هەموو هێز و تینمەوە دەست دەکەمەوە بە کوتانی دەرگا- بە کاسە تەنەکەکەمەوە لـە دەرگـا دەدەم و ئەو هەندە بـە پێلاقـەیش لـە دەرگـا دەدەم هـەر دوو قاچـم ژان و ئازاریـان تـێ دەکـەوێ. هەرایەکی سەیرم ناوەتەوە. دوو خولەك دواتر دەرگا دەکرێتەوە و "ئـانخلیتۆ" و "Jefe" و "کاپیتـان بلای" وە ژووریٰ دەکەون. هەر سێکیان پێکەوە گیڤ و هەرەشـەم لـێ دەکـەن. "ئـانخلیتۆ" زیـاتر لەوانی تر. (لەم چەند رۆژەی دواییدا هیچ بەخشیشێکی وەرنەگرتووە و ئاگای لەوە هەیە تەنیا بیست پێستام بۆ ماوەتەوە" بۆیانم روون کردەوە بۆ ئەم هەرایەم ناوەتـەوە." کاپیتـان بـلای" دەشـیرێنی و دەڵێ هەر وەختێك حەزی لێ بێ لێ دەگەرێ بچمە دەرێ و ئەگەریش حەزی لێ نـەبێ هـیچ کاتێـك لێ ناگەرێ بچمە دەرێ. ئەگەر یەکجاری دیکەش ئەو گەمەیە دووبارە بکەمەوە بە مست و پێلاقـە دەکەوێتە ویزەم و وەکو کرمێك لە بن پێی خۆی دا دەمپلیقێنێتەوە. هەموو ئەوانـە لەبـەر دەروازەی دەرگای کـراوەدا روودەدا. بـایرۆن، سـیلدارەکە و کـابرا تازەکـە وەك دیـارە تـازە لـە ژوورەکانیـان هێنراونەتە دەرێ، لە نێو رێرەوەکەدا وێستاون و گوێیـان لێ گرتووین. پاشان هـەر چـوارمانیان بـردە حەوشەوە. هەست بە گەرمایی هەتاو دەکەم بەسـەر پێستی دەم و چاوم دا، سییەکانم پـر دەکـەم لـە هەواو و پاشان لە پرێکا هەمـوو شت بە بەرچاومەوە خۆڵەمێشی، شین و مۆر و رەش هەڵدەگـەرێن و خۆم دەبینم لەسەر زەوی دانیشتووم. سێ کەسەکەی دی هەڵمدەستێننەوە. "بایرۆن" و کابرا تازەکـە بن هەنگڵم دەگرن و، پاش چەند خولەکێك سەر لەنوێ حاڵم باش دەبێت. پێکەوە لە بەرامبەر ژووری "٣٦" رادەوستین. سەرەتا بێجگە لـە هەناسـە هەڵکێشـان لـە هەوایـەکی ئـازاد دا نـاتوانم هـیچ کارێکیتر بکەم. جارێکی دیکە و بۆ یەکەمین جار هەوای پـاك و راسـتەقینە هەڵدەمـژم_ لـە بـری ئاوێتەیەکی قورسی غازەکان، کە پێکهاتەیەکە لە بۆنی پێخەفێك کە، قـەت هـەوا لێـی نـەداوە و، بۆنی خواردنی مایەوە و، بۆگەنیی ئەو ئاودەستەی دوو مانگە لەگەڵی ژیـان بەسـەر دەبـەم. پاشـان دەستمان کرد بە قـسەکردن. دیارە یەکەم پرسیارم بۆ ئەوان ئەوەبوو کە، حوکمەکـەیان چـیە؟ بـایرۆن دەڵێ " la muerte _ مەرگ" و دەمـی بـە پێکـەنین دەکرێتـەوە. سـیلدارەکە دەڵـێ "la muerte " سیاسـەتمەدارێکی بە ناوبانگی کۆماریخوازە و، بایرۆنیش پێشتر سـکرتێری بـووە. هـەردووکیان سـێ مانگـە چـاوەرێی ئیعـدامکردنیان دەکـەن. سـێیەمی دەڵـێ "la muerte " وردیلـە گوندییـەکی ئەندەلوسییە، پارتیزانێکە لە بەرەی شەری ئەلمێریا بە دیل گیراوە. "کارلۆس" لـەوێ نـەبوو، دیـارە نەخۆشە. "کارلۆس" ئیتاڵیاییـە، ئەفسـەرێکە لـە هێـزە یارمەتیـدەرەکانی ئیتاڵیـا کـە لـە ژێـر فەرماندەیی "فرانکۆ"دا دەجەنگن. پێدەچێ دەستگیرکردنەکەی بە شێوەیەك پەیوەندی بـە هـاورێی ئەڵمانییەکەیەوە هەبێ.

ناوی پارتیزانەکە "نیکۆلاس"ە. دە رۆژ پێشتر بە دیل گیراوە. سێ رۆژ پێشتریش حوکم دراوە. ئەویش وەکو هەموو دیلە جەنگییەکان تۆمەتبارە بە بەشداریکردن لە راپەڕینی چەکداری " rebellion military" "نیکۆلاس" ناوها کە لە نێو حەوشەکەدا هەوراز ونشێو دەبووینەوە، رووداوی دادگاییکردنەکەی لە دادگای سەربازیی "سیڤیل" بۆمان دەگێڕایەوە. هەموو داداگاییکردنەکە بەسەر یەکەوە تەنیا سێ خولەکی کێشابوو. سەرۆکی دادگا، ناوی زیندانی و شوێنی لە دایکبوونی و ناوی ئەو شوێنەی لێی بە دیل گیرا بوو خوێندبۆوە. داواکاری گشتی داوای سزای مەرگی بۆ کردبوو. هەروەها داواکاری گشتی درێژەی بە قسەکانی خۆی دابوو : " تەنیا داخباری ئەوەم کە ناتوانم ئەم rijecillo_ جووجەڵە سوورە چاو رەشە_ بەر لە ئیعدامکردنی ، لەنێو قەفەزێکدا رەوانەی جنێف بکەم تاوەکو نیشانی کۆمکاری نێونەتەوەیی بدەم کە ئەم بە گوتەی خۆیان خەباتگێڕانی رێگای دیموکراسی و یەکسانی چەندە بوونەوەری شایانی بە زەیی پیاهاتنەوەن". پاشان بردوبوویانە دەرێ. "نیکۆلاس" هەندێ خەسی چنگ کەوتبوو، بەدەم گێڕانەوەی چیرۆکەکەیدا ناوە ناوە قەپێکی لە خاسەکەش دەدا. یەکەو پەلکە خاسێکی پێشکەشمان کرد. من _ لەبەر دڵم_ وەرمنەگرت. دووانەکەی دیکە بە تامەزرۆییەوە لێیان وەرگرت. "نیکۆلاس" پرسی:" پێتان وایە ئیعدامم دەکەن؟" کۆماریخوازەکان سەرەرای هەمو سووکایەتیپێکردنی زیندانییە کۆنترەکان بۆ کیلۆمەتر سفرەکان گوتیان:" paciencia" کوڕی باش. مرۆڤ نابێ چاوەڕوانی زۆری هەبێ. سێ مانگە ئێمە دالمان بەخۆماندا گرتووە". بەڵام دوایی، هەرسێکمان کەوتینە دڵدانەوەی. زۆر دەترسا، تەنانەت، زیاتر لە ئێمە, چونکە هێشتا مەرەکەبی حوکمی ئیعدامەکەی وشك نەبوبۆوە. چەندەها چیرۆك و حیکایەتمان بۆ هۆنییەوە لەبارەی ئەوەی کە چۆن زۆرێك لە حوکمەکانی ئیعدام تەنیا بۆ سوعبەت و گاڵتەوە دەردەکرێن, تەنیا بۆ ئەوەی خەڵکێکی پێ بترسێنن بەڵام لە راستیدا کەس ئیعدام ناکەن. ئێمە هەرسێکمان کە بە سەریەکەوە هەشت مانگ لە زینداندا بوینە و هێشتا نەمردووینە. بەڵگەی زیندووی ئەم راستییەین. تەنیا دڵخۆشتر بوو لەوەی باوەڕ بە قسەکانمان بکات و دواجار، ئەوە ئێمە بووین کە قسەکانی خۆمان باوەڕ کرد. دڵمان خۆش بوو، بایرۆن پێشنیاری کرد ئاگاداریەك لە مەودای نێوان کاتژمێر یەك و سێ، لە حەوشە هەڵواسن. "هاتنە ژووری هەموو کەسێك بێجگە لەوانەی حوکمی ئیعدامیان هەیە قەدەغەیە". پێشنیارم کرد کتێبێك وەك راسپاردە بدەمە نیکۆلاس، بەڵام گوتی خوێندەواری نییە. بەناو لەپی دەستە هەڵقلیشاوە دێهاتییەکەی دەستێکی بە نارامی بەسەر بەرگی کتێبەکەی تۆلستۆی دا خشاند لێلی و غەمگینییەکی سەیر تێزایە نێو

چاوەکانی. گوتی ئومێدی ئەوەی هەبووە، دوای ئەوەی لە جەنگدا سەرکەوتن، دەلیڤەی ئەوەی بۆ بڕەخسێ خۆی فێری خوێندەواری بکات.

سبەی ساڵیادی ڕاگەیاندنی کۆماری ئیسپانیایە. سیلدارەکە و سکرتێرەکەی، پاڵەپەستۆی زۆر دەخەنە سەر مێشکیان تا بزانن کونسولگەرییەکانی بیانی لە سیڤیل و بۆرگس کام جۆری ئاڵاکان هەڵدەدەن. لە شێوەی باسەکەیاندا بۆم دەردەکەوێ ئەم باس و خواستە چەندین هەفتە درێژەی هەبووە. هەردوکیان لە یەك ژووردان. نیکۆلاس و وردیلە بە دڵساردییەوە لێیانی پرسی ئایا شتێکی گرنگتریان نییە بۆی نیگەران بن؟ کە لە ئەنجامدا، بایرۆن وەك پیاو ماقووڵێکی ئیسپانیی، هەندێ خۆی کۆکردەوە و هەڵپڕووکایە سەروچاوی نیکۆلاس و گوتی:" نا، سینیۆر".

بۆنێکی سەرخۆشکەر لە نێو هەوادا هەست پێدەکرا. بۆنی بەهار و دەریا. هەتا کاتژمێر سێ و نیو ئێمەیان نەگەڕاندەوە ژوورەکانمان.

کاتژمێر حەوت "ئاغلیتۆ" بە قەڵەم و مەرەکەبەوە وەژووری کەوت. پسولەیەکی پێنج پسێتایم دابوو پێی بۆمی ورد کاتەوە. بەلاّم ئەو لە بڕی چوو سێ پسێتاکەی دیکەم وێداتەوە. نامەم بۆ کونسولی ئینگلتەرا لە سیڤیل نووسی، بەلاّم دەڵێن هەتا سبەی ناکرێ بخرێتە پۆستەوە. سبەی کە نامەکە ڕۆیی، وا بزانم دڵم باشتر دەبێت. سبەی دەیەمین ڕۆژی ناساغیمە.

***چوارشەممە، چواردەی نیسان" ساڵیادی ڕاگەیاندنی کۆماری ئیسپانیا"**

نامەکەم لە کاتی هێنانی خواردنی بەیانی دایە بەندیوانەکە، بەلاّم لە فەرمانگەی چاودێری و سانسۆری زیندان نامەکەیان بۆ گەڕاندمەوە و گوتی دەبێ بە زمانی ئیسپانیایی بنووسرێ. بازرگانەکەی کێنوی تاریق ، کە جاری پێشتریش ببووە وەرگێڕم بانگهێشت کرا یارمەتیم بدات نامەکە بە زمانی ئیسپانیایی دروست بنووسم. پاشان کە پێی گوتم چەند هەفتە لەمەو پێش لەگەڵ ئیسپانیاییەکدا بۆ سەودا کردنێکی پەیوەندیدار بە گەیاندنی کەل و پەلی جەنگی هاتۆتە سیڤیل_ و بەو تۆمەتە هەردووکیان دەسگیر دەکرێن. هەرسێکیان لە ژووری ژمارە "٣٣"ن. سێهەمینەکەیان نوێنەری کۆمپانیایەکی ئەمریکی گەورەی ئۆتۆمبێلە، ئەویش بە تۆمەتی قاچاغچێتی دراو زیندانی کراوە، ئەوان خواردن و شەراب و تەنانەت قاوەشیان لە هوتێلەوە بۆ دێت، سەرەڕای ئەوەیش "ئاغلیتۆ" ڕۆژانە بابی چل _ پەنجا پێستا شتیان لە حانووتەکەوە بۆ دەکڕێ. ئەوانە پیاو ماقووڵانی زیندانن، تا سەر ئێسقان ڕقم لێیانە . کابرا بەڵێنی دا کەمێك قاوە و فرووجەیەکم بۆ بنێرێتە ژووری _ لە دڵم یەقینە بەڵێنەکەی بە جێ ناگەیەنێ. " پاشکۆی یاداشتەکان" ڕاستم کرد و هەر وایش دەرچوو".

درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی کە ئەو و هاوڕێکانی " ئومێدەوارن بە زوویی شوێنی خۆیان بگوازنەوە ژووری ژمارە "٣٩". بە شێوەیەك قسەی دەکرد وەك ئەوەی باسی ژوورەکانی هوتێلێك بکات. لە درێژەی قسەکانیدا گوتی "ئاغلیتۆ" زۆڵێکی بێ بەزەییەو لەبەرامبەر بەشیشێکدا براکەشی دەکوژێت.

سەرەنجام، نیوەڕۆ، نامەکەم رۆیی. بینیم "دۆن ئانتۆنیۆ" نامەکەمی دوای ئەوەی لە فیلتەری سانسۆر تێپەڕی، خستە نێو سندوقی پۆستەی نێو ڕاڕەوەکەوە دەڵێ بێ هیچ گومانێك سەبەی کونسوڵ دێتە ئێرە. لەسەر سێ پستاکە، مشتومڕێکی بێزراوم هەبوو، گوتی هەر کارێك حەزم لێ بێ بەو پارە پیسەم دەتوانم بیکەم. کەچی هەر نەیشیدایەوە. پاشان، کەمێك دوای کاتژمێر یەك، ئەمجارە لەسەر کاتی خۆی، منیان بردەوە حەوشە. دوو کۆماریخواز لەوێ بوون و، "کارلۆس"یش. بەڵام "نیکۆلاس"ی لێ نەبوو. دەمویست پرسیار لە بەندیوانەکە بکەم چی بەسەر هاتووە، بەڵام دووانەکەیتر، ئامۆژگاریان کردم نەپرسم باشترە. کارلۆس لێمان دوو دەکەوتەوە, خاچێکی شکاوی لە کاغەز بڕیبوو و نووساندبووی بە جێ قۆچپەکەیەوە و لەپاڵ دیوارەکەی ئەوبەرەوە، تەنیا سینگی دەرپەڕاندبوو، هەوراز و نشێوی دەکرد. دواجار جورئەتێکم دایە بەرخۆم و پرسیارم لە بەندیوان کرد شانەکانی هەڵتەکاند و شتێکی نەگوت.

**تەپڵی ماتەم، "نیکولاس" با ئومێدوار بین هەموو شتێك بە خێرایی کۆتایی هات و زۆر ئازارتیان نەدا، ڕۆژێکی پڕ شکۆیان بۆ ئیعدامکردنت هەڵبژارد. نازانم کونسولگەرییەکان چ ئالایەکیان هەلکرد. تۆ، وردیلە بووی، دێهاتییەکی ئەندەلووسی بچکۆلە، چاوەکانت نەرم و جوان بوون، کەمێکیش دەرپۆقیو، یەکێك لەو هەموو بێکەس وداماوانە. ئەم پەرتوکە پێشکەش بە تۆ کراوە. چی جیاوازییەکی بۆ تۆ هەیە؟ تەنانەت ئەگەر زیندووش بوایتایە، نەتدەتوانی بیخوێنیتەوە. هەر لەبەر ئەمەش ئیعدامتیان کرد، چونکە ئەوهەندە چاونەترس بووی ئارەزووت دەکرد فێری خوێندەواری بیت. تۆ و ملیۆنەهای وەك تۆ، کە چەکە کۆنەکانتان بە دەستەوە گرت و ویستان بەرگری لە سیستەمی نوێ بکەن، ئەو سیستەمەی لەوانە بوو ڕۆژێك ئێوەی فێرە خوێندن بکردایە.**

**ناوی دەنێن ڕاپەڕینی چەکداری، نیکۆلاس. دەڵێن دەستی مۆسکۆی لە پشتە، نیکۆلاس. ناوی لێ دەنێن بزووتنەوەی بەرەڵلاکان، نیکۆلاس... ئەوەی کە مرۆڤێك بیەوێ فێرە خوێندەواری ببێت.**

**ئەی خوایە، بەراستیش هەر دەبوایە بتخەنە نێو قەفەزێك و رەوانەی جنێفت بکەن و لەسەر قەفەزەکەش بنووسن: " ئەوەتا ئەو مرۆڤە، لە ساڵی خوداوەندی ئێمە، "١٩٣٧"** ئینجیل یوحەننا

# ١٧

وا لەگەڵ خۆم ڕێك کەوتبووم هەر ئەوەی نامەکەم بۆ کونسوڵ نێردرا مانگرتنەکەم دەشکێنم. نامەکە، ڕێك بەر لەوەی بمبەنە نێو حەوشە، نێردرابوو. ئەو کاتەی زانیم "نیکۆلاس"یان ئیعدام کردووە، نەوهەندە داڕووخام، ئاهەنگگێڕانم بە بۆنەی شکانی مانگرتنەکەم و خواردنی یەکەم ژەم، ڕۆژێك دواخست. ڕۆژی پێنج شەممە، پانزەی مانگی نیسان بوو. مانگرتنەکەم بە قاوە و شیرێکی خەست و کێکێکی زیادە، کە لە حانووتەکە کڕیبووم، شکاند. ڕێك دە ڕۆژ بوو دەمم لە هیچ خواردنێك نەدابوو. بەڵام بۆم بووە ژەهری مار. لەگەڵ هەڵگرتنی هەر تیکەیەك، دەکەوتمە یادی ئەو پەلکە خاسەی نیکۆلاس بۆمی راداشت و نەمخوارد. زۆر بە زەحمەت ئۆقرەم گرت تا بووە کاتژمێر یەك و بردمیان بۆ حەوشە. "کارلۆس" لەوێ بوو. سپوساغ بە خاچە شکاوەکەیەوە.

دووانی تر دیار نەبوون. من و "کارلۆس" هەوراز و نشێومان دەکرد و خۆمان لە یەکتری لادەدا. ڕەنگ بە ڕوخساری هەردووکمانەوە نەمابوو. چاومان چەقیبووە سەر ئەو دەرگایەی دەبوا لەوێوە بێن. دواجار "کارلۆس" بەرەو لام هات _تا ئەو کاتە، یەك وشەمان بەیەکەوە

ئالوگۆڕ نەکردبوو_ زۆر ڕەسمی، خۆی بە "مولازم کارلۆس. ت" ناساند و گـوتی سـپێدە زوو، لە کونی ژوورەکەیەوە بینیویەتی هەردووکیان لە ڕێڕەوەکەوە بەرەو ژێر دەبرد.

هیچ رایەکی دەرنەبڕی. منیش هیچم نەگوت. بـە بێـدەنگی، لـە نێـو حەوشـە چـۆڵەکەدا هەوراز ونشێو دەبووینەوە. بەڵام چەند چرکەیەك دواتر، دەرگا کرایـەوە و دوو کۆماریخوازەکـە، پاك وپڕۆتن و سەر و ریش تاشراو، وەدەرکەوتن، ئەوها شاگەشـکە بـووین بـە غـاردان بـەرەو روویان چووین و هەموومان تەوقەمان پێکەوە کرد و دەستێکمان لە پشـتی یەکـدی دا. ئـەوان بۆیان روون کردینەوە کە ئـەم بەیانییـە بردوویـانن بـۆ گـەرماو. هـیچ وشـەیەکمان نەدرکانـد سەبارەت بەوەی لە چی ترساوین، بەڵام خۆیان گومانیان بۆ چووبوو.

دەرەنجامی هەموو ئەو رووداوانە، من و "کارلۆس" لە پڕێکا ببووینە هـاوڕێ. بـە زمـانی ئەڵمانی پێکەوە قسـەمان دەکرد و، ئەو حیکایەتی خۆی بۆ گێڕامەوە. "کارلۆس" مولازم بـوو لە هێزەکانی ئیتاڵیا. بەشداری لە هاتنە ناوەوەی هێزە شۆڕشگێڕەکان دا بۆ "مالاگا" کردبوو، بە بیریشـی دادەهـات بـە پـێش مـاڵی "سـرییتەر" تێپـەڕ ببوون، سـەرنجی ئـاڵای میللـی ئینگلتەرایشی دابوو. تەنانەت بە خەیاڵیدا دا دەهات منی لەسەر بەلەکۆنەکەوە دیتبێ، پاشان نێردرابووە بەرەی شەڕی مەدرید. لەم سەین و بەینەدا، لـە مۆڵـەتێکی کورتـدا، لـە سـیڤیل، لەگەڵ شۆفێرێکی لۆری ئەڵمانی ببووە هاوڕێی، ئەڵمانییەکە کە ناوی "جانی" بوو، هەمان ئەو گەنجە قژ بۆرە بوو کە لە حەوشەکەیا بینیبووك. دواتر دەرکەوتبوو جانی زۆر تەمبـەڵ و تەوەزەل و بێکارەیە. چەندین جار لەگەڵ پۆلیسی ئەڵمانیا دەستەو یەخە ببوو. دواجار داوای کردبوو لەو سویا ئەڵمانییەدا خزمەت بکات کە، دەنێردرێتە ئیسـپانیا، چـونکە بیسـتبووی لـەوێ مـرۆڤ دەتوانێ پارەیەکی زۆر و زەوەنـد کـۆ بکاتـەوە. لـە ناوەڕاسـتی ئـاداردا، بـە پێـی داوایـەکی بەرپرسانی ئەڵمانی "جانی" لە سیڤیل دەستگیر کرابوو، "کارلۆس"یشیان لـە بـەرەی شـەڕی مەدرید بانگهێشتی سیڤیل کردبوو تا لـە بـارەی هاوڕێکـەی شـایەتی بـدات. ئـەویان بـانگ کردبووە بارەگای ناوەندی پۆلیس. کاتێك چوبووە ئەوێ، چەکدارە مەدەنییـەکان، ئەوهەنـدەیان بێڕێزی بەرامبەر کردبوو کەسایەتییە سەربازییەکەی برینـدار بـوو، مسـتێکی راوەشـاندبووە لووتی بەڕێوەبەری پۆلیس. لە ئاکامدا کەلەپچەیان لە دەست کردبوو، ئێستایش ئەوەتا لێرە لە زینداندایە. سەیرو سەمەرەترین شت لە هەموو ئەو بەسەرهاتە سەیر و سـەمەرەیەدا ئـەوەبوو، کە بۆ "کارلۆس"یان فڕێ دابووە ناو ئێمەی زیندانی حوکمدراو. رەنگە بەرپرسان نەیانویسـتبێ لەگەڵ "جانی" لە یەك شوێندا بن. وێڕای ئەمەیش، جورئەتی ئەوەیان نەدەکرد کە ئـەو، واتـە

ئەفسەرێکی ئیتالّیایی، لەگەلّ زیندانییە " ئاساییەکان"، لە نێو حەوشە جوانەکەدا، پێکەوە دابنێین. بۆیە لێرە لەگەلّ ئێمە دایە. ئەوە هەمان ئەو شتە بوو کە ئێمەیش بیرمان بۆی دەچوو. بەلاّم "کارلۆس" لای من دانی بەوە دانا کە هاوبەندبوون لەگەلّ ئێمەدا، یەکجار زۆر نیگەرانی دەکات. زۆر لەوە دەترسا شەوێك لە ناکاوێك دا بێن بگرن بە پشتی ملیدا و بیبەن ئیعدامی بکەن. پێم گوت ئەمانەی تۆ دەیلێی تەنیا قسەی قۆڕن و بە دلّنیاییەوە لەم دوو سێ رۆژەی داهاتوو دا وەزعی روون دەبێتەوە. گوتی ئەگەر دەمزانی " مەبەستی من بوو" پەیوەندی نێوان نێوان ئیسپانیا و ئیتالیا چۆنە ئەوهەندە گەشبین نەدەبووم. ئەو راستییەی کە بکرێ کەلەپچە لە دەست ئەفسەرێکی ئیتالّیایی بکرێت و بیبەیت، لە حیکایەتە سەیر و سەمەرەکانی ئەو پەیوەندییەی نێوان ئەو دوو ولاّتەیە. ئەو تەنیا لە روانگەیەکی شەوق و جوامێرییەوە هاتبووە ئیسپانیا " بە رێکەوت مووچەی مانگانەیشی چوار هەزار لیر بوو، چل پستایشیان رۆژانە وەکو پاداشت پێ دەدا" ئێستایش دەسگیریان کردبوو، وەکو تاوانکارێکیش لەنێو بەندیخانەیان ئاخنیبوو، چی پارە و بەلّگەنامەکانیشێتی دەستیان بەسەر هەمووی داگرتبوو. نە جگەرەی هەبوو، نە شانە، نە سابوون و نە شتێك بیخوێنێتەوە بۆ خۆی....

گوتم پێویست ناکات هەموو ئەو شتانە بژمێری کە نییەتی چونکە من بە خۆم دەزانم دەبێ چی هەبێ و ئێستا هیچیان نییە. ئەو پیاوە گەنجە زۆر سەرنجی منی بۆ لای خۆی رادەکێشا، لە هەمانکاتیشدا نەمتوانی بەسەر ئەو خۆشحالّییە ئازاردەرەدا زالّ بم کە هەستم دەکرد لە ئەنجامی ئەو بێ ئەقلّییەی کردبووی یەخەی گرتبووم. تەمەنی بیست و دوو سالّ بوو، رەگەزنامەی ئیتالّیایی هەبوو، بەلاّم بە رەگەز هاولاّتی نەمسا بوو و لە شاری میلانۆ، قوتابی زانکۆ بوو. دەیخوێند بۆ ئەوەی ببێتە مامۆستای زمانی لاتینی لە قۆناغی ئامادەییدا. خاچی شکاوی لەسەر سینەیدا هەلّگرتبوو چونکە برینی تەورنجاخ " تەورێکە لە شێوەی ئەوانەی دەروێشەکان لە سەر شانیان دادەنێن" کە هێما و لۆگۆی فاشییەکانە، لە کاغەزکارێکی ئەستەم بوو. گوتی گومانی لەوە نەماوە ئەوانەی بە قازانجی "سوور"ەکان شەڕ دەکەن زۆربەیان خەلّکی رووسیان و لەوەیان کە، دیبووی ئەو هەموو ئیسپانییە لە لایەنی بەرامبەردان سەری سوڕمابوو. گوتی لە دلّی یەقین بوو "سوور"ەکان هەموویان قەومی بەربەرن و لەوەیا کە دەیبینی من و دوو کۆماریخوازەکە چەند مرۆڤی باشین تووشی سەرسوڕمانێکی زۆر هاتبوو. کەسایەتی "کارلۆس" ناوێتەیەکی بەزەییهێنەر لە ساوێلکەیی، بیرکۆلّی و پلەو پایە خوازییەکی بێ گەڕ و گێچەلّ بوو کە دەبوایە بەو هۆیەوە جلی خۆی لەم دنیا ئالّۆزەدا لە ئاو

بێنێته دەرێ. بەڵام دیار بوو کە ئەمەیش ئەوەندە کارێکی ئاسان نییە بۆ ئەو. دوو مانگی یەکەمم لە بەندیخانەی سیڤیل بە تاك و تەنیا بووراند بوو، تەنیا ئێستا، کە لەگەڵ زیندانییەکانی تر دا تێکەڵ بوومە، تازە دەزانم لە دەوروبەری من دا چی دەگوزەرێت. زانیم کە تەنیا لە ماوەی ئەو یەك هەفتەیەی سەرەتای هێنانم بۆ ئەم زیندانە سی و حەوت کەس لە نێو حەوشە گەورەکەدا گوللە باران کرابوون. دوا هەفتەی مانگی شوبات کەس ئیعدام نەکرابوو، لە مانگی ئادار چل وپێنج کەس ئیعدام کرابوون. زۆربەی قوربانییەکان ئەو بە دیل گیراوانە بوون کە لە بەرە جیاوازەکانی جەنگدا گیرابوون. لە هەموو نموونەکانیشدا، دادگاییکردنەکان وەکو دادگاییکردنەکەی "نیکۆلاس" بوو. تەنانەت یەك کەسیش بێ دادگاییکردن ئیعدام نەکرابوو، بەڵام ئەم دادگاییکردنانە زۆر قێزەوەنتر بوو لەو قەسابخانە بێ رێ و رەسمانەی بە دیلگیراوەکان کە، خێرا لە دوای هەر شەڕێکدا لە هێڵەکانی پێشەوەی جەنگ رووی دەدا. تۆمەتی هەر هەموو بە دیل گیراوەکانی جەنگ، بێ ریز پەڕ " راپەڕینی چەکداری" بوو. ئەوانەی کە بەرگرییان لە حکومەتی یاسایی دەکرد لە بەرامبەر شۆرشێکی ئاشکرا دا، بە بەشداری لە راپەڕین تۆمەتبار دەکران لەلایەن مەرجەعێك کە لافی ئەوەی لێ دەدا دادگا، یاسایە و حوکمیش بەناوی چەسپاندنی عەدالەتەوە دەردەچوو. سیناریۆی ئەم کۆمیدیا شوومە، بەردەوام هەمان شتە. هەموو نمایشی دادگاییکردنەکە، سێ خولەکی زیاتر پێ نەدەچوو. هەمیشە و بێ بازدان بەسەر کەسێکدا، ئەوەی ناوی خۆی نابوو داواکاری گشتی، بۆ هەموویان داوای سزای گوللە بارنکردنی دەکرد. ئەوەی ناوی خۆیشی نابوو پارێزەر هەمیشە بێ بازدان بەسەر کەسێکدا، بۆ هەموویان داوای سوککردنی سزاکانی دەکرد بۆ زیندانیکردنی تا هەتایی. پاشان زیندانییەکەیان دەبردە دەرێ. هیچ جارێك جۆری سزا و حوکمەکەیان پێ رانەدەگەیاند. رێك دوای ئەوەی تۆمەتبار، قاچی لە دەرگای دادگا دەهاتە دەرێ، حوکمەکەی دەردەچوو، کە ئەویش هەمیشە و بێ بازدان بەسەر کەسێکدا، سزای مەرگ بوو. کۆپی حوکمەکە دەنێردرا بۆ فەرماندەی گشتی هێزەکانی باشوور "ژەنەرال کنێپو دلیانۆ" حوکمەکان زۆر بە خێرایی جێبەجێ دەکران. بیست هەتا بیست و پێنج لە سەدی زیندانییەکان _ بە پێی زەوقی "کنیپۆ" یان بارودۆخی بەرەکانی جەنگ_ دەکەوتنە بەر لێخۆشبوون. ئەوانی تریش ئیعدام دەکران. لە روانگەی رەسمیاتەوە، بڕیاری کۆتایی لە دەست "ژەنەرال فرانکۆ" بوو. لە هەندێ حاڵەتی تاك و تووکدا _ بە تایبەتی ئەگەر مەترسی کاردانەوەی نێو نەتەوەیی لە ئارادا بوایە_ "ژەنەرال لیسمۆ" سوککردنەوەیەکی دەبەخشییە حوکمەکان. دەربارەی بێکەس و بێچارەکان

تەنانــەت لیســتی حوکمدراوەکانیشــی نــەدەبینی. بــۆ نموونــە "نیکــۆلاس" چــوار ڕۆژ دوای دادگاییکردنەکەی گولله باران کرا. لە ڕووی تەکنیکییەوە کارێکی مەحاڵە لە ماوەیەکی ئاوها کورتدا، دۆسیەی ئەو لە دادگـاوە بگاتـە دەسـتی "کئێپـۆ" لـە کیوێشـەوە بگاتـە بارەگـای فەرماندەیی "فرانکۆ" لە "سـالامانکا"یان "بۆرگی" و لەوێشەوە بگەڕێتەوە. لەو ساتەوە کـە تۆمەتبار پێی لە دادگای سەربازی دەهاتە دەرێ، لە چارەنووسی ئاگادار نەدەکرایـەوە. ئەگـەر حوکمەکەی بۆ سی ساڵ سووك بکرابایەوە بە نامە _ هەفتەیەك یان مانگێك یان شەش مانگ دواتر_ ئاگاداریان دەکردەوە. ئەگەریش حوکمی ئیعدامەکەی بڕیـاری لەسـەر بدرابایـە، ئـەوا حوکمدراو تەنیا لە کاتی جێبەجێ کردنی سزاکەی، دەیزانی. لەم بەینەدا، لێدەگەڕان بۆ خۆی لە حەوشەدا تۆپێن و شەڕە شەق بکات و هەموو بەیانییەکیش فاڵی ئەوە بگرێتەوە بزانێ ئەمشەو دابێ ئیعدام دەکرێ یان نا. کەسـانێك لـە حەوشـەکەدا بـوون چـوار دانـە مـانگی ڕەبـەق لـە چاوەڕوانی ئیعدامکردنی خۆیان دا مابوونەوە. دوا ژمارەی پێوانەیی لای ئەفسەرێکی پارتیزان بوو، چوار مانگ ونیو، دوو سێ ڕۆژ بەر لە ئازاد کردنی من، ئیعدام کرا. "نیکۆلاس" بەختی باش بوو، تەنیا چوار ڕۆژ چاوەڕوانیی کێشا. لە مانگی ئادار دا چل و پێنج کەس گولله بـاران کران. لە سیانزە ڕۆژی یەکەمی مانگی نیسان کەس ئیعدام نەکرا. لە ماوەی شـەوی سـیانزە و چواردەی نیسـان، بە بۆنەی بەرز ڕاگرتنی سـالڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماریی "١٧" کـەس ئیعـدام کران. "نیکۆلاس"یشیان لەنێو دابوو. دوو شـەو دواتـر، شـەوی پێنجشـەممە "٨" کەســی تـر ئیعدام کران. جاری یەکەم بوو شتێکم لەم بارەیەوە دەبیست. ڕەوتی کارەکـە زۆر بـە بێـدەنگی دەڕۆیی، ڕەنگە ئەمە بتوانێ ڕوونی بکاتەوە کە، بۆ پێشتر شتێکم لـە بارەیانـەوە نەبیسـتبوو. بەڵام ئێستا بە تەواوی گوێ قولاغ بووم. لەوە گەیشتووم کە کاتە قەیرانییەکە لە مەودای نێوان نیوە شەو و کاتژمێر دووی سپێدەیە. ماوەیەك، لە نیوە شەو تا کاتژمێر دوو، لە پشت دەرگای ژوورەکەم رادەوەستام و گوێچکەم بە دەرگاکەوە دەنووساند. لـە شـەوی یەکـەمی ئێشـکگریدا، شەوی چوارشەممە، هیچ شتێك ڕووی نەدا.

لە شەوی دووەم....

هێشتا، کە ئەو شەوەم بیردێتەوە ئێلنجم دێت.

خەوم لێ کەوتبوو، کەمێك بەر لە نیوەشەو واگا هاتم. لەنێو بێدەنگی وتـاریکی زینـدانـدا، کە لێوانلێوە لە خەونە مۆتەکە ئاساکان، هەزار و سێ سـەد پیـاو لـە خـەودابوون، گـوێم لـە ورتەورتی نزای قەشە و، دەنگی زەنگوڵەی ڕێوڕەسمی ئـایینی بـوو. پاشـان دەرگـای ژوورێـك،

ژووری سێیەمی لای چەپم کرایەوە و ناوێکیان بانگ کرد. دەنگێکی بە خەوالّوویییەوە گـوتی : " que_ کێیە ئەوە، چ باسە"؟ دەنگی قەشە زولاڵتری لێهات و دەنگی زەنگوڵەکەیشی بەرزتر بۆوە. ئێستا ئیدی پیاوە خەوالّووەکەی نێو ژوورەکە دەیزانی، یەکەجار تەنیا نالّەی کرد، پاشان بە دەنگێکی نووساوەوە داوای یارمەتی کرد: "socorro ، socorro".

ئەو بەندیوانەی هاورێیەتی قەشەی دەکرد گوتی : " کابرا، یارمەتییەك لـە ئـارادا نییـە" ئەمەی بە ریتمێکی نە دۆستانە و نە دوژمنانە گوت. تەنیا درکاندنی راستییەك بوو. بـۆ سـاتێك ئەم پیاوەی لەسەر لێواری مەرگ راوەستابوو، بێ دەنگ بوو. هەڵسوکەوتی هێمن و نەرم و نیـانی بەندیوانەکە، ئەوی بردە نێو بیرکردنەوەوە. پاشان لە تریقەی پێکەنینی دا. بە هەردوو دەسـت لـە ئەژنۆکانی خۆی دەدا و پێکەنینەکەی نارام و بێدەنگ و، تێکەڵ بە هەناسە برکێ و نزگرە بوو. بە قەشەی گوت: " گاڵتە دەکەن، هەر لە سەرەتاوە دەمزانی بـۆ ئـەوە هـاتوون گاڵـتەم لـە گەڵـدا بکەن." بەندیوانەکە بەهەمان ریتمی پێشووتری گوتی : " کابرا، گاڵتـە نییـە". بردیانـە دەرێ، دەنگی هاواریم لە دەرەوە گوێ لێ دەبوو. بەلاّم تەنیا _ دوو سێ خولەك_ پاشان دەنگـی چـەند گوللەیەك هات. هەر لەو بەینەدا، قەشەو بەندیوانەکە، دەرگای ژووری تەنیشتیان کردبۆوە: ژمارە "٤٢"، دووەمی لای چەپمەوە. دیسـان "que" دیسـان نـزا و زەنگوڵـە. ئەمـەیان وەکـو منـداڵ دەنووزایەوە و دەگریا. پاشان، هاواری دایکـی دەکـرد : "Madre ،Madre" . دیسـان "Madre، Madre" . بەندیوان گوتی : " کابرا، بۆ زووتر لە بیری دایکتدا نەبووی؟" بردیانـە دەرێ. هاتنـە بەر دەرگای ژوورەکەیتر. کاتێ بانگی دراوسێکەمیان کـرد، وەلاّمـی نەدایـەوە، زۆر لـەوە دەچـوو پێشتر واگا بووبێ و، وەکو من ئـا‌سـا، خۆی ئامادە کردبێ. بەلاّم کاتێ قەشە، نزاکەی تەواو کـرد، وەك ئەوەی لە خۆی بپرسێ، پرسیاری کرد :" بۆ دەبێ بمرم"؟ قەشە بە ریتمێکی پڕ لـە هەیبـەت بەلاّم هەندێك بە پەلە و خێرا، وەلاّمی لە حەوت وشەدا دایەوە : " بڕوا و ئیمانت هـەبێ، کـابرا ! مەرگ واتە رزگاریی". بردیانە دەرێ. گەیشتنە ژوورەکەی من. قەشـە، کوێرانـە دەسـتێکی بـە قفڵەکە داخشاند. لە کونەکەوە ئـەوم دەبینـی. کابرایـەکی وردەڵـە و رەشـتاڵ و دابەسـتی بـوو. بەندیوانەکە گوتی :" نە، ئەمەیان نە". چوونە بەردەم ژوورەکەی تـر. ئـەویش، ئـەیار و ئامـادە بوو. شتێکی نەپرسی. کاتێك قەشە نزای دەکـرد، بـە هێواشـی دەسـتی بـە چـڕینی سـروودی " مارسێیز" کرد. بەلاّم نەیتوانی درێژەی پێ بدا و دەنگ لەنێو گەروویدا شکاو، لە پرمەی گریـانی دا. بردیانە دەرێ. پاشـان کپی و بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر ژوورەکاندا. ئێسـتا لـەوە دەگەیشـتم

ئەو بازرگانەی خەڵکی کێوی تاریق بوو دەیگوت کە ئەو و هاوڕێکانی بەو زووانـە دەگوێزرێنـەوە ژووری ژمارە "٣٩".

بە درێژایی ئـەم شـەوە، چـەندین جـار لـە خـەو راچـڵەکیم و هەسـتم کـرد قەرەوێڵەکـەم دەلەرێتەوە، وەك بڵێی بوومەلەرزە لە ژوورەکەمی دابێ. دوایی بینیم نا، ئەوە جەستەی منە لە نووکی پێ تا تووکی سەرم کەوتۆتە لەرزەوە. هەر ئـەوەی کـە واگـا دەهـاتم جەسـتەم ئـارامی دەگرت و هەر کە خـەوم لێدەکەوتـەوە سـەر لـە نـوێ دەمارەکـانی جەسـتەم گـرژ دەبـوون و دەکەوتمەوە لەرزینەوە. سەرەتا هەستم کرد دەبێ گەزەن و زیانێکی هەمیشەیی وەکو چڵەکانەوە و پەشۆکانی دەماریی دەرەنجامی جەنگ بێ تووشم هاتووە بەڵام بە درێژایی چەند رۆژی دواتر، تەنیا دووجاریتر دووچاری ئەو حاڵەتەی گرژبوونی دەمارەکان بووم و پاشان نەما و لاچوو. حـاڵ و وەزعی "کارلۆس" زۆر وێرانتر بوو. هەموو ئەوانەی من بیستبووم ئـەویش بیسـتبووی. لـە شەوی هەینیدا نۆ کەس گوللە باران کران، شەوی شەممەیش سیانزە کەس. چوار شەوی بـەدوای یەکدا، هـەموو شـتێکم گـوێ لـێ بـوو. بـەیانی رۆژی دووشـەممە بانگهێشـت کرامـە ژووری "کارلۆس" لەپاڵ دەرگاکە، لەسەر پشت راکشابووە سەر زەوی، کەف کەوتبووە سـەر دەمـی و هەردوو قاچی وشك هەڵگەڕابوو و ئیفلیج ببوو.

لە ماوەی پێنج رۆژ دا، چل و حەوت کەسیان گوللـە بـاران کـرد بـوو. تەنانـەت بـۆ ئـەم زیندانەیش، ژمارەیەکی پێوانەیی بوو. لە نێو حەوشەدا، رووخسارەکان مۆر هەڵگەڕابوون. لـە یارییەکی تۆپێندا، دوو کەس پەلاماری یەکدییان داو قژی یەکیان دەرهێنا. بەیانییەکەی، ئـەو بەندیوانانەی شەو ئێشکگربوون، بە دزییـەوە و رەنگهـەڵبزرکاو و تۆقیـو و پەرێشـانحاڵ بـەنێو راڕەوەکەدا گوزەریان دەکرد. تەنانەت "ئاغلیتۆ"یش کە دەبوایە شەو بـەدوای شـەودا دەرگـای حوکمدراوەکان بکاتەوە و، رۆژێك هات، چاوەکانی وەکو گۆمی خـوێن، سـوور هەڵگـەڕابوون و گوتی :" ئەگەر ئەوها درێژە بکێشێ کەسێك لە ئێمە بە زیندویی نامێنێ". دوو کۆمـاریخوازە هەواخۆرەکەی نیوەڕۆیانی ئێمە، ئەم خولەیان لە هەمووان بە خۆشیتر بـەڕێ کـرد. جارێکیـان، رۆژی یەکشەممە، کاتێك سەیری یەکێك لە پەنجـەرەکانی ژوورە گشـتییەکانی دەکـرد، لـەوێوە، هـەموو رۆژ کاتـژمێر سـێی دوای نیـوەڕۆ، یـەکێك لـە هاوڕێکانیـان، لـە کـەلێنی میلـە ئاسنینەکانەوە دەستی بۆمان رادەوەشاند، هاوژوورەکانی بە هێماو ئاماژە تێمانیانگەیانـد کـە شەوی رابردوو نۆرەی ئەو بووە و برداوە بۆ ئیعدام. بەم هەواڵە "بایرۆن" سەر و دڵی تێك ئـاڵا و رشایەوە، پاشان جگەرەیەکی داگیرساند و لەژێر لێویەوە کەوتە جنێودان. کاتێك ئێمەیان بـۆ

ژوورەکانمان گەڕاندەوە، لە روانگەیەکی خورافاتی و کۆنەپەرستانەوە نەمانوێرا بە یەکدی بڵێین " تا سبەی". بە هێواشی منگەیەکمان لێوە هات "تـا...." و لـەم هـەموو خورافاتیبوونـەی خۆمان شەرم دایگرتین.

شەوێك دوای دابەشکردنی خواردن "دۆن ئانتۆنیۆ" گەڕایەوە ژوورەکەم. پرسیاری لـێم کـرد " بۆ ئەوەندە کەم دەخۆی"؟ گوتم ئارەزووی خواردنم نییە. پرسیاری کرد " دەترسی"؟ کـەمێك بیرم کردەوە گوتم " بەڵێ" وڵامی نەدایەوە، بەڵام شانەکانی هەڵتەکاند، جگەرەیـەکی وێـدام و دەرگای، بێ ئەوەی بە یەکدا بدا، بە هێواشی دایخست. "کارلۆس" پێی گوتم شەوی رابردوو، دوو زیندانییان لە ژوورەکەی "جانی" دا بـردووە. "جـانی" بـۆی گێڕاوەتـەوە گوایـە هـەردوو کەسـەکە، گریـە و زارییـان کـردووە "جـانی" لەمـەڕ ترسـنۆکیی "سـوور"ەکانەوە نوکتـەی هەڵبەستووە. "کارلۆس" لە "جانی" پرسیبوو کە ئایا ئەو، خۆیشی لە ئیعدام دەترسێ یان نا. "جانی" گوتبووی گوایە ئەو "سوور"ێکی بەدبەخت و ترسنۆك نییـە. یـەکێك لـە "سـوور"ە ئیعدامکراوەکان، رۆژی پێشتر، دوو پستای بە قەرز وێدابوو، هیچ نەبێ ئێـستا ئیدی ناچار نییە پارەکە بداتەوە. لە "کارلۆس"م پرسی ئایا هێشتا دەیەوێ لـە هاوڕێیـەتی "جـانی" بـەردەوام بێت. گوتی حەز دەکـات بـە دەسـتەکانی خـۆی بیخنکێنـی. ئێمـە لـە دەربڕینـی هەسـت و ئارەزووەکانماندا، لەڕوو داماوی و شەرمکردنمان لە یەکدی بەلاوە نابوو. مەرگ بـە پێخشـکە و ماتەمات، بەنێو زینداندا هاتوچۆی بوو. ئێمە، پێکداخشینی باڵەکانیمان هەست پـێ دەکـرد، وەکو باڵکووتانی مێشێك، بە منجڕی بە دۆرماندۆری دەموچاومان گیزە گیزی بـوو. بـۆ هـەر کوێ دەچووین، لە هەرکوێ رادەوەستاین، ئەم گیزەگیزەمان لە کـۆڵ نـەدەبۆوە. شـەوی شـەممە دیسان گوێم لە تریقەی پێکەنین بوو. وەك ئەو دەنگەی لـە ژووری ژمـارە "٤٣" هـاتبوو. زۆر ئازاردەر بوو، بەلامەوە سەیرە چۆن هەموو شتێك ئاوها بەم سادەییە تێپەڕبوو.

رۆژی یەکشـەممە، کاتێك کە لەناوحەوشەدا بووم، سەروکەللەیەك لـە پەنجـەرەی یـەکێك لـە ژووورە گشتییەکانی نهۆمی دووەم دەرکەوت_ ئەو پەنجەرانەی میلەی ئاسـنینیان پێـوە نـەبوو. ئەو، کڵاوێکی رەشی نابووە سـەر کەللـە بچـووك و ناشـیرینەکەی و زیـاتر لـە نمایشـکەرێکی گاڵتەجاڕ دەچوو. هاتوهاواری بوو، لە ئێمەی دەپرسی کەسمان زمانی مەجەری دەزانین. من بـە رەچەڵەك مەجەریم. بێگومان ئەم بابەتە لەنێو زینداندا بڵاوبۆتەوە. پیاوەکە بە دەنگی بـەرز و بە زمانی مەجەری روو لە من گوتی گوایە دوێنێ نامەیەکی پێ گەیشتووە کە تێیـدا هـاتووە پاش دوو رۆژی دیکە گوللە باران دەکرێ. ئایا ئەگەر رۆژێك گەڕامەوە مەجەرستان ئەم هەواڵە

دەگەینمە ماڵباتەکەی؟ گوتم قسەی پڕوپووچە، هەرگیز، بەر لە گوللە بارانکردن، پێشتر هەواڵەکە راناگەیەنن. لەو ماوەیەدا کە لەگەڵ پیاوە مەجەرییەکە قسەم دەکرد، نەمدەوێرا سەر هەڵبڕم، من و "بایرۆن" رووبەری یەکتر راوەستابووین و بەبێدەنگی لاسایی قسەکردنمان دەکردەوە بۆ ئەوەی، سەربەندیوانەکە، کاتێك لە پەنجەرەوە سەیرمان دەکات، وابزانێ بە یەکەوە قسە دەکەین.

کابرای مەجەرستانی وڵامی دایەوە گوایە لەبەر ئەوەی زمانی ئیسپانی نازانێ، نەیتوانیوە نامەکە بخوێنێتەوە. بەڵام هاوژوورەکانی گوتویانە ناوەڕۆکی نامەکە وا دەگەیەنێ کە ئەو بڕیار وایە گوللە باران بکرێ. پاشان، درێژەی دایێ و گوتی بە درێژایی مانگی رابردوو، سی و پێنج زیندانییان لە ژوورە گشتییەکەی تەنیشتییانەوە بردووە. گوتم بۆ کوێیان بردوون. گوتی " مەبەستت لەو پرسیارە گەمژانەیە چیە، بۆ ئەوێیان بردوون کە هەموو ئیسپانییەك دەبەن، یەکراست بۆ کوشتارگە".

رۆژی دواتر، مەجەرییەکە، هێشتا لەوێ بوو. ئەو نامەیەی بۆ ژنەکەی نوسیبووی بۆی هاوێشتمە خوارێ. نەمدەوێرا سەر هەڵبڕم و سەیری بکەم. هەواڵم پێگەیشتبوو، چەند کەسێك لە شوێنی سەرتاشینەکە، کە پەنجەرەکانی بەرەو حەوشە دەکرانەوە، دانراون، کە هەرچییەك ببینن بە سەربەندیوانەکەی دەگەیەنن. بە درێژایی چەند رۆژی رابردوو، بە بەردەوامی لە پەنجەرەکانی ژوورەکانەوە یادداشتیان بۆ فڕێ دەدامە خوارێ، کە منیان لە هەبوونی سیخوڕ ئاگادار دەکردەوە. هەندێکیان لە بارەی "کارلۆس" کە خاچە شکاوەکەی سەرنجی هەموویانی راکێشابوو، منیان ئاگادار کردەوە. کە لە یاداشتێکدا نوسرابوو: " ئاگاداری خۆت بە کابرای بیانی، سیخوڕی وا لێرە هەن کە ئامادەن بە رادەستکرنی کەسانێکیتر بە جەللادەکان، گیانی خۆیان رزگار بکەن". یاداشتەکانیان کاغەزی گرمۆڵە کراوبوون یان بە داوە دەزوویەکەوە بەسترابوونەوە. کاتێك دەمانبینی یادداشتێك لەوسەری حەوشەوە دەکەوێ، دووقۆڵی و بەدەم پیاسە کردنەوە بەرەو ئەوێ دەچووین، هەندێك رادەوەستاین، درێژەمان بە ئاخاوتنەکانمان دەدا و دواجار، جگەرەیەك یان کتێبێکمان بە ئانقەست بەردەدایەوە سەرزەوی تاکو بتوانین بێ ئەوەی سەرنجی کەس بۆلای خۆمان رابکێشین یاداشتەکە هەڵگرینەوە. پاشان یاداشتەکەمان دەخستە نێو گیرفانمان و دوور لە چاوان دەقەکەیان دەکردەوە و دەمانخستە نێو لاپەڕەکانی کتێبەکەوە. دواجار، من یان "بایرۆن" پشت لە دیوار دادەنیشتین و دەماخوێندەوە. بە رواڵەت وامان نیشان دەدا کە، کتێبەکە دەخوێنینەوە، بەڵام لە راستیدا یاداشتەکەمان دەخوێندەوە. رۆژی دواتر،

کابرای مەجارستانی هێشتا لەوێ بوو. نامەیەکی نوێی ماڵئاوایی کە بۆ ژنەکەی نوسیبووی، بۆمی فرێ دایەو خواری. پێنج رۆژ بەدوای یەکدا، رێك کاتژمێر دوو، سەروکەللەی لە نێو پەنجەرەکەدا دەردەکەوت و نامەیەکی نوێی ماڵئاوایی، دەخستە حەوشەوە. رۆژی شەشەم یەکێك لە هاوژوورەکانی، لە پشت سەری ئەوەوە هەندێ سەر و گوێلاکی خۆی بادا و بە هێواشی زللەیەکی لەنێو چاوانی خۆی دا. هێدی هێدی مەبەستەکەی روونتر دەبۆوە. دواجار لە رێگەی "کارلۆس"ەوە، کە ئەویش لە "جانی" بیستبووی، مەتەڵەکەمان بۆ کرایەوە، کابرای مەجەرستانی خۆبەخشێك بوو لەنێو پەلە تایبەت بە بیانییەکانی "فرانکۆ" و بە تاوانی تەڵەکەبازی و گزیکاری و شتی لەم بابەتە لە زینداندابوو. لە ژوورەکەی ئەودا پێنج پارتیزانی کۆماریخوازی لێبوو کە، هەموویان بە مەرگ حوکم درابوون. بۆ ئەوان، هاوژوور بوون لەگەڵ دوژمنێکدا بە هیچ شێوەیەك ئەزموونێکی دڵخواز نەبوو. بەتایبەت ئەگەر دوژمنەکە لە قێزەونترین جۆرەکەی بێت، واتە بە کرێگیراوێکی بیانی و، بە بەرچاوی ئەوەوە پیاو بەرەو مەرگ و گوللە بارانکردن راکێش بکەن. مەجەرستانییەکە، زمانی ئیسپانی نەدەزانی. رۆژێکیان کاتێك ئاگادارییەکی کارگێری بەدەست گەیشتبوو، فێڵیان لێکردو ئەویش چووە ئەقڵی گوایە ئەمە نامەی گوللە بارانکردنێتی. دەیانهەویست ئاوها دڵی خۆیان بدەنەوە کە ئەویش تامی مەرگ بچێژێ. لە دوای هەفتەیەکدا، دووان لەو پێنج پارتیزانەی هێشتا بەر گوللە بارانکردن نەکەوتبوون، لەو هەموو گریە و زارییەی کابرا پەست و بێزار بوون و ئەو فێڵەی لێیان کردبوو ئاشکرایان کرد. پاش ماوەیەکی کەم ئازاد کرا. ئەگەر داکۆکیکارانی ئاکار و ئەخلاق وا هەست بکەن نیازیان بە دەربڕینی سەرنجێکە لەم بارەیەوە من دەتوانم بڵێم هەڵسوکەوتی پارتیزانەکان بەتەواوی جێی سەرکۆنە کردنە، بەڵام منیش ئەگەر لە جێگەی ئەوان بوومایە هەمان ئەو کارەی ئەوانم دکرد

| | |
|---|---|
| شەوی سێشەمە | حەڤدە زیندانیی گوللە باران کران |
| شەوی پێنجشەمە | هەشت کەس |
| شەوی هەینی | نۆ کەس |
| شەوی شەمە | سیانزە کەس |

چەند تیزماڵێکم لە کراسەکەم دڕاند و ئاخنیمە گوێچکەکانمەوە بۆ ئەوەی شەوانە گوێم لە هیچ نەبێ. سوودی نەبوو. بە پارچە شووشەیەك پدووی ددانەکانم بڕی و گوتم خوێنڕێژی دەکات

تا هەندێك لۆكەی تەعقیمكراو وەربگرم. لۆكەكەم ئاخنییە ناو گوێچكەكانم. ئەویش سوودی نەبوو. هەستی بیستنمان بە شێوەیەكی نا سرووشتی تیژ ببوو. هەموو دەنگێكمان دەبیست. شەوانی ئیعدامەكان، كاتژمێر دە، زەنگی تەلەفۆنیشمان دەبیست. گوێمان لە دەنگی ئەو بەندیوانە دەبوو كە، وەڵامی پەیوەندییەكی تەلەفۆنیی دەدایەوە. دەمانبیست كە خێرا خێرا دووبارەی دەكردەوە: " هەروەها... هەروەها... هەروەها...". دەمانزانی كە، لە پشت هێڵی تەلەفۆنەوە، یەكێك لە بنكەی فەرماندەیی سەربازییەوە لیستی ناوی ئەو كەسانەی دەخوێندەوە كە دەبوایە ئەم شەو گوللە بارانبكرێن. دەشمانزانی لە پێش هەر "هەروەها"یەكدا، بەندیوان ناوی زیندانییەكی یادداشت دەكرد، بەڵام نەماندەزانی ناوی كێیە، هەروەك نەشماندەزانی ناوی ئێمەی لەگەڵدایە یان نا. تەلەفۆنەكە، هەمیشە رێك لە كاتژمێر دە، زەنگی لێدەدا. پاشان تا نیوەشەو یان تا كاتژمێر یەك، مرۆڤ دەیتوانی لەسەر پێخەفەكەی پاڵكەوێ و لە چاوەڕوانی دا بمێنێتەوە. ئێمە هەموو شەوێك، ژیانی خۆمان دەخستە نێو تەرازووەوە و دەمانكێشا و، هەموو شەوێك دەمانبینی كێشی كەمتر بۆتەوە. پاشان كاتژمێر دوانزە یان یەك، دەنگی تیژی شەومان دەبیست. قەشە و جۆقەی گوللەبارانكردن بوون. بەردەوام پێكەوە دەهاتن. دواتر كرانەوە و داخستنی دەرگاكان، جرینگە جرینگی زەنگوڵەی رێوڕەسمی ئایینی، نزاكانی قەشە، پاڕانەوە بۆ بە هاناوەهاتن و هاواری " دایە، دایە" دەستی پێدەكرد. هەنگاوەكان بە درێژایی رێڕەوەكە نزیكتر دەبوونەوە، دەكشانەوە دواوە، نزیكتر دەبوونەوە، دەكشانەوە دواوە، ساتێك لە بەردەم دەرگای تەنیشتمەوە بوون، ساتێك لە بەندی ئەولاتر، ساتێكی تر دەگەڕانەوە. دەنگی قەشە لە هەموو حاڵەتەكاندا لە دەنگەكانی تر روونتر و زوڵاڵتر بوو :" خوایە، لەم پیاوە خۆش بە، خوایە، لە گوناهەكانی خۆش بە، ئامین".

لەسەر پێخەفەكانمان پاڵ دەكەوتین و دەبووە تەق و هۆڕی ددانەكانمان بەسەر یەكدا.

| | |
|---|---|
| سێشەممە | حەڤدە كەس ئیعدام كران |
| شەوی پێنجشەممە | هەشت كەس ئیعدام كران |
| شەوی شەممە | سیانزە كەس ئیعدام كران |

**خوداوەند گوتی، شەش رۆژ تۆ كار دەكەیت و، رۆژی حەوتەم، شەممە، هیچ كارێك ناكەیت.**

شەوی یەكشەممە سێ كەس ئیعدام كران

# ١٨

## دووشەممە، نۆزدەی نیسان

پێشتر سەرتاشەکە دەهاتە نێـو ژوورەکـەم و ریشـی دەتاشـیم، دوێـنێ بردمیانـە شـوێنی سەرتاشخانەکە. لە دوای دوو مانگ و نیو، جارێکی دیکە خـۆم لـە نـاو ئاوێنـەدا بینییـەوە. لەوەیا خۆم وەکو جاران بینی و هیچ گۆڕانێکم بەسەردا نەهاتووە لە سەر سوڕمانییا راچڵەکیم. بە راستیش کە مرۆڤ وەکو تۆپی فوتبـۆڵ وایـە هەرچـی شـەقی تێهەڵـدەی شـێوەی نـاگۆڕێ. شەقێکت وێ دەکـەوێ وا دەزانـی لـەت و کوتـت دەکـا، کەچـی رواڵـەت و پێسـتی دەرەوەت دەگەڕێتەوە شـوێنی خۆی و ئەو پەڕەکەی، ئاسەواری قاچێکی قوڕاویت بەسـەردا دەمێنێتـەوە. ئەگەر هۆشیاری و ئاگاییمان هاوکێشی کۆی ئەزموونـەکانمان بوایـە، دەبوایـە هـەموومان لـە تەمەنی بیست و پێنج ساڵی دا ببووینایە زانا و بیرمەندێکی بێ هاوتا.

ئەو بۆڕییە ئاوەی کە بەنێو ژوورەکەمدا تێپەڕ دەبێ، هەندێکجار کاری بۆرییەکانی تایبەت بە گواستنەوەی ناخاوتن دەکات، ئەگەر گوێچکەکانم بنووسێنم بەو بۆڕییـەوە، هەنـدێ دەنگـی تێکەڵ و پێکەڵ لێك هەڵاوێر دەکەم : ساتێك چـەند هێڵێکـی میوزیـك لـە رادیۆکـەی ژووری بەڕێوەبەری زیندان دێت، ساتێکی تر تێکەڵاوییەك لە دەنگە تێکچڕژاوکانی نێو چەند ژوورێکی زیندانییەکان دێت. تەنانـەت هەنـدێجار وا دەزانم گـوێم لـە دەنگـی ژنـان دەبێـت _ بەنـدی زیندانەکەی ئەولاترمان گرتووخانەی ژنانە. لەم سێ رۆژەی دواییدا، سەر لە بەری ئەو دەنگانەی

لە هەسارە دوورەکانەوە دێن، لە نێو دەنگی پیاوێکدا نوقم دەبن کە بێ راوەستان گریە و شیوەن بۆ دایکی دەکات. بێشك لـە یـەکێك لـە ژوورەکـانی دەوروبەرمـە. هـەرکاتێ گوێچـکەم بـە بۆرییەکەوە دەنووسێنم گوێم لە دەنگی دەبێ. پرسیارم لە "ئانخێل" کرد ئەو کەسـەی بـەردەوام دەگرییێ کێیە. گوتی پارتیزانێکە پێشتر لەگەڵ براکەیدا لەو ژوورەدا بوون بەڵام ئێستا لە شەوی هەینییەوە بە تەنیا ماوەتەوە ، ئەمڕۆ بەیانی، بەنـدیوان و "ئانخێـل" دوای ئـەوەی خـواردنی بەیانییان دابەش کرد گەڕانەوە ژوورەکەم. بەندیوان گوتی :" بجووڵێ، هاوڕێکەت شێت بـووە".

چووینە ژووری ژمارە "٣٧". لە تەختی دیو، لە پاڵ قەرەوێڵە ئاسنینەکەی "کارلۆس" یەك بە بەژنی خۆی درێژ کەوتبوو، خاچە شکاوەکەی هێشتا بە جێ قۆپچەکەیەوە بوو. نارەقە بە سـەر و روویدا دەهاتە خوارێ، کەفیش کەوتبووە سەر لێوەکانی و چاوەکانی دەرپۆقیبوون. تێی رامام و نەمزانی دەبێ چی لێ بکەم. بەندیوان، نەقیزەیەکی تێوە ژەنییە قەپرغەم و گـوتی :" یـاڵلا، شتێکی پێ بلێ دەی، بە زمانی ئەڵمانی بیدوێنە". " کارلۆس سەرو گوێلاکی چەند وشەیەکی ئیسپانی دەشکاند و پێشتر چەند جارێك ببوومە وەرگێڕی".

پرسیارم لە "کارلۆس" کرد چـی بەسـەر هـاتووە، نوقورچـەیەکم لـە قـۆڵی گـرت، هـیچ کاردانەوەیەکم لێی وەدی نەکرد و لەوە دەچـوو هـەر نەمناسێتەوە، مـن و "ئانخێـل" سـەتڵە ئاوێکمان هێناو بە دەم و چاویاندا کرد، پاشان گوێچـکەیان راکێشـا. دوای ئـەوە، کـەم کـەم هاتەوە هۆش خۆی، دەستی کرد بە ناڵە ناڵ و راوەشاندنی دەستەکانی. رایگرت لە جووڵە کردن و ئەوەندە قسەم لەگەڵی کرد دواجار ئاسیمییەوە و بـێ پێشـەکی دەسـتی بـە گازانـدە کـرد و دەستی نایە سەر ناوقەدی و گوتی کەمەری زۆر دێشێ و ناتوانێ قاچەکانی بجوولێنێ. دەستمان لە پێیەکانی دا، وەکو دار رەق و وشـك هەڵگـەڕابوو، ئەژنۆکانیشـی نەدەنووشـتانەوە. کـاتێ هەوڵماندا ئەژنۆکانی بە زۆر بچەمێنینەوە، لـە حەژمـەتی ئـازاردا قیژانـدی. دواجـار لەسـەر قەرەوێڵەکەیدا درێژمان کرد و، پزیشکیارێك _ یەکێك لە زیندانییەکان کـە قوتـابی پزیشـکی بوو _ گەیشت و رامان بۆ دەرکەوت کە بە دژواری تووشـی چـڵەکانەوەیەکی دەمـاریی بـووە. ئەوجا "JEFEDE SERVICIO" یش گەیشت و گوتی هیچی نییە و بە ئانقەست خۆی نەخۆش خستووە و ئەگەر ئەوەندە بە دەوریدا نەچین و وازی لێ بهێنین، بە زوویی بۆ دۆخی ئاسایی خۆی دەگەڕێتەوە. دواجار هەموومان لە ژوورەکە چووینە دەرێ و منیان بە تـەنیا لەگـەڵ کارلۆسـدا جێ هێشـت. رووم وەرنـەگێڕا بـەڵام دڵنیـا بـووم" JEFE" چـاوی بەسـەر کـونی دەرگاکـەوە نووساندووە و سەیری ژوورەوە دەکات. بە کارلۆسم گوت ئەگـەر راسـتە و بـە ئانقەسـت خـۆی

نەخۆش خستووە دەتوانیّ بەوپەڕی دڵنیاییەوە راستییەکە بە من بڵێت و گومانی نەبیّ کە من ئاشکرای ناکەم. بەڵاّم ئەو لە قسەکانم نەگەیشت، تەنیا شتێکیش کە توانیم لێی دەربهێنم ئەوەبوو کە، شەوانە ئەو دەنگانەی من گوێم لیّ دەبیّ ئەویش دەیانبیستیّ و، قەشە بە زەنگوڵەکەی تایبەت بە رێوڕەسمە ئاینییەکان لە ژوورەکەی ئەو نزیك دەبێتەوە. گوێی لە زرینگە زرینگی زەنگوڵەکە ببوو کە زیاتر و زیاتر لە ژوورەکەی ئەو نزیك دەبێتەوە و، ئیدی شتێکی دیکەی لە بیر نەماوە... دوای چەند خولەکێك هاتن بە شوێن من دا و گەڕاندمیانەوە بۆ ژوورەکەی خۆم و پاڵیان پێوەنام بۆ ژوورەوە. "JEFE" گوتی ئەگەر "کارلۆس" هەتا نیوەڕۆ چاك نەبێتەوە فڕێی دەدەنە نێو ژووری تەمێکردن و، لەویّ بیّ هیچ گومانێك حاڵی باش دەبێت. داماو "کارلۆس" قاچەکانی لە سەری ژێرتر بوون. کاتیّ وای بیردەکردەوە نزیکە بەرە و مەرگ بچێت، قاچەکانی وشك هەڵدەگەڕان و مل کەچ نەدەبوون بۆ جووڵە و هەنگاونان. ئەگەر هەروا بە ئیفلیجی بمێنێتەوە هیچ میدالیایەك بە بەرۆکیەوە هەڵناواسن. ئەمڕۆ، تەنیا سیّ کەس لە حەوشەدا بووین. هەموو رووداوەکەم بۆ "بایرۆن و سیلدارەکە" گێڕایەوە. شانێکیان هەڵتەکاند و پێنەدەچوو ئەوەندە دڵتەنگ بووبن. بەڵاّم پاشتر چەند جگەرەیەکیان دایە "ئانخێل" تا بیباتە ژوورەکەی "کارلۆس" و بیداتیّ. کاتی خواردنی ئێوارە لە بەندیوانەکەم پرسی حاڵی "کارلۆس" چۆنە. شەپا زللەیەکی بە هێواشی سرەواندە نێوچەوانی خۆی و گوتی " ئەو برادەرە تەواو نییە، شێتە". نامەیەکی دیکەم بۆ کونسوڵ نووسی. یەکەمیان پێنج رۆژ بەر لە ئێستا ناردرابوو. لەو رۆژە بەدواوە هەر ساتێك چاوەڕێی چاوپێکەوتنێکی یان هیچ نەبیّ وەڵاّمێکی نامەکەم بوومە لەلایەن ئەوەوە. بێگومانم نامەی یەکەم بیّ سەروشوێن کراوە ئەگینا هیچ پاساوێك نییە کە لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێر دا وەڵاّمێکی SOS ی من نەداتەوە. ناهومێدی و دڵساردییەکی ترسناکە. دوو مانگ و نیو شەڕم کرد مۆڵەتی نامەنووسینێك وەر بگرم _ دە رۆژ دڵە گووشێم هەبوو_ ئێستاش هیچ وەڵاّمێك دیار نییە، هیچ شتێك...

## *سێشەممە، بیستی نیسان

هیچ هەواڵێکی کونسوڵ نییە. بەڵاّم لە دوای تێپەڕبوونی چەندەها رۆژ، ئەمە یەکەم شەوی ئاسودەییە. کاتژمێر دەی شەو هیچ تەلەفۆنێك نەکرا. زەنگی شەویش لیّ نەدرا. هەستی نەخۆشێکم هەیە سەردەمی چاکبوونەوە تێپەڕێنیّ. دەڵێی تێکڕای زیندان هەناسەیەکی بە ئارامی هەڵدەکێشیّ. بەیانییەکەی دیسان منیان بردەوە دیار سەرینگەی "کارلۆس". دویّ شەو

حاڵی هەندێك باشتر بوو، شتێکی خواردبوو، هەوڵیشی دابوو، قاچە وشك هەڵگەڕاوەکانی بە دوای خۆی دا رابکێشێ و گەشتێك بە دۆرماندۆری نێو ژوورەکەیدا بکات. ئێستا سەر لەنوێ لە هۆش خۆی چۆتەوە. کاتێك لە ژوورەکەیدا بووم نوێنەرێك لەلایەن کونسولگەری ئیتاڵیاوە دەهات تا سەبارەت بە کێشەکە راپۆرتێك ئامادە بکات. بەلاّم نەمانتوانی "کارلۆس" بەهۆش بێنینەوە. بەڵگەی لەمە زیاتر چییان دەوێ تا دڵنیا بن لەوەی "کارلۆس" بە ئانقەست خۆی نەخۆش نەخستووە _ ئەویش ماوەیەکی زۆر لە چاوەڕوانی دا ماوەتەوە تا بتوانێ پەیوەندییەك بە کونسولخانەی ولاّتەکەیەوە بکات.

## * چوارشەممە، بیست و یەکی نیسان

دوێنێ کاتێك بەندیوان، خواردنی ئێوارەی بۆم هێنا، بەوپەڕی دڵسۆزییەوە گوتی دەبێ خواردنەکەم هەمووی بخۆم و ئەمری کرد دەبێ زیاتر لە بەشی خۆم خواردنم بدەنێ، کاتێك بەندیوانەکە ئەمەی گوت، وام هاتە بەرچاو "ئانخێل" و بەردەستەکەی، بە جۆرێك سەیریان کردم سەر سوڕمانیان پێوە دیار بوو. پاشان شەرابیان هێنا و بە پێچەوانەی بڕیارەکان، بێ ئەوەی خۆم داوام کردبێ، کوپەکەی دووەمیشیان بۆ پڕ کردم، هەستم کرد ئەو بەردەستەی شەرابەکەی هێنا بە جۆرێکی سەیر، چاوی تێکردم. لە دڵم یەقین بوو نۆرەم هاتووە. لە باتی ئەوەی بخەوم، هەر لەنێو ژوورەکەمدا هەوراز و نشێوم کرد لە چاوەڕوانیی ئەوەی زەنگی تەلەفۆنی کاتژمێر دەی شەو لێبدا. لە خەمساردی خۆم سەرم سوڕمابوو. تازە تێگەیشتم جیابوونەوە لە "بایرۆن و سیلدارەکە و ئانخێل" ئەستەمترو سەختترە لە جیابوونەوە لە هەموو هاورێ و کەسوکارەکانم . رێك لە کاتژمێر دە، زەنگی تەلەفۆن لێیدا. حەوت جار " DITTO,DITTO,DITTO" م گوێ لێ بوو. هەتا کاتژمێر یازدە، هەر لە ژوورەکەمدا هەوراز ونشێوم کرد، پاشان لە پڕێکدا هەستم بە شەکەتی کرد. بیرم کردەوە سەعاتێك دەرفەتم هەیە پاڵ کەوم، کاتێ هەستام لەخەو، خواردنی بەیانییمان هێنا. بە راستی بەخۆشم نازانم چۆن خەوم لێکەوت. هەتادێت زیاتر سەرم لە کارکردنی بۆلبەرینەکانی ناو سەرم سوڕ دەمێنێ_ لە راستیدا نازانم هێشتا کار دەکەن یان نا. لە دڵم یەقینە بوێری و توانای جەستەیی "کارلۆس" لە من زیاترە_ لە "مالاگا" لە شەڕێکی دەستەویەخەدا، باسکی بەسەر نێزە، برینـدار ببوو، منیش بە بیستنی سەربردەکەی، کە خۆی بۆی گێڕامەوە بە رادەیەکی زۆر کەوتمە ژێر کاریگەریی. ئێستایش ئەو لە ئەنجامی چڵەکانەوەیەکی سەختی دڵ لە جێگا دا کەوتوە و شوێن

و رۆڵ بینینمان پێکەوە گۆڕدراوە. لە بارەی دوو ئیسپانییەکە، بابەتەکە جیاوازی زۆری هەیە. شەوان هەردووکیان پێکەوەن. ئەمە خۆی جیاوازییەکی زۆرە.

بەڵام ئەگەر بەندیوان و "ئاخلیتۆ" جارێکی دیکە خواردنی زیاتر لە بەشەکەی خۆمم بدەنێ دەم و ددانیان تێك و پێك دەشکێنم. بەڵام ناکا هەمووی هەر خەیاڵات نەبووبێ و ئەوان ئاگاداری بڕیارێك بوونە کە، تەنیا لە دواساتدا هەڵوەشاوەتەوە. هیچ کاتێك ئەمەم بۆ روون نابێتەوە. هێشتا هیچ هەواڵێك لە کونسوڵ نییە.

## * پێنج شەممە، بیست و دووی نیسان

دوێ شەو، درەنگانێك، نامەی کونسوڵ گەیشت. بەرواری بیستی مانگی بەسەرەوە بوو. نووسیبووی نامەکانی چواردە و نۆزدەی مانگی بە دەست گەیشتوون و داوای کردووە رێگەی بدرێت بۆ بینینم. دیسان و بۆ جارێکی تریش، کێوە زەبەلاحەکەمان، میزڵدانی فووتێکراو دەرچوون. سەرەتا خەریك بوو شێت بم لە خۆشییاندا_ پاشان، لەوەیا کە بینیم ئێستا، کە گیانی خۆم مەترسی لەسەر نەما، چەندە سەبارەت بە چارەنووس و ژیانی ئەوانی تر بێ ئاگا مامەوە، ئێلنجم دەهاتەوە. ئەوەندە بە توندی و بە بەردەوامی ئێلنجم دەهاتەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەمشەو، دۆخ و کەش و هەواکە زۆر ئارام بوو، نەمتوانی بخەوم. سەیرە کە هەموو رووداوە باش و خۆشەکان_ هاتنی نامە لە ماڵەوە، پارە، نامەی کونسوڵ_ چ کاریگەرییەکی پێچەوانە دەخەنە سەر مرۆڤ. پاڵنەری هەڵگرتنی باری ئازار و ئەشکەنجەی ئەوانی تر، لە نێومدا، بە شێوەی بڕیارێکی ئەخلاقیی رەها کار دەکات، هەرچۆنێك بێت، تەنیا بە هۆکاری سەلیقە و زەوقی کەسییە کە لەباتی وشەی " خاچ " وشەی " بار " م بەکارهێناوە. بەڵام لە هەمان کانیاو، پاڵنەرێکی بە هەمان توندی بۆ کوشتنی ئەو قەشە رەش و بچووك و گۆشتاڵووەی، کە شەوانە زەنگوڵەی رێوڕەسمە ئاینییەکەی دەزرینگێنێتەوە، سەرچاوە دەگرێ.

ئەمڕۆ "کارلۆس" باشتر بوو، بە جووڵەی هەندێ هێواش و قورس لە حەوشەدا، لەگەڵ ئێمە پیاسەی کرد. پێیەکانی هێشتا هەندێك وشکن، بەڵام ئومێدی ئەوە هەیە بە زوویی تەندروستییەکەی بگەڕێتەوە دۆخی جاران. لەولاتر، ئیسپانییەکان زۆر شپرزە دیار بوون. هەردووکیان بەوپەڕی شاگەشکەییەوە هاتنە حەوشە و هەردوکیان بە پرتاو بەرەو لای من پەلاماریان هێنا. دەیانویست بزانن رۆژنامەی "تایمز" باشترە یان "دیلی هێرالد" زانیم کە دەبێ لەسەر ئەو بابەتە مشتومڕێکی توندیان هەبووبێ بۆیە هەوڵمدا وڵامەکەم لە

چوارچێوەیکی ئاقلانە دابدەمەوە. ئەمە سەختترین کارێك بوو کە دەبوایە بیکەم، چونکە هەر کامیان دڵنیا بوون لەوەی کە ئەو راستە و لەسەر هەقە و وەکو شێت هاواریان بەسەر یەکدا دەکرد. شتێکی وای نەمابوو دەست لە یەخەی یەکدی گیر بکەن. حەوشە، پەیتا پەیتا وەك شارە هەمەڕەنگەکەی لێ دەهات کە دڵت چی بیەوێ تێیدا بەدی دەکەیت_ "کارلۆس" بە قاچە ئیفلیجبووەکانی، ئەو دووانەی دی بەو هەستیاری و دەمارگرژییەی لە کەڵەشێری جەنگی دەچوون و، منیش بەم هەموو وەسواسە گەمژانەیەی ویژدان و حوکمە مەزهەبییە زەین پاککەرەوەکان بە شێوەی

" دۆمینێکنی".... دەبێ لەم رووە وە شانازی بە خۆمەوە بکەم؟ بەخۆم خۆ ئیدی نازانم.

## * هەینی، بیست و سێی نیسان

کاتژمێر سێ، کاتێ ئێمەیان لە حەوشەدا گەڕاندەوە، ڕێگەیان پێدام بچمە حانووت و بەخۆم، ئەو چەند پستایەی لە گیرفانمدا مابوو، خەرجی جگەرە کڕینیان بکەم. "جانی" لەناو حانووتەکە راوەستابوو قاوەی دەخواردەوە. تێمڕاما وەك ئەوەی نیازی دواندنی هەبێ بەڵام من پشتم تێکرد. ئەوجا "هێنری" ئەمینداری کتێبخانەیش گەیشت. زۆر کەیفساز بوو، گوتی دواجار، سبەی دەینێرنە فەرەنسا. بەڵێنی دا بچێتە لەندەن و چاوی بە ژنەکەم بکەوێ یان نامەیەکی بۆم بێنێ. " پاشکۆی یادداشتەکان: هەڵبەت هیچیانی نەکرد" ئەو ئازادییە رێژەییەی بۆ جموجۆڵ و بزاوت کە ئێستا هەمبوو، وای کرد بە هەندێك زەحمەتەوە بەرگەی کاتە تەنیاییەکان بگرم. کاتێك لە دوای کاتژمێر سێ دەرگا لە سەرمدا دادخرێت، چاوەڕوانی بۆ پاشنیوەڕۆی سبەی دەست پێ دەکات. کونسوڵ هێشتا نەهاتووە. ئەگەر هەر ڕێگەی پێ نەدەن بێت چی؟

## * شەممە، بیست و چواری نیسان

دوێ شەو، "کابالرۆ"ی گەنج، بە هاوڕێیەتی بەندیوانێك، هاتە ژوورەکەم. کوڕێکی تەمەن بیست و چوار یان بیست و شەش ساڵانێکی رێك وپێکە. لەوانەیە جاحێڵتریش بێت جلێکی کاری قاوەیی رەنگی لەبەر دابوو. زۆر بە توندی لەژێر چاودێرییەکی ورد دایە و نزیکەی ساڵێکی رەبەق " سەردانیکردنی قەدەغە" بووە. ڕێگەی پێ نادرێ قسە لەگەڵ کەس بکات، ڕێگەی پێ نادرێ بچێتە حەوشە، تەنیا لە شەو و ڕۆژێکدا دوو کاتژمێر، ئەویش لەگەڵ بەندیوانێك، ڕێگەی پێ دەدرێ لە نێو ڕێڕەوەکەدا هاتوچۆبکات. زۆر جارن لە کونەکەوە ئەو

دەبینی، بەردەوام پاك و خاوێن و رێكپۆشە، بە رواڵەتیش ورەی بەرز دیارە. لەگەڵ ئەوەیشدا كە بەهەمان ئەو ئەزموونانەی شەوە سەختەكانی من دا تێپەڕیوە، بە درێژایی چەند مانگی سەرەتادا، كاتێك سەد سەد، یان دووسەد دووسەد، یان سێسەد سێسەد زیندانییان، هەموو شەوێك، بێ هیچ دادگاییكردنێك و رێورەسمێك، بردووە بۆ ئیعدام، دەبێ چ حاڵێكی هەبووبێ...

ئەم كوڕە یان سروشتێكی ساكار و منداڵانەی هەیە، یان لە رادەبەدەر بەرگەگر و بە ورەیە. نازانم كامیانە. زۆریش خۆشەویستی بەندیوانەكانە. كاتێك، دوێنێ لێم وەژوورێ كەوتن، بەندیوانەكە بۆی روونكردمەوە كە نابێ یەكتری بدوێنین و، ئەوان تەنیا بۆ ئەوە هاتوون كە، "كابالرۆ"ی گەنج شتێكی بۆ خوێندنەوە لەلا نەبوو، گوێی لێ ببوو بەرگی یەكەمی كتێبی "شەڕ و ئاشتی" لەلای منە، گوتیان ئایا لە خوێندنەوەی بوومەتەوە، یان هەر چۆنێك بێت دەتوانم بۆ یەك شەو، وەكو ئەمانەت بیدەمە ئەو؟ كتێبەكەم دایە ئەو و پرسیارم كرد ئایا دەتوانم تەوقەیەك لەگەڵ "كابالرۆ"ی گەنجدا بكەم؟ بزەیەكمان بە رووی یەكدا كرد و لە كاتێكدا دەستی یەكمان دەگوشی، بینیم چاوەكانی پڕبوون لە فرمێسك. پاشان هەردووكیان رۆیشتن و " تۆلستۆی" یشیان لەگەڵ خۆیاندا برد. ئەمڕۆ، بەیانی زوو، كتێبدارێكی نوێ هات. ئەمجارەیان، زیندانییەكی سیاسی بوو، پیاوێكی تەمەن نزیك سی ساڵان، سۆسیالیستێكی پێشووی ئەندامی شۆرای شار، خەڵكی "گالیسیا". بەرگی دووەمی "تۆلستۆی" هێنا و ویستی بەرگی یەكەمی بۆ بگەڕێنمەوە. گوتم لەلای "كابارۆ"یە. دەرەنجام، توڕە بوو، گوتی مافی ئەوەمان نییە بێ ئیزنی ئەو كتێب لەگەڵ یەكدیدا ئالوگۆڕ بكەین _ هەزار و شەش سەد دانە كتێبی هەیە كە دەبێ ئاگادارییان لێ بكات، چۆن دەتوانێ... و... گوتم بە رێكردنی شەوێك، بێ ئەوەی شتێك هەبێ بۆ خوێندنەوە، لە دۆزەخیش ناخۆشترە و، ئەو وەكو زیندانییەكی سیاسی دەبێ ئەوە باش بزانێ و، خوا ئاگای لێیە حاڵ و وەزعی ئێمە ئەوهەندە بۆ ئەو رێورەسمە ئیدارییانە لەبار و گونجاو نییە، ئالوگۆڕی كتێبیش بە رەزامەندی بەندیوان بووە. لە وڵامدا ئەو گوتی نایەوێ لەگەڵ مندا درێژەی پێ بداو ئەگەر زیندانییەكی بێ ئاكار بم، لە بنەڕەتدا چیدی كتێبم بۆ ناهێنێ.

منیش وەڵامیم دایەوە و گوتم لەبەر چاوم ون بێ و، چەند جوێنێكی تەڕ و مزریشم پێ دا. ئەگەریش بەندیوان نەكەوتبا نێوانمانەوە دەستمان لە یەخەی یەكتری گیر دەبوو. كتێبدارەكە هەڵات. منیش لەدوای ئەو شەڕە، ئەوهەندە هەستم بە ئاسوودەیی دەكرد وەك شەپۆلەكانی دەریایەك لە پاش داكەوتنی زریانێكدا. بەڵام دوای نیو كاتژمێر گەڕایەوە و بێ ئەوەی تەنانەت یەك وشە لە دەمی دەرچێ، دوو كتێبی لەسەر قەرەوێڵەكەم دانا، "بیۆگرافییەكەی سێرڤانتس"

و رۆمانێکی "پیـۆ بـارۆژا". داوای لێبـوردنێکی زۆر رەسمـی کـرد و دەسـتی یـەکتریمان، بـە خۆشەویستییەوە گوشی. مرۆڤێکی سـەیرە. لـە حەوشـەدا، "کـارلۆس" پێـی گـوتم کـە ئـەم بەیانییە، لە ژێر چاودێری دوو پاسەوانی مەدەنی بردبوویانە کونسولخانەی ئیتالیا. کونسوڵ، بە پشوو درێژییەوە و بە هێمای بـاوەڕ کردنـی سـەربردەکەی، سـەری لەقانـدبوو، گووتوبوویشـی گـەرەنتی دەکـات لـە چـەند رۆژێکـی داهـاتوودا ئـازاد بکرێـت. "کـارلۆس" گـوتی، وای بەرچاوکەوتووە کە کونسوڵ، دەبێ رۆژانە رووبەڕووی کۆمەڵێك لـەو جـۆرە کێشـانە ببێتـەوە. لەبەر دەرگای زیندان، بەڕێوەبەری زیندانی بینیبوو کە بەسەر سوڕمانییەوە گوتبووی " جەنابی مولازم، وامزانی ئازاد بووی".

بە شێوەیەکی زۆر ترسناك دڵخۆشە. هەموو ئەو ماوە درێژەی بەو پارەیە گوزەراند کـە لـە ئێمەی قەرز کردووە، ئێستایش بۆ دوای ئازادبوونی، سۆز وبەڵێنی خەرمان خەرمان ئالتونمـان پێ دەدا. بە نیازە نامەیەك بۆ "مۆسـۆلینی" بنێرێ و داوای لێبکات ئێمـەیش هـەر سـێکمان ئازاد بکرێین. تەنانەت رەشنووسی نامەکەی بۆمـان خوێندۆتـەوە. بـە باسـکردن لـە قۆنـاغی خوێندنی و، رابردووی لەنێو حزبیی فاشیست و، پلە سەربازییـەکەی و چالاکییە جەنگییـەکانی لە ئیسپانیادا دەست پێدەکات. دواتر لە درێژەی نامەکە دا دەڵێت _ گەیشتۆتە ئـەو بـاوەڕەی کە "سوور"ەکان هەموویان تاوانبار نین، بگرە زۆریان ئارمانجخوازانی لە خشتە بـراون. پاشـان وەسفێکی ئێمە بە دوای دادێت کە جەرگ دەتوێنێـتەوە و دواجار، ئەو ئومێدەی، بە ئەدەبەوە، بەڵام بە پێداگری دەردەبڕێ کە " دوچە" بـە نیشـانەی شـایەت و بەڵگەیـەك لـە بێگـەردی و رۆحیانەتەکـەی، ئێمـە بـۆ نێـو ئـامێزی خۆشەویسـتانمان دەگەڕێنێتـەوە. دەبوایـە هـەمووی وەربگێڕمەوە سەر زمانی ئیسپانیایی و ئێمە بایی ئەوەندە رەچـاوی ئـەدەبمان دەکـرد کـە، لـە هەمبەر ناوەڕۆکی نامەکەدا جدییەت بە سەر و رووخسارمانەوە بپارێزین. ئـەوجا "کـارلۆس" گوتی پۆلێك کچی جوان لەبەر دەرگـای زینـدان راوەسـتابوون و لەگـەڵ پاسـەوانەکاندا مـۆزە مۆزیان دەکرد. کەشی گشتی زیندان زۆر باشترە، ئەم سـێ شـەوەی دوایـی زۆر بـە هێمنـی و ئارامی تێپەڕیووە و هەمووان ئومێدوارن دیسان قۆناغێکی ئارامتر بە رێگاوەیە. هێشتا شەوان لۆکە دەئاخنمە نێو گوێچکەکانم، بەڵام شێوازێکی نوێم بـۆ شـەوان دۆزیوەتـەوە. تـەنیا پێـنج کاتژمێر و نیو، لە کاتژمێر نۆ تا دوو و نیو دەنووم و، خۆم رادێنم کاتـژمێر سـێی دوای نیـوە شەو هەستمەوە. هەموو رۆژەکەیش بە واگایی بمێنمەوە تا بەم شێوەیە دڵنیا بم کە، بە درێژایی کاتژمێرە قەیراناوییـەکان لە تواناما دەبـێ بخـەوم. چـەندین کاتـژمێر، بـە هـەڵهاتنی خـۆری

بەیانی، ماوەیەکی زۆرە _ دەبێ لە نێو ژوورەکەمدا هەر سەرێ و خوارێ بکەم یان لەسەر پێ و بە راوەستاوی کتێب بخوێنمەوە تاکو خەوم لێ نەکەوێ_ بەڵام ئەم شێوازەم سەرکەوتنی بە دەست هێناوە و کاریگەر بووە و، هەر ئەوەندەی ئەو واگا مانەوەیە لە دەست مۆتەکەکانی شەوانە رزگاری کردووم، ناسوودەیی و رەزامەندیم پێ دەبەخشێ.

## * یەکشەممە، بیست و پێنجی نیسان

هێشتا کونسوڵ نەهاتووە. "کارلۆس"یش هێشتا ئازاد نەکراوە. "بایرۆن" دەستی بە شیعر گوتن کردووە و ئەفسانەکانی "باسك" لە نێو شیعردا رێك بخات. بە شان و باڵی باسکییەکاندا هەڵدەڵێ و سووکایەتی بە ئەندەلۆسییەکان دەکات. مرۆڤی ئەڤیندار ئەوەیە بتوانێ بە کورتە وشەکان بدوێ و، ئەمرۆ، بەدەم بادانی سمێڵە چکۆلانەکەی دەیگوت: " هاورێکەم، ئەندەلۆس هێلکەدانی ئەفریکایە. لە کاتێکا وڵاتی باسك دڵی ئیسپانیایە". گوتم دەربڕینێکی جوانە. لە لایەکی تریش، سەرۆکەکەی رۆژ لە رۆژ زیاتر نغرۆی نێو دڵتەنگی وبێ ئومێدی دەبێت. هەتا ئێستا هەردووکیان پارەیان هەبووە، دەشیانتوانی هەموو رۆژ خواردنی زۆر بخۆن، سوپی هەمەچەشن، ستێکی گۆشت لەگەڵ هێلکەو رۆن و زەڵاتە، میوە، قاوەی سادە، هەریەکە و بوتڵێکی شەراب و هەفتەی سێ جاران فرووجە. "ئاغلیتۆ" فێر ببوو رۆژانە هەموو ئەو خواردنانەیان لەنێو سەبەتەیەکدا بۆ ببات و بەشی خۆیشی لێ گل دابوو. دەستیان بە پارەکەیانەوە نەدەگرت و هەموو رۆژ "بایرۆن" دەیگوت لەوە دەترسێ بەر لەوەی هەرچی پارەیان هەیە بیخۆن، ئیعدام بکرێن. ئێستا پارەیان نەما، منیش ئیدی هیچم پێ نەماوە، "کارلۆس"یش خۆی هەر لە بنی را هیچی نەبوو. بە هاوبەشی بیست پستامان لە "ئاغلیتۆ" بە قەرز وەرگرتووە و بەو مەرجەی هەرکاتێ پارەمان پێ گەیشت سی پستای بدەینەوە. بێجگە لەوە، من پستای دیکەشم لە کابرای بەردەستەکە قەرز کردووە. بەم شێوەیە، هەموومان، هیچ نەبێ جگەرەمان بۆخۆمان هەیە.

# ١٩

رۆژی دواتر_ دووشەممە، بیست و شەشی نیسان_ تەنیا سێ ڕستە لە ناو یادداشتەکانمدا هەیە: " شەو بوورامەوە، چلەکانەوەیەکی دیکەی دڵ، ئەمجارەیان ئیدی کۆتاییم پێ دێ...."

هەڵبەت ئەمەیشیان درۆیەکی دیکە بوو تەنیا بۆ خاتری سانسۆر، ئەوەی ڕوویدابوو ئەوە بوو دوێ شەو، لە ژێر کاریگەری دیمەنێکی زۆر جوان، بڕیارمدابوو مانگرتنەکەم دەست پێ بکەمەوە و کارێك بکەم هەرچۆنێك بێ بمگوازنەوە بۆ نەخۆشخانە. ژیان لەنێو زیندان، دووبارە بوونەوەی بەردەوامی هەمان حاڵ و بارودۆخ، هەمان بیرکردنەوە و هەمان پلاندارێژییەکانە. ژیان و بیرکردنەوەی ئادەمیزاد لە نێو بازنەیەکی بەتاڵ دا دەخولێتەوە، کە لە دەرەنجامیدا مێشك گێژ دەبێ و، هیچ ڕێگەیەکیش بۆ دەرچوون نییە. پێشڤەچوونێك نییە. تەنانەت کات و زەمەنیش بەسەر یەك هێڵی ڕاستە و ڕاست دا ناڕوا و هەموو جارێك بە هەمان شێوە، خۆی دووبارە دەکاتەوە.

ئەم ڕووداوەی خوارەوە لەو شەوە ڕوویدا:

پاشنیوەڕۆی یەکشەممە، زیندانییەکی نوێیان هێنابوو، فڕێیان دابووە کۆنە ژوورەکەی من_ ژمارە " ٤١". ئەوانم بینی کە هێنایان. زۆر منالکار بوو، نزیکەی پانزە یان شانزە ساڵێك دەبوو. ئەو پاشنیوەڕۆیە نۆرەی ئێشکگریی "کاپیتان بلای" بوو. ڕۆژی پێشووی "ئانخێل" بوو، بەردەستەکەی تریش "مانوئێل" جێگەی ئەوی گرتبۆوە. "مانوئێل" گۆجەیەکی بۆگەن بوو، ڕواڵەتی وای نیشان دەدا مێشکی ئاودز بووبێ. وا لەسەر زاران بوو ئەم کابرایە بە تاوانی دەستدرێژی سێکسی، کە ئەنجامێکی کوشندەی هەبوو، بە زیندانیی تا هەتایی سزا درابوو.

هەموومان سەبارەت بە ئەو، هەستمان بە جۆرێك لە نەفرەتی جەستەیی دەكرد. ئەو "مانوئێل" سەرخۆش بوو، بەردەستەكان زۆربەیان خۆیان سەرخۆش دەكەن، كاتێك خواردنی ئێوارەی هێنا خۆی لەسەر قاچە خوار و گێڕەكانی دا رانەدەگرت و ژووریّ پڕ بوو لە بۆگەنی مەشرووب. كاتژمێر نۆ گوێم لیّ بوو كە "كاپیتان بلای" لەگەلّ "مانوئێل" بە ڕێڕەوەكەدا دێن. لە پێش ژووری ژمارە "٤١" ڕاوەستان. كاپیتان بلای گوتی: " ئەمشەو بە شوێنی دا دێن" . مانوئێل بەم دەنگە نەرم و زیقەی، كە وەك زریكەی كوندەپەپوو وابوو گوتی : " قەشمەرجاڕییەكە دەبیّ بمریّ. بە درێژایی ڕۆژ دەیویست ڕێگەی پیّ بدەن بچێتە نێو حەوشەوە. قەشمەرجاڕ...".

لە دوای ئەودا بەندیوان گوتی : " ROJO,ROJO" واتە : گرنگ نییە "سوور"ێك خۆ زیاتر نییە، ". وابزانم ئەویش سەرخۆش بوو. جۆرێك بەو دەنگە زبر و گرخ و گیراوەی "ROJO.ROJO"ی دەكرد دەتگوت وا دەمرێنیّ. لەو كاتەدا، مێردمندالّەكەی نێو ژووری ژمارە "٤١" كەوتە مستكوتان بە دیوی ژوورێی دەرگاكە، دیارە هەموو قسەكانی بیستبوو. هاواری دەكرد :" نامەویّ بمرم، دایكە، دایكە، بگەرە فریام. نامەویّ بمرم. هاوار... هاوار...". هەموو ڕاڕەوەكە پڕ بوو لە دەنگدانەوەی هاوارەكە. سەر لە بەری زیندانەكە كەوتە نائارامی و بیّ ئۆقرەییەوە. لە نێو هەموو ژوورەكاندا، دەنگی تێكەلّ و نادیار دەهات. كوڕەكە هەروا دەینەڕاند.

"كاپیتان بلای" و "مانوئێل" ئەویان لە ژووریّ پەلكێشی دەرەوە كرد و بردیانە نێو ژوورێكی تاكەكەسی تایبەت لە شوێنێكی تر. لە نێو ڕاڕەوەكەدا بەردەستەكە، ساتمەیەكی كرد و بە زرمە و گرمەوە كەوتە سەر زەوی. بەندیوانەكانی دیكە گەیشتن و لە بردنی مێردمندالّەكە دا یارمەتی ئەوانیان دا. كەمێك دواتر، هێشتا نەبووبوە كاتژمێر دە _ قەشە لە ڕاڕەوەكەدا بەرەو ژێر هات، لەوانەیە بۆ گوێگرتن لە دان پیانانی مندالّەكە بێت بە گوناهەكانی. ئەوجا بەندیوانێك هاوارێكی لیّ هەلّسا و داوای كۆنیاكی كرد. كاتژمێر دە، زەنگی تەلەفۆنەكە لێی دا. سیّ جار "LO MISMO" واتە " هەروەها"م گویّ لیّ بوو. كەمێك پاش كاتژمێر دە "دۆن ڕامۆن" هاتە ژوورەكەم و گوتی ئەگەر درەنگانێك دەنگی هاتو هاوارێك بەرز بۆوە نیگەران نەبم_ یەكێك لە زیندانییەكان ناساغە و ئەوان دەیانەویّ بە شەو بیگوازنەوە بۆ نەخۆشخانە.

بە ئاشكرا لەوە دەترسان كاتی بردنی، كوڕە مێردمندالّەكە ڕووبەڕوویان بێتەوە و بەزمێك بنێتەوە. وا باو بوو لە شەوەكانی ئیعدامكردنەكاندا، هەموو شتێك بە هێوری و بێدەنگی ئەنجام بدریّ، قەشە و بەندیوانەكان بە ئاشكرایی، شێوازێكیان بۆ خۆ بەدوورگرتن لە دەنگە

دەنگ و جەنجاڵی دۆزیبۆوە. کاتژمێر دە و نیو، فسکە فسك و دەنگی پێکەنینی کپ و لەسەرەخۆ و خشپە و خشەخشێکی سەیرم لە ڕاڕەوەکە دەبیست. لە کونەکەوە سەیرم کرد. لەنێو ڕاڕەوە چۆڵ و ڕووناکەکەدا، نمایشێکی سەیر وەك وڕێنە کردن، بەڕێوەدەچوو. "مانوئێل"ی بەژن بچووك و "کاپیتان بلای" ئەسپ بازییان دەکرد. "مانوئێل" ببووە ئەسپ و پەتێکیان بە دەوری جەستەی دا ئاڵاندبوو، هەوسار، بە دەست "کاپیتان بلای"ەوە بوو. بەم وەزعەوە بە درێژایی ڕاڕەوەکەدا هەوراز و نشێو دەبوونەوە. هەرجارێك بە بەرکوونی ژوورەکەمەوە تێدەپەڕین، دەمتوانی بیانبینم. بەندیوانەکە قامچییەکی بە دەستەوە بوو لە هەر شەقاوێکدا جارێك رایدەوەشاند و هاواری دەکرد " هێی... دەی حەیوان!". "مانوئێل" جار بەجاریَ بە کپییەکەوە پێدەکەنی و لەتاو ئازاریش دەیناڵاند. دوای ئەوەی سێ جار ئەمسەر و ئەوسەری ڕاڕەوەکەیان کرد، ئەسپ و سوار کارەکە چوونە نێو حەوشەوە کە لەو کاتدا چۆڵ بوو. دەنگی ڕاوەشاندنی قامچی و ناڵەکانی "مانوئێل"م دەبیست. پاشان گەڕانەوە. ئەمە نزیکەی کاتژمێر یازدە بوو. دواتر خەوم لێ کەوت. ڕۆژی دواتر زانیم، لە دوای نیوەشەو دا، سێ زیندانی ئیعدام کراون. مێردمنداڵەکە هیچ هات و هاوارێکی نەکردبوو. لەوانەیە بە کۆنیاك سەرخۆشیان کردبێ. هەر لە دوای ئەوشەوە بوو کە، سەر لە نوێ بڕیارم دا دەم لە خواردن نەدەم و، هەوڵ بدەم ئاویش نەخۆمەوە. لە دڵم یەقین بوو ئەمجارەیان ئاسەواری برسێتی زوو دەردەکەوێ_ دە ڕۆژ بوو کە دووبارە دەستم بە خواردن کردبۆوە، بەر لەو ماوەیەش، دە ڕۆژی ڕەبەق مانم گرتبوو، ئەم ڕاستییەش لە لایەك لە کاتژمێرەکانی نووستنم کەم کردبۆوە و یەکجار زۆریش جگەرەم دەکێشا. ئەمجارەیان لێبڕابووم مانگرتنەکەم نەشکێنم بەڵکو بە هەر شێوەیەك هەبێت لەم قەسابخانەیە ڕزگارم بێ. حەوت ڕۆژ هیچم نەخوراددەوە و پانزە ڕۆژیش، لە بیست و پێنجی نیسانەوە تاکو نۆیەمی ئایار هیچم نەخوارد. وامدەزانی لە پێناو ژیانمدا تێدەکۆشم، بەڵام دیارە قەدەر وابوو هەموو تێکۆشانەکانم کردارێکی گاڵتەجارییان لێ دەرچێ، چونکە مانگرتنەکەی دووهەمیشم لە خواردن، ڕەوتی کارەکە سەلماندی کە بەهەمان ئەندازەی مانگرتنەکەی یەکەم کارێکی پووچ و بێ مانا بووە. بێ ئەوەی پەیوەندی بە هیچ کام لە کردارەکانمەوە هەبێ، ئازادیان کردم و هەموو هەوڵ و تەقەڵلا نائومێدانەکانم تەنیا جەنگێکی خەیاڵی بوو لەگەڵ ئاسیاوێکی هەواییدا.

## * دووشەممە، بیست و شەشی نیسان

بە درێژایی رۆژ برسیم بوو. ئەمجارە خراپتر لە جاری یەکەم. ئەمشەو بانگ کرامە ئۆفیس. دوو خەپە پیاو لە فەرمانگەی رۆژنامەوانی لە "سالامانکا" بەوپەڕی رێزەوە سلاّویان لیّ کردم و نامەیەکی دیکەیان لەلایەن ژنەکەمەوە پێدام. ناوەڕۆکی نامەکە، هەندێك گۆیاتر و روونتر بوو لەنامە یەکەمەکە.

دەنووسیّ :" لە وەیا کە دەرکەوتووە، چەند هاوڕێی زۆرمان هەیە" سەری سوڕماوە و هەر بۆیە " نەك هەر ئومێدەوارە، بەڵکو هەست بە یەقین دەکات کە پێویست بەوە ناکات ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی ئازاد کردنم بم". هیچ گومانی تێدا نییە بڕگەی دوایی نامەکە، هەر تەنیا ئارەزوویەکە لە رووی دڵسۆزییەوە، بەلاّم بڕگەی یەکەم ئەوە دەردەخات کە پرۆگرامێك بە ئاراستەی نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بە دەسگیر کردنم لە جێبەجێکردندایە. نامەکە بە ناویژیوانی " ئۆسقۆف وێست مینیستەر" نێردرابوو "سالامانکا". بەلاّم بە نامەکەوە دیار بوو، سەرەڕای هەموو هەوڵدانەکانی، هاوسەرم نەیتوانیبوو بزانیّ من لە کوێم. دەبیّ فەرمانبەرەکانی "فرانکۆ" چ مەبەستێکیان لە بە شاراوە هێشتنەوەی شوێنی راگرتنمدا هەبووبیّ؟ هۆکارێکی تر بۆ ئەوەی مانگرتنەکەم نەشکێنم. ئەوپەڕی، تا دوو هەفتەی دیکە، دەگۆڕێم بۆ بوونەوەرێکی داماو و ناچار دەبن بمبەنە نەخۆشخانە. ئەو دوو خەپە پیاوەی فەرمانگەی رۆژنامەوانی گوتیان دەتوانم ولاّمێك بۆ نامەکە بنووسم و، بە هەندێك پارێزەوە پێشنیاریان کرد کە دەبیّ بنووسم کە چەندە هەڵسوکەوتیان لەگەڵمدا باش بووە. هەستم دەکرد نامەکە نانێرن و تەنیا هەوڵیان دەدا قسەیەکم لیّ رابکێشن. نووسیم " تا ئێستا لەنێو زینداندا بە رێکوپێکی هەڵسوکەوتم لەگەڵدا کراوە و هیچ سکالاّ و گلەییەکم نییە". نامەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد و بەڵێنیان دا، لە ماوەی هەفتەیەك نامەکە گەیشتبێتە دەستی هاوسەرم. " هەڵبەت هیچ کاتێك نەگەیشت".

## * سێشەممە، بیست و حەوتی نیسان

رۆژێکی باراناوی و درێژ. "کارلۆس" هێشتا لێرەیە. لەو کاتەوە کە پارەمان نەماوە، دوو ئیسپانیاییەکە دەم و چاویان تێك ناوە. بیّ برانەوە مشتو مڕیانە. لە ئەنجامی مانگرتندا منیش گرژ و مۆن ببووم، بەلاّم ئاگام لە کۆنترۆلکردنی هەڵسوکەوتەکانم هەیە.

## * چوارشەممە، بیست وهەشتی نیسان

ئەمڕۆ کونسوڵ هـات. گـوتی حکومـەتی بـەریتانیا بـە شـەوق و سـەرنجێکی دۆسـتانەوە بەدواداچوون بۆ دۆخەکەی من دەکات و فەرمانی پێگەیشتووە ئەوەی لـە دەسـتی دێ دریغـی نەکات. بابەتەکە لە ئەنجوومەنی نوێنەران باسی لێوەکراوە. ژنەکەم ئەرز و ئاسمـانی گەیاندۆتـە یـەك تـا ئـازادیم مسـۆگەر بکـات. وەزارەتـی دەرەوە پرسـیاریان لـە "فرانکـۆ" کـردووە چ تۆمەتێکیان بۆمن تۆمار کردووە، بەڵام "فرانکۆ" بەو بیانووەی کە من هێشتا لە ژێـر رەوتـی لێکۆڵینەوەدام، خۆی لە هەر وەڵامدانەوەیەك دزیوەتەوە. لە ژێـر لێکۆڵینـەوە باشـە. سـەرەتا، بەمن و هەموو دنیا رادەگەیەنن کە دادگای سەربازیی حوکمی مەرگی بەسـەر دا سـەپاندووم. پاشان دەردەکەوێ من هێشتا لە ژێـر لێکۆڵینـەوە دام، تەنانـەت بـۆ یـەکجاریش منیـان بـۆ لێپرسینەوە نەبردووە. نازانم ئەمە چەندی بە چەندە: پێدەچێ کونسـوڵیش سـەری لـەم کێشـمە کێشمە دەرنەچێ، پرسیارم کرد ئایا "فرانکۆ" گرەنتی بـاوەڕ پێکـراوی داوە کـە گوللـە بـاران ناکرێم یان نا. گوتی تا ئەوێ کە ئەو ئاگادار بێ، تا ئێستا وەها گرەنتیەك نـەدراوە. تەنانـەت ناشزانم ئەم گۆڕانە لە ڕێڕەوی نوێی ڕووداوەکاندا، بە لە بەرچاوگرتنی بوونم لەژێر لێکۆڵینەوە دا بە قازانجم دەبێ یان نا. رەنگە بەلای فرانکۆوە ئەم جووڵە و هەرایەی بە هـۆی منـەوە هاتۆتـە کایەوە کارێکی باش نەبێ و دەستە و دایەرەکەی بیانەوێ دادگایکردنێکی رەسمی بهێننـە سـەر شانۆ تاکو " هاودەق لەگەڵ پێودانەکان" حوکمم بەسـەر دا بـدەن. ئـەو بابەتانـەی لـە بـارەی فرۆکەوانە ئەڵمانییەکانەوە بلاوم کردنەوە دەیکەنە بەڵگە کە هەر ئەوە خۆی بۆ حوکمـدان لـە دادگایەکی سەربازیی سەروزیاددیە.

بە کورتییەکەی، هیچ شتێکم لەوە زیاتر دەست نەکەوت کە پێشـتر دەمزانـی. ئـەوەی لـە هەموو شـتێك زیاتر لێی دەترسم ئەوەیە کە نەکا "کنیپۆ" سـەر لە بەری کێشـەکە بگـۆڕێ بـۆ پرسێکی ئابڕوویی یان پرسێکی پەیوەنـدار بـە "فرانکـۆ". وا پێدەچـێ لـە "سـالامانکا" تـا هەنووکە بەرگرییان لەمن کردووە لە بەرامبەر "کنیپۆ" دا. بەڵام من لە "سـیڤیل"م نـەك لـە "سالامانکا".

کونسوڵ بەڵێنی ئەوەی دا هەموو هەفتەیەك سەرم لێ بـدا و هـەرکاتێکیش هـەواڵێك لـە وەزارەتی دەرەوە پێی بگات ئاگادارم بکاتەوە. داوای چەند وردە شتێکی جیاوازم کـرد : پـارە، شـەترەنج، کتێـب_ بـەڵێنی دا ئـەمجارەیان بێتـەوە بیـانهێنێ. نزیکـەی کاتـژمێرێك لـەناو

نووسینگەیەك قسەمان پێکەوە کرد. لەسەر ڕێی گەڕانەوەمدا بۆ ژوورەکەم، بەندیوان، ژووری سەردانە ئاساییەکانی نیشان دام. هۆڵێکی گەورەیە و جۆرێك قەفەزی ئاسنین لە ناوەڕاستەکەیدا هەیە، ئەو زیندانییانەی سەردانیکەریان هەیە، لەسەر ئەرز و لەنێو قەفەزەکەدا چوار چەمکی دادەنیشن. دۆرماندۆری قەفەزەکە، شوێنێکی بەتاڵ و بە قولایی نزیکەی پێنج پێ هەیە، لەو دیوی ئەو شوێنە بەتاڵە، ژنەکانی زیندانییەکان لەسەر زەوی هەڵدەتروشکێنن و لەو دوورەڕا هاوار دەکەن. بەلای کەم هەرجارە و سەد کەسێك لەنێو ژوورەکەدا هەن. سەرم لەوە دەرنەکرد، ئەو ژن و مێردانە لە نێو ئەو هەرا و دەنگە دەنگەدا چۆن گوێبیستی دەنگی یەکدی دەبن. سەردانەکان ماوەی دە خولەك دەکێشێ. هەر زیندانییەك، تەنیا یەك جار لە هەفتەیەکدا سەردانی دەکرێت.

## * پێنج شەممە، بیست و نۆی نیسان

بە درێژایی رۆژ، لەبارەی قسەکانی کونسوڵ، پاڵەپەستۆیەکی زۆرم هێنایە سەر مێشکم. چەندەها چەشن و جۆری گریمانەکانم کردە بنەما بەلام نەگەیشتمە هیچ ئەنجامێك. کاتێك لەنێو حەوشەدا بووین گوێبیستی دەنگی تەقینەوەیەك بووم، لە راستی شاردا هەموو پەنجەرەکانی هەژاندەوە، بینیمان چەند کیلۆمەترێك دوورتر، دووکەڵێکی گەورە بە هێواشی رووە و ئاسمان هەڵکشا.

پاشان لە بەندیوانێکمان زانی کە کارگەیەکی پێلاو، بە هۆکارێکی نادیار، تەقیوەتەوە. هەموو دووسەد کرێکارەکەی ناو کارگەکەش مردوون.

هەر ئەو فالانژیستەی چاویلکەی ژێربالەیی لەچاو دا بوو رووداوەکەی بۆمان گێڕایەوە. راڤەیەکی ئاقلانەشی بۆ رووداوەکە کرد : " دەبینن، دووسەد کەسێك دەبوون_ لێرەش ئەگەر پێنج شەش کەسێك لە ئێوە لەنێو بەرین هەرایەك دەنێنەوە ئەوسەری دیارنەبێ".

ئەوندەیشی خستە سەر ئاخاوتنەکانی و گوتی "دووسبەی یەکی ئایارە و بێ گومان بە شکۆمەندییەوە ئاهەنگ دەگێڕدرێت".

## * هەینی، سیی نیسان

بە درێژایی ئەو ماوەیە، سەرەڕای ئازاری برسێتی و تینوێتی، لەوانەیش خراپتر هەستم دەکرد ناساغ و زۆریش بێچارە و داماوم و، دڵم وەکو تەپڵ لێی دەدا. باران بێ ڕاوەستان دەباری. "کارلۆس" لەوەتەی زانیویەتی "جانی" ئازاد کراوە لە تووڕەییدا شین و مۆر هەڵگەڕاوە _ دوێنێ مانگرتنی لە خواردن ڕاگەیاند بەڵام ئەمڕۆ دەستی کردەوە بە خواردن_ دەیگوت بۆنی قاوە بە شێوەیەك پەڕەکانی لوتیان ختوکە داوە نەیتوانیوە حەزی خۆی بۆ قاوە خواردنەوە کۆنترۆڵ بکات. چەند شەوی ڕابردوو، ئارام تێپەڕی. بەڵام زەندەقی هەموومان لە ڕۆژی یەکی ئایار چووە.

## * شەممە، یەکی ئایار

سوپاس بۆ خوا، شەو هیچ رووی نەدا.

پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ، کاتێ لەنێو حەوشەدا پیاسەمان دەکرد، سەر و بیچمی سێ ئەفسەر لە نێو چوارچێوەی دەروازەکەدا وەدەرکەوت. "کاپیتان بلای" ڕێنمایی دەکرد و بە پەنجە، ئێمەی نیشانیان دەدا و دیار بوو لەبارەی ئێمەوە باسی بۆیان دەکرد. هەستی ئەو ئاژەڵانەمان هەبوو کە لەنێو قەفەزەکانی باخچەی ئاژەڵان دان. ئەفسەرەکان دیقەتیان لە ئێمە گرتبوو، وەك ڕێکپۆشە ماقووڵەکان خۆیان دەنواند و قامچییەکانی دەستیان ئاوها کە، ئێمە ببینین ڕادەوەشاندە سەر چەکمە و پۆتینی سوارکارییان. گەورەترین ئەزموونی سووکایەتی پێکردن بوو لەو دەمیدا بەسەرمدا تێپەڕ دەبوو. سووکایەتی پێکردنەکە، تەنانەت لەو کاتەش گەورەتر بوو کە لە ناوەڕاستی شەقامێکی "مالاگا"دا وێنەیان گرتم.

## *یەکشەممە، دووی ئایار

شەوێکی دیکەی ئارام و بێ دەنگ

زۆر سست و کەمتین بوومە. هەستم کرد حاڵم لەوە خراپترە بتوانم بچمە نێو حەوشە، بە درێژایی ڕۆژ لەسەر قەرەوێڵەکە، پاڵ کەوتبووم. زۆر لاواز بوومە_ لە دەست و قاچەکانم تەنیا پێست و ئێسقانیان ماوەتەوە. وەك مۆمیا کراوەکان. شەو، تینوێتی حەجمانی لێ بڕیم_ هەفتەیەك بوو هیچم نەخواردبۆوە و هەموو ئەو لیترە شەرابەی پاشەکەوتم کردبوو بەیەك جار

خواردمەوە. ئەنجام چی دەبێ با ببێ. بێجگە لەمەیش، ئەمرۆ سی و دوو دانە جگەرەم کێشا. ئەگەر بتوانم ئەم کارە بۆ ماوەیەکی زۆر درێژە پێ بدەم لە داهاتوودا دەتوانم بژێوی ژیانم وەکو " پیاوی مانگرتوو" لە پێشانگایەکدا دابین بکەم.

## * دووشەممە، سێی ئایار

هەموو ئەمڕۆکەم لەنێو پێخەفدا بەڕێ کرد بێجگە لە تەنیا کاتژمێرێکی درەنگانی پاشنیوەڕۆ شەو، "ئاخلیتۆ" بەتانییەکی دیکەی بۆم هێنا لەگەڵ شتێك وەك بالیف وابوو. ناتوانم بخوێنمەوە. وابزانم بە زوویی، تەندروستیم ئاوها خراپ دەبێت ناچار دەبن بمبەنە نەخۆشخانە.

## * سێشەممە، چواری ئایار

شەوی رابردوو، هەشت کەسی دیکەیان گوللە باران کرد.

بەخۆم هیچم نەبیست. ئەمڕۆ لە رێگای ترەوە زانیم. بە درێژایی رۆژ، لەنێو پێخەفدا پاڵ کەوتبووم و خەوە کوتکەم بوو. سێ رۆژە نەچوومەتە حەوشە.

## * چوارشەممە، پێنجی ئایار

درەنگانێکی دوێنێ شەو "کارلۆس"یان گواستەوە ژوورەکەی من. رەشبگیرییەکیتر. زیندان وای لێهاتبوو دەرزیت هەڵاوێشتبا نەدەکەوتە سەر ئەرز. زۆر کەیفساز بووین و تا بەیانی قسە و باسمان کرد. ناچار بووم نهێنیی مانگرتنەکەم بۆ "کارلۆس" بدرکێنم، چونکە دەبینێ خواردنەکەم فرێ دەدەم. لەمەو بەدوا، بەشە خواردنی منیش ئەو دەخوا. ئەم بەیانییە هەردوکمانیان گواستەوە ژووری ژمارە "١٧". کەوتۆتە ئەوبەری راڕەوەکەوە، پەنجەرەکەی رووە و " حەوشە جوانەکە" دەکرێتەوە. کاتێك ئەمڕۆ بۆ یەکەمجار سەیری دەرەوەمان کرد و دیمەنی باخچەی گوڵ و گوڵزار و، دار و درەختی سەوزمان بینی، هەمووی بە بەرچاومانەوە وەك حیکایەت و ئەفسانەی پەرییان وابوو. هەڵبەت گوڵ و دارو درەختەکان هێندە جوان و رازاوە نەبوون بچنە دڵەوە _ " حەوشە جوانەکە" زیاتر لە پارکێکی پشتگوێخراو و وێرانی گەڕەکێکی کرێکار نشین دەچێ_ بەڵام ئەوەیە کە هیچ نەبێ گوڵەکان و دار و درەختەکان رەنگیان پێوەبوو. لە پڕێکا بینیم ئێمە هەموومان لێرە لە دنیایەکدا دەژین کە لە دوو سێبەرە

ڕەنگی ڕەش و خۆڵەمێشی پێك هاتووە. ڕێك وەكو دنیای نێـو فلیمـە ڕەش و سـپییەكان. لـە بەراورد دا: " بینینی حەوشە جوانەكە" هەمان كاریگەری بینینی ئـەو فلیمـە ڕەنگییـەی لـە دەروونی مندا هەبوو، كە بە بینینی یـەكهاوی و یـەكجۆریی فلیمـە ڕەش و سـپییەكان بێـزار بوو‌بێتم. تاقیكردنەوەیەكی بچووكم ئەنجام دا تاكو ببینم ئەوە هەر تەنیا منم كە لـە بەرامبـەر ئەم جۆرە شتانەدا ئەم كاردانەوانەم هەیە یان ئەم پەرچەكردارەی من لەنێو زینداندا هەسـتێكی گشتگیرە و هەمووان وەك منن. وشەیەكم لە هەمبەر ئەو خۆشـی و چـێژەی بینینـی حەوشـە جوانەكە پێی بەخشیبووم، بۆ "كارلۆس" نەدركاند، بەڵام ئەو خۆی گوتی "ئەم دار و درەخت و گوڵانە چـەندە جـوانن" و، خەریكـە بڵـێم وەكـو منـداڵان، لـە كـاتی شاگەشـكەبووندا چـۆن دەستەكانیان پێكدا دەدەن ئەویش وای دەكرد. شتومەك گواستنەوە تێن وهێـزی بـە یـەكجاری تێدا نەهێشتم و خۆم بەسەر قەرەوێڵەكەمدا پان كردەوە وهەناسەم بە زەحمەت دەهات و دەچوو لـە یازدەهـەمین ڕۆژی مانگرتنەكەمـدام. دیـوی دەرەوەی ڕواڵـەتم لـە لاوازی و پەرپووتیـدا شێوەیەكی پێكەنیناوی گرتووە، "كارلۆس"یش هاوڕایە لەگەڵمدا. "jefe" یـە ڕووگرژەكە _ لە دوای خواردنی بەیانی، ژوورەكەی پشكنی و دواجار، بینینی سەر و ڕوخسارم كاریگەری خـۆی كرد و گوتی بیبەنە لای دكتۆر. دكتۆر_ پزیشكێكی سەربازی بە پلەی سەرهەنگ و. پسپۆڕ و شارەزا لە بواری ئاشكرا كردنی فرت و فێڵی بە ئانقەست و خۆ نەخۆش خستن_ پرسـیاری لـێ كردم كێشـەم چـیە. شـتەگەلێكم لـەبارەی هەناسـەتەنگی و دوو چـڵەكانەوەی دڵ پێكـەوەنا. گۆشییەكەی نایە سەر دڵم، گوتی نابێ جگەرە بكێشم و لە بری قاوەیش، دەبێ شـیر بخۆمـەوە، تەواو. "كارلۆس" لەو ئەنجامە هیچە زۆر نائومێد بوو. گوتی ئەمە پێویستی بە مانگرتنێكی بیست و یەك ڕۆژی نەدەكرد و ئەوەی نەدەهێنا. گوتم پشووت درێـژ بـێ، هێشـتا نـەمردووین. هەردووكمان لە بیستنی ئەو ڕستە شوومە نیوەی زراومان ڕژا. لە بەختی باشمانە هـەردووكمان بە یەكەوەین لە ژوورێكدا. بۆیە كەس ناتوانێ ببینێ جگەرە دەكێشم یان نـا. ئێسـتا جگـەرەم كەم كردۆتەوە، ڕۆژی بیست دانە دەكێشم. لەدوای كێشانی هەر جگەرەیەكیش، ماسولكەی دڵ دەكەوتە ڕمبەرمب. زیندانە ئاساییەكانی نێو حەوشە وەك چێشتی مجێور وان. سێ بكوژ، پێنج یا شەش دزی چەكدار، یەكێكیان چەتە و ڕێگرێكـی ڕاسـتەقینە، ئـەوانی تریشـیان دەسـتبڕ و گزیكار و وردە دز. وازی تۆپێن ناكـەن، وەك زیندانییـە سیاسـییەكان پیاسـەی خێـرا ناكـەن، كۆمەڵە مرۆڤێكی لەسەرخۆ و جددین. سووكایەتی بە زیندانە سیاسییەكان دەكەن و بێ ئەوەی تۆسقاڵێك خەم دایانگرێ یان دڵسۆزییان پێوە دیار بـێ بـاس لـە ئیعدامكردنی سیاسـییەكان

دەکەن. ژیانێکی لە بار و ڕێکوپێکیان هەیە، نەخەم و نە خەفەت، زۆریش بێ وەی_ دنیایەکی سادە و ئارام. دەمانتوانی لە پەنجەرەوە، بێ هیچ کەلکەڵە و ترسێك بیاندوێنین، لێرەدا، هیچ سنوورێکی یاساغ بوونی نییە. جەنگیان بە نەفرەت دەکرد_ لەوەتەی جەنگ دەستی پێکردووە بارودۆخی ناو زیندانیش تێکچووە. لەگەڵ مندا زۆر بە میهرو بەزەیین، بەڵام هیچ بایەخێك بە "کارلۆس" نادەن چونکە ئەفسەرە. یەکێکیان پێی گوت : " دە بیخۆ دەی، ئەگەر لە کاولەکەی خۆت دا مابایتەوە و بە جوانی و ئاسودەیی ژیانی خۆت بکردبایە، ئێستایش لەنێو ئەو زیندانەدا نەدەبووی."

## * پێنجشەممە، شەشی نیسان

دوێنێ گڵۆپەکانی ژوورەکەمانیان برد. لەنێو زیندان و لە هەموو "سیڤیل" دا قات و قڕی گڵۆپە. بەندیوانەکە گوتی پێویستی بە گڵۆپەکان هەیە بۆ ژوورەکانی " ئەوانەی سەردانیکردنیان قەدەغەیە و ئەوانەیش کە لە ژێر چاودێریدان". گوتی "ئێوە کوڕگەلی باشن و پێویست بەوە ناکات چاومان بە سەرتانەوە بێت" شووتی چاکیان نابووە بن هەنگڵمانەوە. ئێستا ئیدی لە چینە بەربژێرەکەی نێو گرتوخانەین، بەندیوانەکان، زۆر خۆمانی و دۆستانە، لەبارەی کارەکانیانەوە لەگەڵمان دەدوێن. ئێمە ئەندامی خێزانەکەین. ئەمە، ڕاز و نهێنی سەرکەوتنە لە ژیاندا. ئێستا کە گڵۆپمان نییە، بەختێکی باشمان هەیە کە هەردووکمان پێکەوەین. "کارلۆس" سەرەتا کە کاتژمێر سێ وە ئاگایم هێناو گوتم دەبێ لە ئێستاوە تا کاتی نانخواردنی بەیانی پێکەوە قسە بکەین، تووڕە بوو. بەڵام لەو ساوەی توانیویەتی وەکو من، کاتژمێرە قەیرانی و نائاساییەکان بخەوێ، نزا بۆ من و شێوازەکەی من دەکات. "کارلۆس" هێشتا لە کاتژمێر یەك هەتا سێ دەچێتە حەوشە، ئاڵقەی پەیوەندی منە بە دنیای دەرەوە. لەوەوە دەبیستم کە هەردوو هاوڕێکەی ترمان دایم گرژ و مۆنن و هەڵدەپرووکێنە سەر و گوێلاکی یەکدی. چەندین مانگە وەکو جمکەی شملی براکان بە یەکەوە نووساون : کاتی نووستن، کاتی بێداری و ئەنجامدانی کارە تایبەتییەکان. بەڵام لە سێ شەوی ڕابردوودا کەسێك ئیعدام نەکراوە.

## هەینی، حەوتی ئایار

ئەم بەیانییە، بۆ جاری دووهەم بردمیانەوە لای دکتۆر. هەر وا کە تێمڕادەما سەری دەلەقاند و هەڵدەچوو، چونکە حاڵەت و نیشانەکانی نەخۆشیم، لەگەڵ هیچ یەکێك لەو شێوازە

بە ئانقەست خۆ نەخۆشخستنانەی، ئەو لێیان شارەزا بوو، یەکی نەدەگرتەوە. هەر لـە شـێوەی ولآمدانەوەشم ئەوپەڕی پەست ببوو. هەرجارێ کە دەیپرسی هەست بـە چ جـۆرە نارەحەتییـەك دەکەم دەمگوت حالّم زۆر باشە، لەسەر داوای خۆم نەبووە منیان هێناوەتـە لای ئـەو، نـاتوانێ هیچ کارێکم بۆ بکات، چونکە هیچ دەرمانێك نییە تەنگەنەفەسی و ئازاری سـینگ چارەسـەر بکات. وامدەزانی، بەهۆی ئاسەوارە نکۆڵی لێ نەکراوەکانی باری تەندروستیم، هیچ نەبێ بـە پێی بەرپرسیارێتیەکەی، هەست بە مەترسی دەکات و دەمنێرێتە نەخۆشخانە. لە راستیدا مـن بەم حاڵەمەوە زۆر بە نائاسایی دێمە بەرچـاو_ لـە کەلـەخ و قـاپۆڕە و جومگەیـەکی جـوولآو دەچووم کە لەنێو یەکێك لە فلیم کارتۆنەکانی "ڤالێت دیزنی" هاتبێتمە دەرەوە. کاتێك بـەنێو ڕاڕەوەکەدا بۆلای دکتۆریان دەبردم، هەموان بە نیگایەکی پڕ لە ترسەوە سەیریان دەکردم. بەلآم بەخت لەگەڵ مندا نەبوو. دوای بیرکردنەوەیەکی درێژ، دکتۆر گوتی با سەیرێکی زمانم بکـات. ئەوهەندە سپی بوو دەتگوت لە ئاردم هەڵکێشاوە. لەمەوە، کتوپڕ بیرێك هات بـە مێشـکیدا. بە لەخۆباییبوونی سەرکەوتنەوە بەسەر یاریدەدەرەکەی دا نەڕاندی :

" دەمزانی، کابرای خوێڕی خۆی بە "ئیتێر" کە تراوێکە وەك دەرمانی بێهۆشکردن بـەکار دێ، سڕ دەکات. چۆن بە زەردەخەنەیەکی بە تەوسەوە پرسیارم لێ کرد بە بڕوای ئەو لە کـوێ و چۆن دەتوانم "ئیتێر" وەچنگ بێنم. گوتی بێگومان زیندانە ئاساییەکان بە دزی و قاچاغەوە لە پەنجەرەکەوە دەیگەیەنن. وابزانم داوای فایلەکەی کردبـووم و کێشـەی سـرنجی ژێـر پێسـتەکەی بەرچاو کەوتبوو. هەروەها رەنگە، گۆرەوییە ژنانییەکانیشی بینـیبێ. بـەلآم بابەتەکـە، شـتی خراپتری بەدوا دا داهات. من و "کارلۆس"یان گواستەوە ژووری ژمارە "٣٠" کە پەنجەرەکانی رووە و حەوشە گەورەکە دەکرانەوە. دۆشەك و جلەکانمانیان لەبەریەك هەڵوەشاند تا بزانن هـیچ ئاسەوارێکی "ئیتێر"یان دەست دەکەوێ یان نا. بە دڵنیابوون لە بێتاوانبوونم، وەك نارەزایـەتی دەربڕین، دەستم کرد بە هات و هاوار و "کارلۆس"یش پشتگیری لێکردم.

دواجار، دیمەنێکم لە دەمارگرژبوون و تووڕەیی نمایش کرد، کە بەهۆی دارمـان و وێرانبـوونی ئەعـسابم، تەنیا نیوەی نمایشەکە، قەڵپ و ساختە بوو. نیو دەرزەن بەندیوان، بە راکە راك هـاتن و "jefe"یە رووگرژەکەش لە تووڕەیـیا شین و مۆر هەڵگەڕابوو. بەلآم کەسیان نەیانوێرا تخوونمـان بکەون و دەستمان لێ بدەن. وابزانم ئەمەیش، بەهۆی پشتگیرییەکەی "کارلۆس"ەوە بوو، رۆحی "موسولینی" بە شێوەیەکی نەبیندراو، لەنێو ژوورەکەماندا، دەشەکێتەوە و قۆڵ وباسـکەکانی بۆ پارێزگاریکردن لێمان بەسەرماندا کێشـاوە. چـونکە هیچـیان دەسـت نەکـەوت، پەنجـەرەی

ژوورەکەیان تەختە بەند کرد تاکو ڕێگە لە هاتنە ژوورەوەی بە قاچاغی "ئیتێر" بگرن. ئێستا، بە درێژایی ڕۆژ لەنێو تاریکاییدا دادەنیشین و گۆرانی " لێمانگەڕێن با شادی بکەین"ی قوتابیانی زانکۆی ئەمساوی دەچڕین_ هەردووکمان یەك_ دوو کۆرسێکمان لە زانکۆی ڤیەننا خوێندووە. داوای لێبوردنم لە "کارلۆس" کرد کە ئەویشم گرفتاری هەرا و هۆریاکانی خۆم کردووە. بەڵام ئەو گوتی فلیمەکە، تازە بۆ ئەو گەیشتۆتە شوێنە خۆشەکەی. بێجگە لەوانەیش تا لەگەڵ مندا بێ بەشە خواردنەکەی دەبلە. کاتێك ئەو خواردن دەخوات من سەرم دەخەمە ژێر بەتانییەکەوە تا هیچ نەبیستم و هیچ نەبینم. ئەمڕۆ، سێزدەهەمین ڕۆژی مانگرتنەکەمە. "کارلۆس" نیعمەتێکە. نازانم ئەم چەند ڕۆژەی دوایی ئەگەر لەگەڵ ئەو نەبوایە چۆنم بەڕێ دەکرد. خاچە شکاوێکی دیکەی لە کاغەزی جگەرەو، ئاڵایەکی شۆڕشگێڕەکانی لە مقەبای شقارتەی گیرفانەوە بڕیوە و هەر دووکیانی بەیەکەوە، لە جێی دوگمەی کراسەکەی داوە.

## * شەممە، هەشتی ئایار

بۆ یەکەمینجار بردمیان بۆ لێپرسینەوە. کاتژمێر یەك "کارلۆس" چووبووە حەوشە و منیش لە بێحاڵیدا خەوەکوتکەم دەبردەوە. ئەمە، پێچەوانەی یاسا ئاسنینەکانم بوو لەبارەی خەوتنەوە، بەڵام ئێستا ئەوهەندە بێ تین و لاوازم کە هەروا بە دانیشتنەوە، بێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێ، خەو دەمباتەوە، تەنانەت هەندێجار لە گەرمەی ئاخاوتنمەوە.

کاتژمێر یەك و نیو، لە دەنگی کردنەوەی دەرگای ژوورەکەم واگا هاتمەوە. " venqa_ وەرە". بە دەنگێکی زۆر ڕەسیتر و وشکتر لەوەی ماوەیەك بوو گوێم لە بیستنی ڕاهاتبوو، بانگ کرام. بردمیانە ئۆفیسەکەوە. لەوێ ئەفسەرێك و سکرتێرێکی خێرانووس و یونیفۆرمپۆش سڵاویان وەرنەگرتمەوە و کورسییان بۆم دانەنا بۆ دانیشتن. هۆشم لە پڕێکا هاتەوە سەر خۆم کە ئەمە لێپرسینەوەیەکی سەربازییە. ئەم دیمەنە، ماوەیەکی زۆرە لەبەر چاومدایە. گوتم ناساغم و دەبێ دابنیشم و تا کورسییەکم بۆ نەهێنن وڵامی هیچ پرسیارێکیان نادەمەوە. ئەفسەرەکە شانێکی هەڵتەکاند و فەرمانی دا کورسییەکیان هێنا، فایلێکی قەبە و ئەستوور لە بەڵگەنامە، لە بەردەمی بوو، ئاوەها کە فایلەکەی لێك دەکردەوە توانیم نووسینەکەی سەری بخوێنمەوە، ناوم و، لە نێو دوو کەوانەدا، ئەو تۆمەتەی پێمەوە لکێندرابوو. نووسرابوو:" auxilio de rebelion militar" دەمزانی دادگا سەربازییەکانی "ژەنەراڵ فرانکۆ" لە بەرامبەر تۆمەتی " هاوکاریکردنی ڕاپەڕینی چەکداری" کە لە سەر فایلەکەمدا نووسرابوو، تەنیا یەك سزایان هەیە:

"مەرگ". لەگەڵ ئەوەشدا خەیاڵم ئاسوودە بوو. لەوەیا کە دەستیان لە تۆمەتـە سـیخوڕییەکە هەڵگرتبوو، بەلامەوە ئاماژەیەکی یارمەتیدەر بـوو. لێپرسـینەوەکە نزیکـەی دوو کاتـژمێری خایاند. نزیکەی نیو کاتژمێر لەلایەن لێپرسیارەوە بۆ ئەوە تەرخان کرا کە، ناچـارم بکـات دان بەوە دابنێم کە "نیوز کرونیکل" رۆژنامەیـەکی کۆمۆنیسـتییە. نـەزانیی ئـەو کابرایـە جێـی سەرسوڕمان بوو. هیچ گومانی لەوەدا نەبوو رۆژنامەیەك کە ئەمەکداری خۆی بـۆ حکومـەتی یاسایی ئیسپانیا دەسەلماند، کۆمۆنیستییە. لێپرسینەوە بـە ئاراسـتەی مشـتومڕێکی تونـددا رۆیی. پاشان کاتێك زانی عەیب و عۆزی بەرەڵلا دەبێ نەفەسی پیـسی لێ هات.

پرسـیارەکانی دیکـە، پەیوەنـدی بـە یەکـەم سـەردانم بـۆ سـیڤیل و، سـەفەرکردنم بـۆ "مالاگا"و... حەزم لێ نەبوو بچمە نێو هۆکارە دەروونییەکانی ئەو کەسەی هاندەری مانـەوەم بوو لە "مالاگا". گوتم خۆ "خاتوو هێلینا" پێشتر هەموو ئەو بابەتانەی یادداشت کردووە. لە هەموو گوتەکانمدا رەچاوی راستگۆییم کرد تەنیا لە یەك بابەت دا نەبێ: ولامی ئەو پرسـیارەی کە بابەتەکانی کتێبی یەکەمم لە بارەی ئیسپانیاو لە کوێ بەدەست هێناوە " گوتم" کۆمیتـەی مافەکانی مرۆڤ " و هەندێ رێکخراوی دیکەی لیبراڵ و لایەنگری دەوڵەت، بابەتەکانیان نابووە بەر دەستم، ئەوجا بە پشت بەستن بە نییەتپاکی ئەو رێکخراوانە، ژێر ئـەم وتانـەم واژوو کـرد. سەراوینی درۆ بوو. ئەگەر راسـتیەکەم بگوتبایـە چـەندین کـەس لـەنێو سـنووری دەسـەلاتی شۆرشـگێڕەکان تیادەچـوون. پرسـیاری کـرد: " سـەران و بەرپرسـە شـاراوەکانی بانگەشـە و راگەیاندنی سوورەکان" لە ئینگلتەرا چۆن و چ جۆرە خەڵکانێکن؟ ناوی بیست و پێنج هەتا سی کەسم، لەوانەی ناوەکانیـان لـە بانگهێشـت و بلاوکراوەکـانی کـۆڕ و کۆبوونـەوە گشـتیەکاندا بلاودەکرایەوە، ریز کرد، هەموویان مامۆستایانی زانکۆ و کەسانی ناودار و ناسرا و لە شاسوار و جەنگاوەرانەوە بەسەرێ بوون. کاتێك کە گەیشتمە ناوی پایە بـەرز "خـاتوو نـاتوڵ" ئیـدی رایگرتم و پێی بەس بوو. لە کۆتایی لێپرسینەوەکەدا گوتی : کاتێك بۆ جاری یەکەم لە سنووری دەسەلاتی میللییەکان بووی، دەستگیر نەکرای؟ گوتم " نا". گوتی " زۆر سەیرە". بەم شێوەیە کۆتایی پێ هات. بە رەزامەندییەوە لە ژووری لێپرسینەوە هاتمە دەرێ. سەرەتاکەی ترسـابووم. دەبەنگی لێپرسیارەکە، بڕوابەخۆبوونی بۆ گەڕاندمەوە. هەموو رووداوەکەم بە کەیفسازییەوە بۆ "کارلۆس" گێڕایەوە. گوێگرێکی باش نەبوو، سات بە سات زیاتر هەڵدەچـوو. دواجـار گـوتی لەوە تێناگا دوای ئەوەی زانیومە تاوانی " هاریکاریکردنی راپەڕینی چەکداری"م دراوەتە پـاڵ چۆن دەتوانم ئاوها کۆك و کەیفساز بم، لە کاتێکدا سزای ئەم تاوانە " یەکجار زۆر ترسـناکە".

هەڵبەت ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی ورەم برووخێ و دانیشتمە بەر نووسینی sosێکی بە پەلە بۆ کونسوڵ. یەکەمجار کە کونسوڵ هاتە سەردانیم هێمایەکی مەترسییان وەکو نهێنیی لەنێوان خۆمان دا دیاری کرد. ئەگەر هێڵێکم بە ژێر بەروارەکەدا بکێشایە ئەمە واتای "sos" بوو.

نامەیەك کە هیچ شتێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو نووسیم و هێڵێکم بە ژێر بەروارەکە دا کێشا.

## * یەکشەممە، نۆی ئایار

"کارلۆس" زۆر نیگەرانی منە. دۆرماندۆری ژوورەکە دەسووڕێتەوە و ئاگام لێیە هەر لە ئێستاوە وەك تەرمی مردوویەك دەمبینێ. ئەوەندە زێدەڕۆیی لە ڕێزگرتنم دەکات کەللەیی کردوومە. دایمەن زیاتر حەزم لە پەرستیارێکی دڵرەقتر بووە تا پەرستیارێکی دڵنەرم و بەبەزەیی. بە زەیی پێداهاتنەوە، ڕەنگدانەوەی چارەڕەشی خودی ئادەمیزادەو چارەڕەشییەکە چوار هێندەی تر زیاد دەکات.

## * دووشەممە، دەی ئایار

کونسوڵ هات، ئەویش لەمەیا کە منیان بۆ لێپرسینەوە بردبوو، تا ڕادەیەك شپرزە و شێوا و دەهاتە بەرچاو. هێشتا کارێکی مەحاڵ بوو گرەنتییەك لە "فرانکۆ"وە وەربگرێت کە گوللە بارانم ناکات. گوتی لە ڕاستیدا وا بیرناکاتەوە مەرگی من ئەوەندە بۆ "فرانکۆ" گرینگ و پڕبایەخ بێت ریسکێکی ئەوها بکات وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئینگلتەرا لەخۆی بڕەنجێنێ. بەلاّم ئەمە، جۆرێك دڵنەواییکردنێکی پڕوپووچ بوو. پرسیارم لێ کرد ئایا هیچ ئەگەرێك لە ئارادا هەیە لەگەڵ زیندانییەکی دەوڵەتی ڤالێنسیا ئاڵوگۆڕم پێ بکەن یان نا، بەلاّم ئەو گوتی وا بیرناکاتەوە لە حاڵی حازردا ئاوها ئەگەرێك لە ئارادا هەبێ. لە نێوانی قسەکرنەکانماندا ئاگام لێ بوو بۆ کورتە ماوەیەك هەست بە گێژی و سەرسوڕمان دەکەم و ئیدی لە یادمدا نامێنێ لە نێوانماندا چی گوتراوە. ئەمە، لەدوای مانگرتنێکی پانزە ڕۆژی دا، نابێ شتێکی سەرسوڕهێنەر بێ. بەلاّم بێگومان کاریگەرییەکی نائاساییم بەسەر کونسوڵدا بەجێ هێشتبوو، ئاگاداریش بووم چەند جارێك بە واق وڕماوی و کەمێك تووڕەییەوە سەیری دەکردم. دەرەنجام، لەدوای هەڵسەنگاندن و بێنە و بەردەیەکی زۆر، بڕیارم دا مانگرتنەکەم بشکێنم و دووبارە دەست بە خواردن وخواردنەوە بکەمەوە. ئێستا گرینگترین بابەت لەوەدایە کە لەکاتی دادگاییکردنمدا

هۆش و زەینم بە تەواوی لەسەر خۆم بێ. تەنانەت ئەگەر بێ سودیش بێ، بەلاّم هیچ نەبێ سەر و رووم هەندێك رێكوپێك بێ.

## * سێشەممە، یازدەی ئایار

سەیرە مرۆڤ چەندە خێرا، کە دەست دەکاتەوە بە خواردن، هێز و توانایەکی بۆ دەگەڕێتەوە. بۆ یەکەمجار لەم هەفتەیەدا چوومە حەوشە. دوو ئیسپانیاییەکە بە بینینی قەلاّفەت و سەروسەکوتم واقیان وڕمابوو. دوێنێ لە "کارلۆس"یان پرسی بوو کە بەم زووانە دادگایی دەکرێم و بەخۆشی دەربڕینێکی ساختەوە، خۆشحالّی خۆیان دەربڕیبوو. گوتیان ئەوەی بەرامبەر بە من دەکرێت هەمان ئەو سزایە دەبێت کە دەهەمبەر ئەوان دەرچووە، _ حوکمی مەرگم بەسەر دا دەدەن بەلاّم گوللە بارانم ناکەن_ گوتیان ئێستا، کە دادگای سەربازی پێشتر حوکمی گوللە بارانکردنی داوم و جێبەجێیان نەکردووە، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا دەبێتە پارێزگارییەك بۆ من لە بەرامبەر حوکمی دووهەمدا. وەك ڤاکسینی دژە پەتا وایە. لە درێژایی ئەو ماوەی قسەیان دەکرد نەمدەتوانی پێش بە خۆم بگرم لە بیرکردنەوەی ئەوەی خودی ئێمە رۆژێك بەر لە ئیعدامکردنی "نیکۆلاس" چۆنمان قسەکردبوو. بە سەرسوڕمانەوە ئەوەم بۆ روون دەبێتە کە لەم هەفتانەی دواییدا چەندە خۆم بەدوور لە مەترسی هەست پێ کردووە. ئێستا سەرلەنوێ فالّگرتنەوەکان دەست پێ دەکاتەوە و سەما وەسواسییەکانی سەر بەردەکان: ئەگەر قاچم نەکەوێتە سەر هێلّی جەمسەری نێوان بەردەکانی ناو مالّی ژوورەکەم، ئەوا بە دلّی من دەبێ، بەلاّم ئەگەر قاچم بکەوێتە سەر هێلّ.....

تەنانەت بە پێی بنەماکانی رەشترین و تاریکترین ئایینەکانی رەبەنایەتیش دا شتێکی وا لە ئارادا نییە کە حوکمی ئەوە بەسەر مرۆڤ دا بدەن تەحەمولی ماوەی بەرزەخ بکات و سەر لە نوێ بیگەڕێننەوە نێو دۆزەخ.

## * چوارشەممە، دوانزەی ئایار

دە خولەك دەبێ پێیان راگەیاندم شتومەکم کۆبکەمەوە چونکە دەیانەوێ ئازادم بکەن. فلّچەی دان شۆرینەکەم خستە گیرفانمەوە.
"کارلۆس" لە دەرێ، لە حەوشەدایە.

# ٢٠

ئەمە چیرۆکێکە چڵەپۆپەی نییە.

چەندەها ڕۆژی بەدوای یەکدا، لە چاوەڕوانی ڕووخانی "مالاگا" وەك دوا دیمەنی شانۆگەرییە تراژیدییەکەدا ماینەوە. کاتێکیش "مالاگا" ڕووخا هەر ئاگایشمان لێ نەبوو. بە درێژایی دوو مانگی زیندانیبوونم لە ژوورێکی تاکە کەسیدا لە "سیڤیل" سەیری ئەو زیندانییانەم کرد کە لەنێو حەوشەکەدا یاری تۆپێنیان دەکرد  و نەمدەزانی شەویش کە دادێ، ئیعدام دەکرێن. دووجار، بەسەر یەکەوە بۆ ماوەی بیست و شەش ڕۆژ، خۆم بە برسێتی و تینوێتی ئەشکەنجەدا، ئەو ئامانجەیش کە هەوڵی پێگەیشتنیم دەدا، هەرجارە و بەهۆی هەلومەرجێکی چاوەڕواننەکراو دا هەموو کۆششەکانم مایە پووچ دەمایەوە. ئەوانەی کە ئەو شەڕە بێدەنگم لە دژیاندا بەرپا کرد، تەنانەت ئاگایشیان لێ نەبوو. مەرگ بە هەنگاوە سووکەکانی ڕاڕەوەکەی دەتەنی، بە سەمای پێ، ئەم دەرگاو ئەو دەرگای کوتاو، سەمای کرد و سوڕی دا. ئەو کاتانەی چەندەها کیلۆمەتر لەمنەوە دوور بوو، هەستم بە هەناسەی دەکرد لەسەر ڕووخسارمدا، ئەو کاتانەی بە دیار قەرەوێڵەکەمەوە چەمابۆوە من خەوم لێ کەوت و خەونم بینی. ئەم چیرۆکە، چیرۆکێکی تێکەڵ و پێکەڵە، بێ ئەوەی هێڵ و ڕەوتێکی دیاریکراوی هەبێ، بێ ترۆپك و بێ نشێوی. یاریزانانی بالێ، ئاوها کە گونجاوە، لە کۆتایی نمایشەکەدا لە یەك شوێن کۆ نەبوونەتەوە، ئەوان بە پەرش و بڵاوی، لێرە، لەوێ و لە هەر شوێنێکی ئەم گەردوونەدا کەوتوون. شەوان، زۆر جار وە ئاگا دێم وا دەزانم هێشتا لەناو ژووری ژمارە "٤١" دام و ئەوە "ڕووباری تایمز" نییە کە لە "شیپێرتۆن" و میدیلیزیکس بەبەر

پەنجەرەکەمدا دەڕوا. ئەوە هێڵە سپییە یاساغەکەی نێو حەوشە گەورەو تاریکەکەی نێو زیندانە. لەمەیش زیاتر، لە خەوما دەبینم کە دەبێ بگەڕێمەوە ژووری "٤١" چونکە شتێکم لەوێ جێهێشتووە. وا بیر دەکەمەوە دەزانم ئەو شتەی جێم هێشتووە چییە بەڵام لەمە ئاڵۆزترە بتوانم شی بکەمەوە. نۆتەکانی کەرە ناکەی کپبوونی نێو حەوشەکە هێشتا لەنێو گوێچکەکانمدا دەزرینگێتەوە. تازە سەر لە ئێوارەیە و بە زوویی شەو دادێ. لەم وڵاتەدا هەر کە هەتاو نەما، تاریکایی باڵ دەکێشێ. لە زمانی ئەو دا وشەیەك بەناوی " ئێوارە" بوونی نییە. مەودای کورتی تاریك و روونی دنیا، کە شوێنی ئێوارە دەگرێتەوە، ئاوها کە لێرە هەیە، ژاکانی لەسەرەخۆی ڕۆژ نییە، بەڵکو سەرەتای شەوە. لەم مەودا کورتە دا، کاتێك سێبەرەکان بە چوستی لە راستایی دیوارەکانەوە شۆڕ دەبنەوە و حەوشە لەنێو تاریکیدا نغرۆ دەکەن، کەرەنای بێدەنگی و کپبوون لێدەدرێ. ئەو کاتەی زوڕناچی، کەرەناکەی لێدەدا، هەموو شتێك لەنێو حەوشەدا کوژاوەتەوە، زیندانییەکان بە ریزبەستنی چوارگۆشە ، بە ریزەوە، رادەوەستن. هێڵگەلێکی تیژ و زبر، کە شوێن پێی رەنج بەسەر رووخسارییانەوە، لە نێو رۆشنایی قورقوشمئاسای تاریك وروونی دنیا نەرم و هێدی لێ دێ. زۆربەیان بە دەمی کراوەوە، گوێ بۆ دەنگی زوڕناچییەکە رادەدێرن، ئەمە، تەنیا مۆسیقایەکە ئەوان گوێبیستی دەبن. دوا بڕگەی نۆتەی زوڕناچی، بۆ ماوەیەك لەنێو هەوادا درێژە بە لەرینەوەی خۆی دەدا. هەتا ئەو دوا نۆتەیە نابووت نەبووە، ریزی بەرێز وەستاوی پیاوەکان تێك ناچێ. بەندیوان ملەقوتە دەکات و گوێقولاخ دەبێ تا بزانێ ئەگەر ئەو دوا نۆتە لاوازە هەڵواسراوە لە نێو هەوادا براو دەنگی نەما، تا ئەو دەنگ لە فیکەکەیەوە بهێنێ.

ریزی چوارگۆشەکە، بە فەرمانێك بەلای راست دا وەردەسووڕێ، فیکەی دووەم و، ریزەکە دەبێتەوە چوار چوار بەسەر هێڵێکدا رادەوەستن. پێنج خولەکیتر، حەوشە تاریك وچۆڵ و هۆڵە. ناوە ناوە پشیلەکان بەدەم ئازارەوە دەمیاوێنن. کاتێك باران دەبارێ وێنەی ئەستێرەکان دەکەوێتە ناو قۆرتە پڕ ئاوەکان. لە شەوانی مانگە شەودا دیوارەکان و وردە چەگلەکان لە سپیاتی دا وەك گەچیان لێ دێ و، پەنجەرەکانیش ژوورەکانیش وەکو گۆڕگەلێکی رەش، باوێشکیان دێتەوە و ناڵە و مرخە دەردەدەن. میکانیزمێکی سەیر لەنێو هەریەکێك لە ئێمەدا دانراوە. کە جوانی و خەیاڵ دەبەخشێ بە رابردوو، زاکیرە، رەنگ دەبەخشێ بە فلیمی ئەزموونەکانی رابردوو. ئەم رەنگ پڕاندنە بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی ئەنجام دەدرێ و رەنگەکان تێکەڵ وپێکەڵ دەبن. لەوانەیە هەر ئەمە هۆکاری ئەو هەموو جوانیی و قەشەنگییە بێت. زۆرجاران کە شەوان واگا دێمەوە، هەست دەکەم غەریبی ژوورە تاکە کەسییەکەم، لە نێو ماڵی مردوواندا لە "سیڤیل" دەکەم و سەیر لێرەدایە وا هەست دەکەم قەت هێندەی ئەوسا کە

لەوێ بووم، ئازاد نەبوومە. لە راستیدا هەستێکی سەیرە. ئێمە، ژیانێکی نائاسایمان لەو حەوشەدا هەبوو. نزیکبوونی بەردەوامی مەرگ لێمان، قورسایی خستبووە سەر ژیانمان و لەهەمان کاتیشدا قورسایی لەسەر ژیانمان لادەبرد. زۆربەمان ترسمان لە مەرگ نەبوو، ترسەکەمان تەنیا لە خودی کرداری مردنەکە بوو. جاری وا هەبوو تەنانەت بەسەر ئەو ترسەیشدا زاڵ دەبووین. لە ئاوها کات و ساتێك دا ئێمە ئازاد بووین. پیاوگەلێکی بێ سێبەر بووین. پیاوگەلێك لە دەرەوەی بازنەی لەنێوچووەکان. ئەمە، پوختەترین ئەزموونی ئازادی بوو کە بتوانرێت پێشکەش بە مرۆڤێك بکرێت. ئەوها ساتگەلێك دووبارە نابنەوە، کاتێك ئادەمیزاد جارێکی دیکە بۆ ناو بازنەی بێزارکەری ژیان دەگەڕێتەوە، تەنیا شتێك کە دەمێنێتەوە، ئەو هەستەیە کەوا، شتێکی لە ژووری ژمارە "٤١" جێ هێشتووە.

ئەو پارتیزانانەی نێو حەوشە گەورەکە، لە هونەری جەنگدا، نە شارەزا بوون. لەگەڵ ئەوەیدا شەڕیان لەبەرە و سەنگەرەکاندا بە چاوەکانی خۆیان بینیبوو هێشتا باوەڕیان بە موعجیزە هەبوو. هەر رۆژەو هەواڵگەلێکی نوێی سەرکەوتن زار بە زار دەگەڕا، ئەمڕۆ " تۆ لە دوو" ئازاد کرابۆوە و سبەی "کۆردوبا" یان " ڤیتۆریا" هیچ کاتێك نەمتوانی سەرچاوەی ئەم پڕوپاگەندانە بدۆزمەوە. لەنێو زینداندا زار بە زار دەگەڕا، لە شێوەی یاداشتەکاندا لە پەنجەرەکانەوە فڕێ دەدرانە خوارەوە، لەنێو ڕاڕەوەکاندا بە فسکە فسك دەگوازرانەوە. دەبێ کەسێك لەنێو زینداندا هەبووبێ بە ئانقەست، ئەم حیکایەتانەی سەرکەوتنی لە خۆیەوە دروست کردبێ؟ ئایا ئەوانەی ئەو پڕوپاگەندانەیان بڵاودەکردەوە باوەڕیان بە راستبوونەکەی هەبوو، یان وایان خۆ دەردەخست کە باوەڕیان پێ هەیە؟ منداڵان، هەندێجار لە بەرامبەر ئاوێنەدا دەوەستن و خۆیان چیڕدەکەنەوە و روو بادەدەن بۆ ئەوەی خۆیان بترسێنن. ئەو زیندانییانە پێچەوانەی ئەمەیان دەکرد. لە خۆشەویستی دەربڕین بۆ یەکدی قرچۆك و بەرچاو تەنگ بوون، بێ سۆز و هەندێجار بێ بەزەییش بوون. بەڵام پەڕ و باڵیان دەبەخشی بە ئومێدەکانی یەکتری. چونکە لە توانایاندا نەبوو تەحەمولی ئەوە بکەن کە بەبێ ئومێدی لە ڕێگای گەیشتن بە ئارمانجێکی ونبوودا بمرن. ئەمڕۆ "تۆلەدوو" دەڕوخا، سبەی "بۆرگس و سیڤیل" ئەوەندە درۆیان لەگەڵ خۆیان دا دەکرد هەتا مەرگ دەهات و دەیانپێچایەوە. وەك ئەو منداڵانەی ئەوەندە دەگریێن هەتا خەو دێت و دەیانباتەوە. تەنیا یەك هەواڵی راست و باوەڕ پێکراویان هەبوو. هەریەکێك لەو هەزار و سێسەد پیاوەی لە نێو زینداندا بوون، دەیزانی شەوی رابردوو چەند کەس گوللە باران کراوە. زیندانییە ئاساییەکانی نێو " حەوشە جوانەکە" نزیکەی هەموویان خەڵکێکی

ناحەز و دڵنەخواز بوون. هەرچەندە قژی سەریان لە پێشترا نەتراشرا بوو، هەرچەندە یەك جۆر پۆشاکیان لەبەر دانەبوو، بەڵام بە شێوەیەکی سەیر وێکدەچوون. وێکچوونیان لە وێکچوونی ژن و مێردە بە ساڵاچووەکان و، وێکچوونی خزمەتکارە کۆنەکان بە خاوەنەکانیان دەچوو. من تەنیا سێ مانگ لە زیندان دا بووم، بەڵام هەر ئەو ماوەیە بەس بوو کە، وێنایەکم لە هێزی ئەو رەوتە هاورەنگبوونە خۆپارێزییە پێ بدات. لەرۆژی یەکەمەوە هەستم دەکرد کە بارودۆخی تازەم پێویستی بە مامەڵەکردن و هەڵسوکەوتێکی تایبەت و جیاواز هەیە لەلایەن منەوە، جاری یەکەمیش کە بەندیوان گەسکەکەی دایە دەستم، بێ ئەوەی بیرکردنەوەی هۆشیارانە و پێشوەختە لە ئارادا هەبووبێ، خۆم زۆر بە حۆل و دەبەنگی خستە بەرچاوان، هەرچەندە لە هەموو ماوەی ساڵە درێژەکانی زگوردێتی شارەزاییەکی زۆر باشم لە بەکارهێنانی گەسك پەیدا کردبوو. ئەو رۆڵەی دەبوایە لە نێو زینداندا بگێرم_ رۆڵی گێژ و ورێکی زگماکی_ بوو کە لە ناکاو لە دەروونمدا سەری هەڵداو دواتر، هێدی هێدی لە ماوەی هەفتە و مانگەکانی پاشتر، گۆرا بە ماسکێك بەسەر رووخسارمدا و پێویستی بە هیچ گوشار خستنە سەر خۆم یان هەوڵێکی بە ئاگایانە نەبوو تا خۆم بە گێژی بنوێنم. بەم شێوەیە دەمتوانی ئەمە بەسەر نموونەیەکی زیندوودا بە چاوی خۆم ببینم کە ئەم رەوتە هاورەنگبوونە خۆپارێزییە چ هێزێکی زیندەوەرزانی راستەوخۆ دەسەپێنێ. تاوانبار یان بێتاوان، زیندانیی رەنگ و شێواز دەگۆرێ. خۆی بە شێوازێك دەنوێنێ کە ئاسانتر لە هەمووان بتوانێ هەرەزۆری ئەو دەسکەوتە حەیوانییەی کە دەکرێ لەناو چوارچێوەی دام و دەزگای زینداندا وە چەنگ بێت، بۆخۆی دابین بکات_ لە دنیای دەرەوەدا، کە لە نێو زینداندا تا ئاستی خەونێك کاڵ دەبێتەوە، هەموو ململانێکان و هەوڵ و کۆششەکان بۆ پلە و پایە و ناوبانگ و دەسەڵات و ژن چڕ دەبنەوە. بۆ زیندانییەك، ئەوانە شەڕی پاڵەوانە ئۆلەمپیاییەکانی نیمچە خوایەکانە. لێرە، لەناو چوار دیوارییەکەی زینداندا، ململانێکان و هەوڵ و کۆششەکان بۆ وەدەست هێنانی جگەرەیەك، وەرگرتنی مۆڵەتێك بۆ وەرزشکردن لە نێو حەوشەدا، یان بۆ هەبوونی قەڵەمدارێکە. ئەمە ململانێکردن و هەوڵدانە بۆ وردە شتی بێ بایەخ، بەڵام وەکو هەر ململانێکردن و هەوڵدانێکی ترە لە پێناو زیندوومانەوە. بەو جیاوازییە کە لە نێو زینداندا تەنیا یەك جۆری چەك هەیە: فرت و فێڵ و دوو روویی کە، گەیشتۆتە ئاستی کردارێك بۆ رەنگدانەوە. ئەو، واتە زیندانیی، لە هەموو هۆکارەکانی دیکە بێبەش کراوە. هەستی بیستن و هەستی پێدامالینی مرۆڤ کە کوێر

بۆتەوە، بەهێز دەبێتەوە، بۆ زیندانییەکیش تەنیا یەك ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی پەرە بە لێهاتوویی خۆی بدات_ ڕێگای هەرچی زیاتر فرت و فێڵ کردن.

لە نێو فەزای گەرمخانەی ژینگە کۆمەڵایەتییەکەیدا ناتوانێ خۆی لەو قەدەر و چارەنووسە بدزێتەوە کە، دەبێتە بەشێك لە کەسایەتییەکەی. هەست دەکات چرنووکەکانی هەڵدەستنەوە. نیگایەکی دزراو و مردوو، نیگایەکی دزێو و خولامناسا دەخزێتە نێو چاوەکانی. لێوەکانی باریك و تیژ و فێڵباز، لووتی باریك و درێژ، پەرەکانی کەپووی فش و هەڵبزرکا و، ئەژنۆکانی چەمایەوە و، قۆڵ و باسکەکانی وەك هی مەیموونی گورێللا درێژ و شۆڕەوەبووی لێ دێ. ئەوانەی کە لایەنگری تیۆری ڕەسەنایەتی ڕەزن و حاشا لە کاریگەریی ژینگە بەسەر شێواز وەرگرتنی جەستەی مرۆڤدا دەکەن، دەبێ یەك ساڵ لە زینداندا بمێننەوە و ڕۆژانە سەیرێکی خۆیان بکەن لە نێو ئاوێنە دا.

ماوەیەکی زۆر، بەر لەوەی ئیسپانیا بناسم، مەرگ لە ڕوانگەی منەوە شێوەی پیاوێکی ئیسپانیایی هەبوو. شێوەی یەکێك لە سینیۆرە ماقووڵەکان، کە " فۆلاسکێس" لە تابلۆکەیدا ئەو پیاوەی بە نیوە شەرواڵێکی ئاوریشمی ڕەش، ملکەی پان و لۆچداری ئیسپانیایی و، نیگایەکی زەق و سارد و گوێ پێنەدەر و بەرێز نیگارکێش کردووە. ئەو، کاتێك "نیکۆلاس"یان بەو ریشە نەتراشاوەیەوە ئیعدام کرد، دیارە تووڕەیی و پەستییەکەی بە ڕادەیەکی زۆر وروژێندرا بوو. ئەو، گۆڕاو و ڕەنجاو، ڕوخساری پارتیزانە چکۆلەکە بەو ماسکە زۆر گران و سەنگین و پتەوییەوە، کە گونجاوی ڕێ و ڕەسمەکانی دەربارێتی، دادەپۆشێ. ئێمەومانان، هەزار و سێسەد کەس بووین، دەربارییەکانی ئەو لە ماڵە مردووەکانی "سیڤیل". هیچ قەرەوڵ و پاسەوانێکی شنێلپۆش، هاتنە ژووری سینیۆرە ماقووڵەکەی ڕانەگەیاند، پلەی چاووشی لە ئەستۆی قەشە وردیلە گۆشتالووەکە دابوو و ناساندنی میوانانی تازە بە چرپەیەکی شاراوە ئەنجام دەدرا. یەك دوو جارێك کەوتینە بەرامبەر یەکدی. تەنیا بەسەر پەنجەکانی تەوقەی لەگەڵدا کردم و لەژێر لێوییەوە گوتی " چۆنی؟ پاشان دەتبینمەوە" و تێپەڕی، قەشە وردیلەش بە دوایدا بوو، زەنگۆلەکەی لە هەوادا دەشەکاندەوە. بەڵێنەکەی بیرنەما و نەگەڕایەوە، بەڵام من نەمتوانی ئەو بەڵێنە لە بیر بکەم، هەموو ماوەکە هەر لە بیرم دابوو _ هەڵسان و دانیشتن لەگەڵ پیاوە گەورەکاندا هەمیشە هەر وا بووە. ئێمە، هەزار و سێسەد کەس لە دەربارییەکانی سینیۆری گەورە بووین، وەکو گوندییان هەڵسوکەوتمان دەکرد. گوندییە ساویلکەکان، بەتایبەتیش ئەو داماو و بێکەسانە، بەو هەڵسوکەوتە نەبار و نەپۆرەیان، لە نێو حاڵ و هەوای نەرم و نیانی دەربارادا، جوان خۆیان دەرنەخست. ئەوان، لە پێشدا خۆیان بە لۆبیا دەئاخنی و بە ورگی پڕەوە

لەبە چاوانی سینیۆر دەردەکەوتن. کاتێك بە رووی سارد و پڕ لە بێزاریی ئەودا دەتەقینەوە، لە ترسا دەیانقیژاند و هاواریان لێ هەڵدەستا و بانگی دایکیانیان دەکرد. ئەوان رەچاوی نەریت و هەڵسوکەوتی دەربارەیان نەدەکرد، پرسیاری گەوجانەیان دەکرد وەك بۆ و لەبەرچی، ئەوان بە رادەیەك خۆیان لە بیر دەچۆوە بە کابرا گۆشتاڵووە رەشپۆشەکەی زەنگوڵی بە دەستەوە بوو دەگوت قەشمەر و گاڵتەجاڕ. هەندێکیان ئاوازە فۆلکلۆرییەکانیان دەچڕیی، ئاوازەکانیان بە دەنگی گڕ ونەشاز دەچڕی و، چونکە لە گەڵیدا دەشگریان، وەکو قریشك هاتنەوە دەکەوتە بەر گوێ، تەنانەت کاتێك دۆخە گشتییەکە کۆتایی پێ دەهات و ماسکە بێ رووخسار و باوەکە، دەکەوتە سەر سیمایان، کاریگەرییەکی دڵخوازیان نەدەبوو. حاڵ و هەواکە بۆ ئەوانیتر لەبار نەبوو. ئەمینداری کتێبخانەکەی دەربار بۆخۆی رێورەسمێکی کاغە بازییانەی هەبوو، ئەفسەرەکە، نائاساییترین هەستە سۆزدارییەکانی بۆ خەڵکە "سوور"ەکە دەردەبڕی، پیاوی واقیعگەرا بوو بە رەوشتگەرا. دوو هاوڕێ کە چەندین مانگ بە یەکەوە چاوەڕێی دیتنەوەی بارێك بوون، لە بەردەم دەرگای ژووری پێڵاو داکەنانی سینیۆردا، مشتومڕیان بوو، کاتێك یەکێکیتر لە حەژمەتی رەنج وئازاردا خۆی دەگەوزاند، هەموان روویان لێ وەردەگێڕا، گاڵتە و تڕانەیان بەو گێل و نەفامە دەکرد و، خۆیشیان لەوانە نەبان دەکرد کە لەسەر لێواری مەرگدا بوون. ئەو کابرا زەنگوڵە بە دەستە، رۆڵە و جێگرەوە هیچ و پووچەکەی باپیرە گەورەکانی، سەخمەرات تێپەڕبوون لەو گێژاوی ئەزموونەی لە پێشماندا بوو وتارییژی دەکرد. کەچی لەو گێژاوەی ئەزموونە دەرنەچووین، بەڵام سووچی ئێمە نەبوو. کاتێك دەلەرزین ولە چاوەڕوانیی بارە گشتییەکەدا بووین، هەموومان پرسیارمان لە خۆمان دەکرد، لە پێناو سەرکەوتن و گەورەیی کێ بوو کە ئێمە دەبوایە ئاوها لە نێو رەنج و ئەشکەنجە دا بهێڵدرێینەوە، بە شێوەیەکی گشتی، چی واتایەکی ئاشکرا یان شاراوە لە پشتەوەی ئەو هەمووە دا هەبوو؟ گوندییەکان ئەمەیان بە زمانی خۆیان لە خۆیان دەپرسی، ئەفسەرەکە بە زمانی خۆی، پیاوە واقیعگەرەکەش بە زمانی خۆی. ئێمە مێشکی خۆمان بەم پرسیارەوە هیلاك کرد هەتاکو بەشە خۆڵەمێشییەکەی مێشك پەڵماو خوێن و فرمێسکی دەردا. هیچ یەکێك لە ئێمە وڵامی پرسیارەکەی نەدەزانی و، کەمتریش لە هەموان، خزمەتکارە گۆشتاڵووەکەی سینیۆر، ئەو پیاوەی کە دەنگە دەنگی بە زەنگوڵەکەیەوە دەخست.

# ٢١

لە مەودای نێوان خەوی پاشنیوەڕۆ و خواردنی ئێوارە، دەرگای ژوورەکەم کرایەوە و، ئازادی وەکو گورزێك بەرە و رووم فڕێ درا. حەپەسابووم و، سەر لەنوێ خزابوومەوە باوەشی ژیان، رێك ئاوها کە ئەگەر رووداوەکان بە رەوتێکی تردا بچووبانایە دەخزامە باوەشی مەرگەوە. هەر ئەوەی کە لە نێو ڕاڕەوەکەدا وێستام لە تەوقی سەرم تا پەنجەکانی پێم کەوتە لەرزینەوە. هەژانێك بەسەرمدا زاڵ بوو هەمووو دەمارەکانمی وێك هێنا و گرژ کرد، وەکو ئەو شەوەی یەکێك لە دەرەوەی ژوورەکەمدا داوای یارمەتی کردبوو. هەموو ئەو شتانەی لە ساتەکانی دواتر دا روویان دا، لە نێو زەینمدا بە سستی و لێڵی ماونەتەوە، هێڵە سەرەکییەکانی تاریك و نادیارن، دەڵێی لەودیو تەمێکی خەستدان. گڵۆپێکی بێ تۆقڵە بەسەر مێزی بەڕێوەبەری زیندانەوە داگیرساوە. کەوانەیەك لە رۆشنایی بە دەوری گڵۆپەکەدا دەلەرێتەوە، وەك ئەو کەوانەیەی کە لە نێویدا، مرۆڤ گڵۆپ و چراکانی لێواری شەقامەکان دەبینێ کە، لە نێو تەمێکی شەوانەدا دەتریسکێنەوە. بێگانەیەك لەسەر کورسییەکەی بەڕێوەبەری زیندان دانیشتووە. کراسێکی رەشی لەبەر دایە و بۆینباخی نەبەستووە. زۆر رەسمییانە و بە زێدەڕۆییەوە خۆی بۆم چەماندەوە. پیاوە کراسڕەشەکە دەڵێت: " سینیۆر، من لێرە دەتانبەمە دەرێ.. بۆ ئەوەی نەکەوم جارێکیتر دەبێ پاڵ بە مێزەکەوە بدەم، هەست دەکەم

سەرم گێژ دەبێ و لە نێو "تا"دا دەسووتیم. گەڕانەوەیەکی بە ئیشتیهاوە بـۆ خـواردن لـەپاش مانگرتنێکی درێژ ، بە تەواوی وەزعی ناو هەناومی ئالۆسـکاندووە.

پیاوە کراسڕەشەکە دەڵێت: " سینیۆر، ناتوانم پێتان بڵێم بۆ کوێتان دەبەم، بەلاّم مەترسـە، ئێمە خەڵکێکی ماقووڵین".

بە درێژایی ڕاڕەوەکە دا دەڕۆین، نازنم چیم لەگەڵدا دەکەن، دەڵێـی لـە خـەودا بـە ڕێگـاوە دەچم. دەگەڕێینەوە ژوورەکەم، دەستی "کارلۆس" دەگوشم، ئەویش وەك من حەپەساوە و واقی ورماوە، بەر لەوەی بتوانین یەك قسـە بـە یەکـەوە بکـەین دەرگـا، لێکـدیمان جیـا دەکاتـەوە، جارێکیتر بە درێژایی ڕاڕەوەکـە دەڕۆینـەوە، لاپـەڕە پەرتـەوازەکانی یاداشـتەکانم لـە گیرفـانم بەردەبنەوە. کابرای کراسڕەش یارمـەتیم دەدات کۆیـان بکەینـەوە: " چـییان تێـدا نووسـراوە سینیۆر؟" لە سـەرەوەی هەموو کاغەزەکاندا نامەکـەی هاوسـەرمە، کـە مـۆری فەرمانگـەی چاودێری و سانسۆری بە سەرەوەیە. بـە چرپەیەکەوە دەڵـێم " نامـەی تایبـەتین". دەڵێـت :" دەتوانی هەڵیانگری سینیۆر، ئێمە خەڵکێکی ماقووڵین". سەر لە نوێ لە نێو ڕاڕەوەکەدا درێژە بە ڕۆیشتنمان دەدەینەوە. من لەگەڵ "ئانخێل" و "مانوئێل"ی شل و خـاو و "دۆن رامـۆن" و "دۆن ئانتۆنیۆ" تەوقە دەکەم. پاشان دەگەڕێینەوە ناو ئۆفیسەکە.

کابرای کراسڕەش دەڵێـت :" ئێسـتا ئێمـە بـۆ شـارێکی دیکـە دەچـین سـینیۆر، ئەگـەر ئامادەییت تێدا هەیە هەندێ بـەڵێنم بـدەیتێ، ڕەنگـە بتـوانم هـەوڵێك بـدەم و ئازادییـەکـەت مسـۆگەر بکەم".

دەست بەرەو قەڵەم و مەرەکەب درێژ دەکات. کاتێك قەڵەم و مەرەکەب دەبینم لە پڕێکا وە ئاگا دێمەوە. دەڵێم :" بەڕێزم، هەموو ئەو ڕووداوانە زۆر سەیر و زۆر کتوپڕ روو دەدەن. ئێـوە کێن؟ ئەو شارەی بۆ ئەوێم دەبەیت لە کوێیە؟ ئەو بەڵێنانەش کە دەبێ بیدەم چین؟".

گوتی :" وا بەباش دەزانم ناوەکەمت پێ نەڵێم سینیۆر، بەلاّم ئێمـە خـەڵکێکی مـاقووڵین، دەتوانی پشتمان پێ ببەستی. ئێمە تەنیا دەمانەوێ بەڵێنی ئەوەمان پێ بدەیت چیدی خۆت لە کاروباری ئیسپانیا هەڵنەقورتێنی. ئەگەر ئەو بەڵێنە بدەیت دەتوانم هەوڵت بۆ بدەم و ئازادیـت مسـۆگەر بکەم".

گوتم :" من هیچ کاتێك خۆم لە کاروبارەکانی ئیسپانیا دا هەڵنەقورتاندووە".

گوتی:" تۆ خۆت تێکەڵ بە خەباتێکی خیانەتکارانەی دژی ئیسپانیای میللی کردووە".

گوتم :" من هەر شتێکم دیتبا و هەر بۆچوونێکم هەمبەر بە بینراوەکانم هەبوایە دەمنووسی. من هیچ کاتێك دەخاڵەتم لە کاروباری نێوخۆیی ئیسپانیادا نەکردووە".

گوتی :" نامەوێ لەگەڵ تۆ دەمدەمانێ بکەم سینیۆر. ئەگەر بەڵێننامەیەك واژوو بکەی کەوا چیدی خۆت لە کاروباری نێوخۆیی ئیسپانیادا هەڵنەقورتێنی، ئەوسا دەتوانم هەوڵت بۆ بدەم و ئازادیت مسۆگەر بکەم. بەلاّم ئێمە ناچارت ناکەین، ئێمە خەڵکێکی ماقووڵین". ژێر نووسینی سەر کاغەزێکم واژوو کرد کە، تێیدا هاتبوو "مەبەستی خۆ هەڵقورتاندنم نییە لە کاروبارەکانی نێوخۆیی ئیسپانیادا". ئەوەندەیشم خستە سەر نووسینەکە، کەوا "لە زیندانی سیڤیل هەڵسوکەوتیان لەگەڵمدا گونجاو بووە".

دواتر لەوە گەیشتم کە ئازادکردنی من، نە بەهرەو بەشێکی خوایی بووە و نە خۆ نواندنێکی سیاسییانە بووە لە لایەن "فرانکۆ"وە. منیان لەگەڵ زیندانییەکی وڵاتی ڤالێنسیا دا ئالوگۆڕ پێ دەکرد. وردەکاری زیاتری پرسەکەیشم دەست کەوت. ئەو زیندانییەی منیان لەگەڵ ئەودا ئالوگۆڕ پێ دەکرد، ژنێك بوو بەناوی " سینیۆرا هایا" کە وەك بارمتە لە ڤالێنسیا راگیرابوو. پیاو ماقووڵە کراسڕەشەکەیش مێردی ئەو بوو، یەکێکیش بوو لە فڕۆکەوانە جەنگییە ناودارەکانی "فرانکۆ".

سەر لە نوێ بە درێژایی راڕەوەکەدا رێمان کرد، من و کابرا کراسڕەشەکە. تۆڕێکی ئاسنین لادراو، کلیلێك لە نێو قفڵێکدا سووڕا، ئالقەیەك ترازا. دەرێ، شەقام بوو. ئۆتۆمبێل و ولاّخە ئارەبانەکێشەکان بە نێو شەقامدا گوزەریان دەکرد. خەڵك بە نارێکی بەسەر پیادەڕۆکان، لێرە و لەوێ و هەموو جێیەك داو، نە چوار چوار لە پاڵ یەك. دەڕۆیشتن. پیاوێك پاڵی دابوو بە دیوارێکدا و رۆژنامەیەکی دەخوێندەوە. منداڵێك لە نێو خۆڵ و خاشاکدا دانیشتبوو، ترێی دەخوارد. لە نێو باخەکەی دەرێی زیندان، پاسەوانەکان راوەستابوون و لەگەڵ کچە جاحێڵەکاندا مۆزە مۆزیان دەکرد و یەکتریان دەلاواندەوە. کچەکان هەریەکە و گوڵێکی سووریان لەنێو قژە رەشەکەیاندا بە بناگوێیانەوە گیر کردبوو. وەك "ئۆپێرای کارمێن" تەنوورەیان لەبەر کردبوو. کچەکان جوان بوون. پیاوە کراسڕەشەکە گوتی :" سینیۆر، ئەگەر رەزامەندیت لەگەڵ بێت سواری ئەم ئۆتۆمبێلە دەبین". سواری ئۆتۆمبێل بووین. لە کوشنی دواوە، دوو پۆلیسی مەدەنی بە هەندێك حەزەرەوە دانیشتبوون. یەکێکیان دەستی بۆ گیرفانی برد، وامزانی کەلەپچە دەردێنێ بەلاّم قوتووە جگەرەیەکی زیوینی دەرهێنا. بەسەر رووباری "گوادالکویر" تێپەڕین. چەند کەشتییەك لەناو رووبارەکەدا بوون. لە پشت خۆیان هێڵێکی دووکەڵاوییان جێ

دەهێشـت. وەك ئـەو کەزیـە هونراوانـەی کرابێتنـەوە. ئـالآی رەنگـاورەنگ بـە سـەریاندا دەشـەکایەوە. یەکێکیان دەنگی هۆڕنەکەی بەردا.

پرسیارم کرد:" بۆ کوێ دەچین"؟

پیاوە کراسڕەشەکە وەلآمی دایەوە:" دەچینە شارێکی دیکە".

خـەڵك لەسـەر بەرهەیوانـەکانی کافیتریاکـان دانیشـتبوون، رۆژنامـەیان دەخوێنـدەوە و خواردنەوەی رەنگاورەنگیان دەخواردەوە. ژاوەژاوێکی زۆر لە نێو شەقامەکاندا دەبیسترا. چـی وای نەمابوو لەگـەڵ شـەمەندەفەرێکی سـەر شـەقام تووشـی پێکـدادان بـبین. پاشـان بـەنێو شەقامێکدا تێپەڕ بووین و لە شارەکە چووینە دەرێ. لە دەشتێکی چۆڵەوانیدا ئۆتۆمبێلەکەیان راگرت و دابەزین. کابرای ماقووڵ و دوو پاسەوانەکە، بێ هیچ بڕیارێك راوەستابوون. جـارێکی دیکە و ئەمە دواجار بوو، وا بـە زەینمـدا هـات، ئێسـتا دەمانچـەکانیان دەردێـنن و ساردم دەکەنەوە ، پاشان گرەگرێکی ماتۆرێکم کەوتە بەرگوێ و فڕۆکەیەکی چکۆڵەی سەر کرایـەوە و تەکباڵ لە پشتی بنچکە گیایەکان دەرکەوت و هەژان هەژان بەرەو لای ئێمە هـات. کەسـێکی وەك فیتەری لێ دابەزی و سلآوێکی سەربازیی کرد. کراسـڕەش سـەرکەوت و لەسـەر کوشـنی فڕۆکەوان دانیشت. فیتەرەکە یارمەتی دام تا منیش سەکەوم و بچم لـە تەنیشـتی دابنیشـم. پاسەوانەکان هەریەکەو باڵێکیان گرت و فڕۆکەکەیان پاڵ پێوەنا. هەژە هەژێکمان کـرد و رێـك چووینە ناوەڕاستی دەشتەکەوە، هێڵی فڕۆکەخانـە لـەودیو بنچـکەکانەوە بـوو. یـەك مێگەڵـە مارمێلکەی ئاسـنیی و باڵـدار، بـە باڵـە پـان و پۆڕەکانیانـەوە لـەو نـاوە دەلـەوەڕان. پیـاو ماقووڵەکە، ستێرنی فڕۆکەکەی گرت. زەوییە نەرم و نشێوابیەکە خزی و لە ژێر پێمانـدا نـزم و نزمتر بۆوە. لەنێو جیڕجیڕەکێکی چکۆڵە دابووین. بیبی داگلاسـێکی بوو قەباخ هەڵدرایەوە بوو دەتگوت وازیلۆکەی منالآنە. هـەر هـەوراز وهـەورازتر دەبووینـەوە. ئاسـۆمان بـە بەردەمـدا دەکرایەوە و شاری "سیڤێل" تا دەهات و بچووکتر دەبۆوە.

پیاو ماقوڵە کراسڕەشەکە، لێوەکانی خونچـە کردبـوو _ مـن هیچـم نەدەبیسـت بـەلآم وا پێدەچوو بە سـووت لێدان، ئاوازی گۆرانییـەکی بە لێوەکانی دەژەنی.

هاوارم کرد :" بۆ کوێ دەچین، سینیۆر؟"

لە ولآمدا ئەویش هاواری کرد :" دەچینە شارێکی دیکە سینیۆر":

هێشتا هەر هەوراز بووینەوە. کێوێك لە بەرامبەرماندا، لـەودیو هەورەکانـەوە دەرکـەوت. پارچە هەوری سپی سپی لە دەوروبەمان، لـە هەموولایەکمانـدا بـزوان، وەك ئـەوەی پـەڕین و

بەسەر ئاودا مەلەوانی بکەن. پیاو ماقووڵە کراسڕەشەکە، بە درێژکردنی پەنجەیەکی هێمای بۆ شوێنێك لە خوارەوە کرد.

نەڕاندی :" هەموو ئەوانە ئیسپانیای میللییە، سینیۆر. لێرە، ئێستا هەر هەمووان کەیفخۆشن.

هاوارم کرد: بۆ؟

ئەویش هاواری کردەوە : شاد، شاد وسەربەست.

هاوارم کردەوە : چی؟

گوتی : سەربەست.

ئێمە بێدەنگ بووین و تەنیا نەڕە نەڕی ماتۆری فڕۆکە، دەنگی دەهات. پارچە هەورەکانی ژێرمان پێکەوە لکان و دەشتێکی سپییان راخست. زەوی، چیدی نەدەبیندرا. پیاو ماقووڵەکە، لاقەکانی لێك کردبوونەوە و ستێرنەکە، لە نێو لاقەکانی دابوو، ئەویش دەستەکانی بۆ روونکردنەوەی مەبەستی قسەکانی، دەبزواند و جووڵە پێدەکرد. گوتی :" لەلای ئێوە، هەژار لە دژی دەوڵەمەند دەجەنگێ. ئێمە سیستەمێکی نوێ و جیاوازمان هەیە. ئێمە لەوە ناپرسین بەرامبەرەکەمان هەژارە یان زەنگین، لەوە دەپرسین بەرامبەرەکەمان چاکە یان خراپە. هەژاری باش و دەوڵەمەندی باش هەردوولایان لەنێو یەك بەرە و یەك سەنگەر دان. ئەمە راستیی ئیسپانیایە، سینیۆر".

پرسیارم کرد: چۆن ئەو دوانە لێك هەڵاوێر دەکەن؟.

قیژاندی : چی؟

گوتم: چۆن لێکیان جوێ دەکەنەوە؟

دیسان هەوراز بووینەوە، ئێستا ئیدی دەبوایە رێك لە هنداو کێوەکان بین. ماتۆڕەکە نەڕەی دەهات و بۆ ماوەیەك، هیچم نەدەبیست.

پیاو ماقووڵە کراسڕەشەکە قیژاندی : هەموو خەڵکی ئیسپانیا لەنێو دڵیاندا لایەنگری ئێمەن. کاتێك "سوور"ەکان خەڵکی گوللە باران دەکەن، لە دوا نەعرەتەیاندا هاوار دەکەن "VIVA ESPANA" ی ئێمەیە. من چەند کەسێکی "سوور"م، کاتێك گوللە باران دەکران، بینیوە، ئەوانیش هەر هاوار دەکەن "VIVA ESPANA ". مرۆڤەکان لە ساتی مەرگدا راستی دەدرکێنن. لێرە دەتوانی بگەیتە ئەو راستییەی کە من لەسەر هەقم سینیۆرە.

هاوارم کرد: تۆ سەیرت کردووە؟

ئەویش هاواری کرد: چی؟

هاوارم کردەوە : پرسیم لەو کاتەدا کە گوللە باران دەکران، تۆ سەیریانت دەکرد؟

لە هەوراز دەشتە سپییەکەدا مەلەمان دەکرد، هیچ شتێك لەژێر پێماندا، بێجگە لـە دەشـتێکی سپی نەدەبیندرا و هەستمان دەکرد وەك ئەوەی لـە هـنـداو پنتێکـدا باسـکە مەلـە دەکـەین. پیـاو ماقوولێ، لاقەکانی لێکدی فش کردبوونەوە و دەستەکانی بە هەماهەنگی لەگەڵ ناخاوتنەکانیـدا لـە هەوادا رادەوەشاند. ماتۆڕەکە، بۆخۆی کاری دەکـرد. پێویسـتی بـەوە نـەدەکرد ئێمـە هیچـکارێك بکەین. هەروەك لەنێو بەلەمێکی سەر ئاودا دانیشـتبووین، سـەیری خوارەوەمـان دەکـرد. کـابرای کراسڕەش هاواری کرد:" مرۆڤ کاتێك ئاوها، لێـرە دادەنیشـێ بـە قـووڵی بـیر لـە مـەرگ و ژیـان دەکاتەوە. "سوور"ەکان هەموویان خەڵکی ترسنۆکن، تەنانەت نـازانن مرۆڤێـك دەبـێ چـۆن بمـرێ. دەتوانی لە نێو زەینتدا وێنا بکەی مردن شکڵ و شێوی چۆنە؟"

قیڕاندم : بەر لەوەی لە دایك ببین، هەموومان مردبووین.

ئەویش قیڕاندی: چی؟

منیش قیڕاندمەوە : گوتم بەر لەوەی لە دایك ببین، هەموومان مردبووین.

قیڕاندی : راست دەکەی: بەلاّم ئەی بۆ مرۆڤ لە مەرگ دەترسێ؟

قیڕاندم : من هیچکاتێك لە مەرگ نەترساوم، تەنیا لە مردن دەترسم

کابرای کراسڕەش هاواری کرد: من رێك بە پێچەوانەی تۆ.

هەندێ درز و کەلەبەر لە نێو دەشتە سپییەکەی ژێر پێمان دەرکەوت. گژە بایەکی لـە ناکـاو گرتمانییەوە. فڕۆکە کەوتە هەژە هەژ و، وەك بێچووە ئەسپێکی دەسـتەمۆ نـەکراو دەسـتی بـە هەڵبەز و دابەز کرد. دیسان دەستەکانی پیاو ماقووڵەکـە گـیرۆدەی سـتێرنەکە بـوو، ئـەویش بێدەنگ مایەوە. هەمدیس هەستم دەکرد "تا"م لێیە. ئەگەر پیاو ماقووڵەکـە یـەك جووڵـەی هەڵەی بکردبایە سەراوسەر دەکەوتینە سەر ئەرزو گیانمان دەردەچوو. بیرم بۆ ئەوەچوو، ئـەمجۆرە مردنە دەبێ کۆتاییەکی باش بێ و، شتێکی وەك جۆرە مردنێکی ئەفسانەیی لـێ دەکەوێتـەوە. ترس لە مەرگ دا نییە، تەنیا لە مردن دا هەیە_ ئایا نابێ بۆ هەمووان ئاوها بێ؟ بەلاّم پیـاو ماقووڵ دەڵێ بۆ ئەو، پێچەوانەکەی راستە. ئەو پیاو ماقووڵە لە فڕۆکەوانـە بلیمەتەکانـە. بـە دڵنیاییەوە لە بۆمبهاوێژە بلیمەتەکانیشە." کارلۆس"یش ئەفسەرە، ئەویش لە مردن ناترسـێ. بەلاّم ترس و دالّغەی مەرگ پێیەکانی پەك خست و وەك منداڵێکی لێکـرد کـە هێشـتا فێـری بەڕێوەچوون نەبووبێ و، بە بێچارەیی و داماویی خستیە نێو جێگا.

"کارلۆس" و پیاوماقووڵ دەزانن دەبێ چۆن بمرن. ئەوان ئەفسەرن. مردن، پیشەی ئەوانە. ئەوەیان ئاخنیوەتە نێو مێشکیانەوە و تا نێو ئێسقانەکانیشیان رۆچووە: مردن بە سەرفەرازیی "نیکۆلاس"ی چکۆڵە، بە دڵنیاییەوە، بە سەربڵندی نەمرد. ئەو جەنگاوەرێکی مەدەنی بوو. پارتیزانەکانی ناو حەوشەکەیش جەنگاوەری مەدەنی بوون و ئەزموونی مردنیان نەبوو. زەندەقیان لەمردن چوبوو.لە سەرووی هەورەکانەوە، پیاو ماقووڵ بە لە خۆبایی بوونەوە، بەدیار سەریاندا دەسووڕایەوە و بۆمبای بە سەریاندا دەباراند، ئەوان لەسەر زگ رادەکشان و لەپەو روو بە نێو قوڕ و چڵپاودا دەخزین و سەرسام ببوون. هەمیشە کاتێك رەشاشەکان بارانی گوللەیان بەسەردا دەباراندن ئەوان ناسایىترین کاریان دەکرد: هەڵاتن. بەر لەوەی گوللە باران بکرێن دەکەوتنە هات و هاوار و بانگی دایکیانیان دەکرد. حەزیان لێ بوو یاری تۆپێن بکەن، قەپ لە خاس بگرن و خەونی رۆژانی دوای جەنگ ببینن. ئەوسا کە، هەموویان فێرە خوێندەواری دەبوون و خەونی ئەوەی کە، چیدی سێ کەس بەیەکەوە لەناو یەك ژوور دانەبن و، خەونی ئەو رۆژانەی بتوانن لە هەفتەیەکدا دووجار گۆشت بخۆن و، بۆخۆیان کاتژمێرو جلی جوان بکرن چونکە ئەو رۆژەی جەنگ کۆتایی پێ بێ، ژیان بە واتا راستەقینەکەی دەست پێ دەکات. ئەوان باوەڕیان بەوە هەبوو کە، ژیان باشە و پێویستە و، تەنانەت جەنگ کردنیش لە پێناو ژیان و، تەنانەت مردنیش لە پێناو ئەوەی ئەوانی تر بژین، پێویستە. باوەڕیان بە هەموو ئەو شتانە هەبوو، لەبەر ئەوەش کە، ژیانیان پەیوەست بوو بەو باوەڕەیانەوە لە مەرگ نەدەترسان. بەلاّم بە شێوەیەکی ترسناك لە مردن دەترسان. چونکە جەنگاوەری مەدەنی بوون، جەنگاوەرانی خەڵك، جەنگاوەرانی ژیان، نە هی مەرگ. کاتێك ئەوان دەمردن من لەوێ بووم. ئەوان بە فرمێسکەوە و بە هاوارێکی بێ سوود بۆ بە هاناوە هاتنێك و ئەوپەڕی لاوازی، وەك هەموو مرۆڤێك، دەمردن. چونکە مردن شتێکی نەفرەتی و جدییە و ناکرێ میلۆدرامای لێ دروست بکرێ. "پێلاتوس" نەیگوت " ئەمەتا، ئەو پاڵەوان" بەڵکو گوتی " ئەمەتا، ئەو مرۆڤ".

هێشتا لە نێو ئاسماندا لە باسکەمەلە دابووین. پیاو ماقووڵە کراسڕەشەکە، دەستەکانی بە ئازادی لە هەوادا رادەوەشاند و وشە پۆست سرووشتییەکانی بەردەوام لە نێو ئاخاوتنەکانیدا دووبارە دەکردەوە کە، هێندەی هەورەکانی ژێر پێیەکانمان سست و بێ بناغەبوون و، بە هەمان ئەندازە دەبوونە هۆکاری شەڕانگێزی و چارەڕەشی کە، ئەم بۆمبایانە دەبوونە هۆکار، کە دەیانباراندە خوارەوە. زۆر دڵخۆش دەبووم ئەوم لە فڕۆکەکەدا فڕێ بدایەتە ئەو خوارەوە، بەلاّم ستێرن لە نێو دەستەکانی ئەو دابوو. ئەویش لە من بە هێزتر بوو.

## دوادیمەن

ئەو شارەی، پیاو ماقووڵە کراسڕەشەکە، بۆ ئەویێ گواستمەوە "لالینا" شارێکی سنووریی ئیسپانیا و بەتەنیشت کێوی تاریقەوە بوو. دەبوایە چل وهەشت کاتژمێر لە "لالینا" لە چاوەڕوانیدا بمێنمەوە. رۆژی چواردەی مانگ، وەکو مرۆڤێکی ئازاد و سەربەست، پێم نایە ناو خاکی بەریتانیاوە.

هەفتەیەك دواتر "سیلدارەکە" لە سێدارە درا. لەبەر هەندێك هۆکار هێشتا، کاتی ئەوە نەهاتووە ناوەکەی بدرکێنم. "بایرۆن" بە سی ساڵ زیندان و ئەنجامدانی کاری سەخت حوکم درا. پیاوماقووڵەکە لە بەهاری ساڵی ۱۹۳۸ لە شەڕێکی ئاسمانیدا لە هنداو " تیرویێل" دا گیانی خۆی لە دەست دا.

ئەوانەی بە زیندوویی لێی دەرچوون، ئێستا لە گەرمە و هەرەتی قیامەتی ئەورووپادا، کە ئیسپانیا پێشەنگەکەی بوو، گوتوبێژیان لەگەڵ مەرگدا درێژە پێ دەدەن.